زنجیرەی کتێبی زانستی/ ٣٠







بایەزید حەسەن عەبدوڵڵا

# چەکی بایۆلۆجی

## چەکێکی کۆکوژە دژی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك






# چەکی بایۆلۆجی

## چەکێکی کۆکوژە دژی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەک

دکتۆر بایەزید حەسەن عەبدوڵڵا




لە زنجیرە بڵاوكراوەكانی
ناوەندی غەزەلنووس- بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە
زنجیرەی كتێب (٣٦٥)
زنجیرەی كتێبی زانستی (٣٠)

# چەكی بایۆلۆجی

## چەكێكی كۆكوژە دژی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك

دكتۆر بایەزید حەسەن عەبدوڵڵا


- بەرگ: باسم ڕەسام
- چاپ: یەكەم- ٢٠٢٢
- ڕێنووس و هەڵەچنی: غەزەلنووس
- دیزاینی ناوەوە: غەزەلنووس
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٨٠٠٠ دینار
- بڵاوكار: ناوەندی غەزەلنووس- بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە




سلێمانی، پشت سەرا، گەراجی پاسەكانی تووی مەلیك، باڵەخانەی هۆشیار لەفتان، بازاڕی كتێب
٠٧٧٠٣٥٧٣٧٥٧ xazalnus@gmail.com
/nawandixazalnus

## ناوەرۆک

## پێشەکی

**خوێنەری بەڕێز**

ئەم کتێبە باسی چەکی بایۆلۆجی دەکات. چەکی بایۆلۆجییش بەشێکە لە چەکە کۆکوژەکان کە لە هەموو جیهاندا قەدەغە کراون. چەکە کۆکوژەکانیش بریتین لە چەکی کیمیایی، بایۆلۆجی، ناوکی و تیشکی، یان هەر چەکێکی تر کە ژمارەیەکی زۆر مرۆڤ بکوژێت یان زیانێکی زۆریان پێ بگەیەنێت، یاخود زیانێکی ئەوپەڕی زۆر بەوانەی کە مرۆڤ دروستی کردوون، وەک خانووبەرە یاخود سروشت بگەیەنێت. چەکی بایۆلۆجی کە چەکێکی کۆکوژە، بەپێی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان، لەسەر ئاستی جیهان قەدەغە کراوە، چونکە چەکێکی ئەوپەڕی کوشندەیە، بۆ نموونە، یەک گرام لە تۆکسینی بۆتولینومی خاوێن، بەشی ئەوە دەکات حەوت ملیار مرۆڤ بکوژێت. لە ئێستادا کە ژمارەی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی ٧,٨ ملیار کەسە، ١,١١٤ گرام (گرامێک و سەدوچواردە میللیگرام) لە تۆکسینی بۆتولینومی خاوێن، بەشی ئەوە دەکات هەموو دانیشتوانی سەر گۆی زەوی بکوژێت. دەشێت ئێستا چەندین وڵات لە جیهاندا، بە پێچەوانەی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانی قەدەغەکردنی ئەم چەکەوە، زۆر بە نهێنی بەرنامەی بەرهەمهێنان و پەرەپێدانی چەکی بایۆلۆجییان هەبێت. ئەم چەکە ترسناکە نەک دەوڵەتان، بەڵکو گرووپە تیرۆریستییەکانیش دەتوانن بە بڕێکی زۆر دروستی بکەن و بەکاری بهێنن بۆ بڵاوکردنەوەی نەخۆشیی ترسناک و کوشندە لە ناو مرۆڤ و ئاژەڵ

و ڕووەکدا، چونکە تێچوونی دروستکردنی ئەم چەکە، لەچاو تێچوونی دروستکردنی چەکە کیمیایی و ناوکییەکان، زۆر کەمترە.

ئەوەی هانی دام ئەم کتێبە بنووسم، چەند هۆیەک بوون، لەوانە، هەژاری یان هەر نەبوونی کتێب سەبارەت بە زانیاری دەربارەی چەکی بایۆلۆجی لە کتێبخانەی کوردیدا، کەمی یان نەبوونی زانیاری لای تاکی کورد لەسەر ئەم چەکە ترسناکە، هۆشیارکردنەوەی تاکی کورد لە مەترسیی ئەم چەکە و خۆپاراستن لێی، چونکە دەشێت ئەو ڕژێم و بەرپرسە باڵایانەی کە ناحەزی کوردن و چاویان بە کورد هەڵنایەت، لە داهاتوودا بیر لە بەکارهێنانی ئەم چەکە لە دژی کورد بکەنەوە، وەک چۆن ڕژێمی بەعسی لەناوچوو چەکی کیمیایی دژی کورد بەکار هێنا.

بە هۆی پەتای نەگریسی کۆڤید-١٩ کە ماوەیەکی زۆر بە ناچاری لەماڵەوە مامەوە، ئەو مانەوەیەشم لە ماڵەوە، کاتێکی باشی بۆ ڕەخساندم بۆ نووسینی ئەم کتێبە.

نووسینی کتێبی زانستی بە زمانی کوردی کارێکی ئاسان نییە و پڕ گیروگرفتە. یەکێک لە گرفتەکان نەبوونی زاراوەی زانستیی یەکگرتووی کوردییە و ئەو فەرهەنگە زانستییانەی کە ئێستاش هەن، کاری تاکەکەسین و هەر کەسێک فەرهەنگێکی زانستیی ئینگلیزی-کوردی یاخود عەرەبی-کوردیی دانابێت، بەپێی سەلیقە و زانیاریی خۆی، وشە یان زاراوە زانستییە کوردییەکەی بەرامبەر بە وشە یان زاراوە زانستییە ئینگلیزییەکە یان عەرەبییەکە داناوە. بێگومان کاری دانانی فەرهەنگ، بۆ هەر بوارێک بێت، کاری لیژنەیەکی چەند کەسییە، کە هەر کەسێکی لیژنەکە پسپۆڕیی لە لقێک لە لقەکانی ئەو بوارەدا هەبێت، ئینجا بوارەکە بواری زانستی، ئابووری یاخود ئەدەبی... بێت. منیش بۆ زاراوە زانستییە کوردییەکان، ناچار بووم هەر ئەو زاراوانە بەکار بهێنم کە لەو فەرهەنگانەی ئێستادا هەن و لە ناو چەند زاراوەیەکی زانستیی کوردیدا کە بەرامبەر زاراوەیەکی زانستیی

ئینگلیزی هەبووە، بە سەلیقەی خۆم کامەیم بە گونجاو زانیوە، ئەوەم هەڵبژاردووە.

سوپاسی بەڕێز عیسام ئەکرەم فەیلی دەکەم کە پێنج بەڵگەنامەی ڕژێمی بەعسی لەناوچووی دەربارەی کوشتنی کوردە فەیلییەکان لە لایەن ئەو ڕژێمەوە بۆ ناردم، کە لە بەشی هەشتەم دام ناون، هەر نموونەیان زۆر بێت. هەروەها زۆر سوپاسی بەڕێز دکتۆر حسێن جاف دەکەم کە هەندێک زانیاریی گرنگی دەربارەی تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر گەنجانی کوردە فەیلییەکان و جینۆسایدکردنیان بۆ ناردم کە بۆ نووسینی بەشی هەشتەم سوودم لێ وەرگرتن.

سوپاسی بەڕێز دکتۆر خەیروڵڵا حەسەن بابەکر دەکەم کە ڕەشنووسی ئەم کتێبەی بە وردی خوێندەوە و بە تێبینی و زانیارییەکانی کتێبەکەی دەوڵەمەند کرد.

لە کۆتاییدا، هیوادارم ئەم کتێبە سوودێکی هەبێت و خوێنەرانی بەڕێزیش لە کەموکورتییەکانی بمانبەخشن.

**دکتۆر بایەزید حەسەن عەبدوڵڵا**
**پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە کیمیای نائەندامی**
**سلێمانی ٢٦ – ١– ٢٠٢١**

## کورتەیەک دەربارەی ئەم کتێبە

ئەم کتێبە لە نۆ بەش پێک هاتووە و بابەتەکانی هەر بەشێک لە بەشەکانی بە کورتی لە خوارەوە خراونەتە ڕوو، بۆ ئەوەی خوێنەر پێش ئەوەی دەست بە خوێندنەوەی بکات، هەندێک زانیاریی لەسەر کتێبەکە هەبێت.

**بەشی یەکەم: مێژووی بەکارهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکان لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ و بڵاوبوونەوەی پێنج پەتا لە دوو دەیەی سەرەتای سەدەی بیستویەکەمدا**

لەم بەشەدا، مێژووی بەکارهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکان لە ساڵی ١٣٢٠ی پێش زایینەوە تاکو ساڵی ٢٠٠١ خراوەتە ڕوو. هەر لە کۆتایی ئەم بەشەدا، بڵاوبوونەوەی پێنج پەتا لە دوو دەیەی سەرەتای سەدەی بیستویەکەمدا بە کورتی باس کراوە، پەتاکانیش ئەمانەن: ڤایرۆسی سارس (SARS)، ئەنفلونزای باڵندە جۆری A (H5N1)، ئەنفلونزای بەراز، ڤایرۆسی ئیبۆلای ڕۆژئاوای ئەفریقیا، کۆڤید-١٩ (COVID-19).

**بەشی دووەم: چەکی بایۆلۆجی**

پێناسەی چەکی بایۆلۆجی، چۆن چەکی بایۆلۆجی لەگەڵ چەکی کیمیایی بەراورد دەکرێت، پێنج جۆر هۆکاری بایۆلۆجی کە دەتوانرێت بکرێن بە چەکی بایۆلۆجی، ڕێگەکانی بڵاوکردنەوەی چەکی بایۆلۆجی، پۆلێنکردنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان، هەندێک لەو هۆکارە بایۆلۆجییانەی کە ڕووەکە دانەوێڵەییەکان دەکەنە ئامانج و تووشی

نەخۆشـــییان دەکەن، دابەشـــکردنی هۆکارەکـانی جەنگـی بـــایۆلۆجی بەسەر سێ گرووپدا، ئەوانە هەموو لە بەشی دووەمدا باس کراون.

### بەشی سێیەم: چەکە بایۆلۆجییە بەکتریاییەکان

ئەم بەشـە باسـی ئەو چەکە بـایۆلۆجییە بەکتریـیایـانە دەکـات کە دەبنە هـۆی نەخۆشـییەکانی پیسـەکوان، تـاعوون، بۆتـولیزم، تولاریمیـا (کەروێشکەتا)، تـای کیو و مقاو. بۆ هەر یەکێک لەم نەخۆشـییانە، بە گشـتی باسـی ئەوانە کـراوە: میـژووی نەخۆشـییەکە، بەکتریـای نەخۆشـییەکە وەک چەکێکـی بـایۆلۆجی، جۆرەکـانی نەخۆشـییەکە، چارەسەری تووشبوانی نەخۆشییەکە، میکانیزمی کارکردنی بەکتریای نەخۆشییەکە لە ناو لەشی مرۆڤ یان ئاژەڵدا، ڕێگەکانی بڵاوبـوونەوە یـان گواسـتنەوەی بەکتریـای نەخۆشـییەکە، نیشـانەکانی تووشـبوون، خۆپاراستن، دەستنیشاکردنی نەخۆشییەکە و چارەسەرکردنی.

### بەشی چوارەم: چەکە بایۆلۆجییە ڤایرۆسییەکان

لەم بەشـەدا باسـی ئەو چەکە بـایۆلۆجییە ڤایرۆسـییانە کـراوە کە دەبـنە هـۆی نەخۆشـییەکانی ئـاوڵە، زەردەتـا، تەبەق، تـاعوونی مانگـا، ئیبـۆلا، تـای ڕیفـت ڤـاڵی و تـای خوێنبەربـوونە ڤایرۆسـییەکان. ئەم نەخۆشـییانە هەموویـان نەخۆشـیی ڤایرۆسـین، واتـە هۆکارەکەیـان ڤایرۆسـە و بە هـۆی ڤایرۆسـەوە مـرۆڤ یـان ئـاژەڵ تووشـی نەخۆشـییەکانی سـەرەوە دەکەن. لەم بەشـەدا، بە گشـتی باسـی ئەوانە کـراوە (جـگە لە تـای خوێنبەربـوونە ڤایرۆسـییەکان): میـژووی نەخۆشـییەکە، کوشـندەیی نەخۆشـییەکە، بەکارهێنـانی ڤایرۆسـی نەخۆشـییەکە (هۆکـاری نەخۆشـییەکە) وەک چەکێکـی بـایۆلۆجی، نیشـانەکانی تووشـبوون بە نەخۆشـییەکە، ڕێگەکـانی بڵاوبـوونەوەی نەخۆشییەکە، خۆپاراستن و چارەسـەرکردن ئەگەر چارەسـەر هەبێت، چونکە زۆر نەخۆشیی ڤایرۆسی چارەسەریان نییە.

**بەشی پێنجەم: چەکە بایۆلۆجییە تۆکسینییەکان**

ئەم بەشە سەرنج دەخاتە سەر چەکە بایۆلۆجییە تۆکسینییەکان و گۆڕین و دروستکردنی تۆکسینەکان و زۆر لە تۆکسینەکان، لەوانە، دەمارەتۆکسینەکانی ژەهری مار و چۆنێتیی ئیفلیجکردنی ماسوولکەکانی لەشی مرۆڤ، تۆکسینە دەریاییەکانی وەک تێترۆدۆتۆکسین و تۆکسینی کۆنەس و پالیتۆکسین، ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی و تۆکسینی ڕایسین. هەروەها ئەم بەشە سەرنج دەخاتە سەر بەکارهێنانی ڕایسین وەک چەکێکی بایۆلۆجی، ژەهراوییەتی ڕایسین، کارکردنی ڕایسین لە ناو لەشی کەسی ژەهراویبوو، نیشانەکانی ژەهراویبوون بە ڕایسین، چارەسەری ژەهراویبوون بە ڕایسین و خۆپاراستن لێی.

**بەشی شەشەم: چەکە بایۆلۆجییە کەڕوویيەکانی دژی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان**

ئەم بەشە تەرخان کراوە بۆ باسکردنی کەڕووەکان و ئەو زیانانەی کەڕووەکان بە کشتوکاڵی هەندێک وڵاتانی دەگەیەنن و بەرنامەی وڵاتان بۆ بەکارهێنانی کەڕوو وەک چەکێکی بایۆلۆجی دژی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان. هەروەها هەندێک لەو نەخۆشییانەش باس کراون کە کەڕووەکان تووشی ڕووەک و دانەوێڵە ئابوورییەکانی دەکەن، وەک نەخۆشییەکانی خەڵووزەی گەنم، ژەنگی لاسکی گەنم، وشکبوونی مەرەزە و دۆکەی پەتاتە.

**بەشی حەوتەم: بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق**

ئەم بەشە لە بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق دەکۆڵێتەوە و لێکۆڵینەوەکە کراوە بە سێ تەوەر، تەوەری یەکەمیان کرۆنۆلۆجیای بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراقە، لە سەرەتای دەستپێکردنی

بەرنامەکە لە ساڵی ١٩٦٤ تا ساڵی ٢٠٠٧ کە نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ١٧٦٢ی پەسەند کرد و بەپێی ئەم بڕیارە، کۆتایی بە کاری لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNMOVIC) و ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزە لە عێراق هات، ئەوەیش دوای ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان دڵنیا بوو لە لەناوبردنی هەموو چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق و هۆکار و ئامێر و کەرەستەکانی دروستکردنیان.

تەوەری دووەم، باسی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراقە. لەم تەوەرەدا ئەمانە باس کراون: هەندێک لە پسپۆڕە پێشەنگەکانی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق، ئەو بەکتریا و ڤایرۆس و تۆکسینانەی عێراق دەیویست بیانکات بە چەکی بایۆلۆجی، ئەو شوێنە سەرەکییانەی عێراق کە بەرنامەی چەکی بایۆلۆجییان تێدا جێبەجێ دەکرا، بڕی ئەو بەکتریا و ڤایرۆس و تۆکسینانەی کە عێراق لە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکەیدا بەرهەمی هێنابوون یان بە دەستی هێنابوون، لەگەڵ بڕی ئەو چەکە بایۆلۆجییانەی کە لەو بەکتریا و ڤایرۆس و تۆکسینانە دروستی کردبوون.

**بەشی هەشتەم: تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر مرۆڤ**

لەم بەشەدا، ئەزموونی نامرۆڤانەی سێ ڕژێم یان دەوڵەت، دەربارەی تاقیکردنەوەی هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی و چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر مرۆڤ باس کراوە. باسەکان لەژێر ئەم سەرناوانەدا خراونەتە ڕوو: ژاپۆن و تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆجی لەسەر مرۆڤ، ئەڵمانیای نازی و تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر مرۆڤ، عێراق و تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆجی لەسەر مرۆڤ. ئەم ڕژێمانە هەڵسوکەوتێکی ئەوپەڕی بێبەزەییانە و دڕندانە و دوور لە هەموو بەهایەکی مرۆڤایەتییان لەگەڵ ئەو مرۆڤانە کردووە کە تاقیکردنەوەیان لەسەر کردوون، ئینجا مرۆڤەکان هاووڵاتیانی

خۆیان بووبن یان ئەوانەی ئەو وڵاتانە بووبن کە داگیریان کردوون یاخود لە جەنگدا بەدیلیان گرتبن.

**بەشی نۆیەم: بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی بۆ کاری تیرۆریستی**

چەکی بایۆلۆجی لە ڕابوردوودا بۆ کاری تیرۆریستی بەکار هێنراوە و لەم بەشەدا باسی سێ بابەتی بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی بۆ کاری تیرۆریستی کراوە، بابەتەکانیش ئەمانەن: تاقمی ئایینی ڕاجنیشییەکان لە ئەمەریکا، تاقمی ئوم شینریکیۆ لە ژاپۆن و تیرۆریزمی بایۆلۆجی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ڕێی چەند نامەیەکی بە پۆست نێرراو کە پیسەکوانیان تێ کرابوو.

## بەشی یەکەم

## مێژووی بەکارهێنـانی چەکە بایۆلۆجییەکـان لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ و بڵاوبـوونەوەی پێـنج پەتـا لە دوو دەیەی سەرەتای سەدەی بیستویەکدا

### ١-١: مێژووی بەکارهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکان لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ

لە کۆنەوە، لە پێش لەدایکبوونی حەزرەتی عیساوە تاکو ئێستا، چەکی بایۆلۆجی بە تایبەتی لە جەنگەکاندا بەکار هێنراوە و بووەتە هۆی کوشتنی جەنگاوەران و خەڵکانی سیڤیل، زیانێکی زۆریشی بە ئابووریی ئەو لایەنەی دژی بەکار هێنراوە، گەیاندووە. بۆ ئاشنابوون بە بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ، ڕووداوەکانی بەکارهێنانی ئەم چەکە بەپێی مێژووی بەکارهێنانی دەخەینە ڕوو:

* لە ساڵانی نێوان ١٣٢٠-١٣١٨ی پێش زایین: لە شەڕی نێوان ئیمپراتۆرییەتی هیتی و ئەرزەوانەکان کە لە ساڵی ١٣٢٠ تاکو ساڵی ١٣١٨ی پێش زایینی درێژەی کێشاوە. هیتییەکان بەران و گوێدرێژی تووشبوو بە نەخۆشیی کەروێشکەتایان (کە بە تاعوونی هیتی ناسراوە) بەکار هێناوە بۆ ئەوەی ئەرزەوانەکان تووشی ئەم نەخۆشییە بکەن. بەڵگە تۆمارکراوەکان ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە لە بارودۆخی نادیاردا، ڕێگەوبانەکانی ناوچەی ژێردەستی ئەرزەوانەکان پڕ بوون لە بەران کە هیتییەکان ڕەوانەیان کردبوون. کاتێک ئەرزەوانەکان هێرشیان کردووەتە سەر هیتییەکان و گەمارۆیان داون، هیتییەکان لاواز بوون، بەڵام لە ماوەی دوو ساڵدا، ئەرزەوانەکانیان تێک شکاندووە. بۆ پشتگیری لە تیۆری چەکی بایۆلۆجی کە لەو سەردەمەدا بەکار هێنراوە، هەندێک تەبەقی قوڕ کە بە نووسینی بزماری لە سەریان هەڵکۆڵراوە، باسی ئەوە دەکەن کە چۆن بەرانێک و ژنێکی تووشبوو بە نەخۆشیی کەروێشکەتا ڕەوانەی سەر ڕێگەی ئەرزەوانەکان کراون و نەخۆشییەکەیان بە ناو ئەوانەی

لە سـەر ڕێگـەکە بـوون، بـڵاو کـردووەتەوە. بێگومـان دواتـر ئەم نەخۆشییە بە ناو هیتییەکانیشدا بڵاو بووەتەوە.[1]

* سـەدەی شەشـەمی پـێش زایـین: وەک دەڵـێن، ئاشـوورییەکان کەڕووی ئێرگۆتیـان، کە نـاوە زانسـتییەکەی (Claviceps purpurea)یە، بـۆ ژەهراویکردنـی ئـاوی بیرەکـانی دوژمـن بەکـار هێناوە.[2]

* نـزیکەی ٢٠٠ سـاڵ پـێش زایـین: ئەفسـەرانی سـوپای هانیبـاڵ فێڵیـان لە شـەرابی یـاخیبووە ئەفریقییەکـان دەکـرد و بەری ڕووەکـی ماندرێکیان لە شەرابەکەیان دەکرد. بەری ڕووەکی ماندرێک مادەیەکی نیمچەئەلکـالییە و بیلادۆنـای تێـدایە و دەبێـتە هـۆی ورێنەکـردن و خۆشـخەیالی.[3]

* ساڵی ١٨٤ی پێش زایین، لە شـەڕێکی دەریاییدا، هانیباڵی قرتـاج (قرتـاج شـارێکە لە تـونس) گلێـنەی گڵـی پـڕ لە مـاری ژەهراوییـان هەڵداوەتە ناو کەشتییەکانی دوژمن.[4]

* ساڵی ١٩٨ی زایینی: لە گەمارۆی شاری حەزەردا (ئێستا شاری دێرینـی حەزەر دەکەوێـتە پارێزگـای نەیـنەوا)، کاتێـک سـێپتیموس سـیڤیروس (Septimus Severus) لە سـوپای ئیمپراتـۆری ڕۆمـانی هێرشـی کـردە سـەر شـاری حەزەر و گەمـارۆی دا، سـەربازەکانی کاتێک دەیانویست بە دیوارەکانی شـارەکەدا هەڵبگەڕێن، ڕووبەڕووی چەکێکی داهێنراو بوونەوە: بەرگریکەرەکانی شـارەکە بە کووپەی پڕ

[1] https://www.megalithic.co.uk/article.php?sid=2146413400
[2] Croddy, E. A.and Wirtz, J. J., Weapons of Mass Destruction, An Encyclopedia of Worldwide Policy, Technology, and History, Santa Barbara, California , 2005, p.xxxi.
[3] Croddy, E. A.and Wirtz, J. J., Weapons of Mass Destruction, An Encyclopedia of Worldwide Policy, Technology, and History, Santa Barbara, California , 2005, p.xxxi.
[4] https://www.webmd.com/a-to-z-guides/features/biological-chemical-terror-history#1

لە دووپشــکی کوشــندە و زەردەواڵە و مێشــەهەنگوینە، کە لە ســەر دیوارەکــانی شــوورەی شــارەکە دانرابــوون، کووپەکانیــان بە ســەر سەربازەکانی سوپای ئیمپراتۆری ڕۆمانیدا شکاندن و دووپشک و زەردەواڵە و مێشــــەهەنگوینەکانیان بەرەڵا کــــردن، هەنــــدێک لە سەربازەکان بە هۆی پێوەدانەوە مردن و ئەوانی تر تووشی نەخۆشی بوون و بە هۆی گەرما و پێوەدانەوە فەوتان. بۆمبە دووپشکییەکان بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراو کاریگەریی خۆیان سەلماند. سێپتیموس ســــێڤیروس لەگەڵ ئەوانەی لە ســــوپاکەی مــــابوونەوە، شــــکان و کشانەوە[1].

* ساڵی ١٣٤٠، لە هێرشێک بۆ سەر قەڵای ثون لیڤیک ( Thun L'Eveque) لە Hainault (ئێســتا لە بەشــی بــاکووری فەرەنســایە) ئەسپ و ئاژەڵی تۆپیو، کە هەڵگری نەخۆشی بوون، بە مەنجەنیق هەڵدراونەتە ناو قەڵاکە.[2]

* ساڵی ١٣٤٧: مەغۆلەکان شاری کافا (Kaffa – لە ئۆکرانیای تازە) گەمارۆ دەدەن و گەلێک لاشەی مردووی بە تاعوونەڕەشە بە سەر شوورەی شارەکەدا هەڵدەدەنە ناو شارەکە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم تــــاعوونە. ئیتــــالییە هەڵاتووەکــــانی ئەم شــــارە تاعوونەکەیــــان گواستووەتەوە بۆ بەندەرەکانی سەر دەریای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لە ڕاستیدا، ئەو کەشتییانەی ئاوارە تووشبووەکانیان بە تاعوون هەڵدەگرت (دەشێت مشکیشیان تێدا بووبێت)، ئەوانیان دەگواستەوە بۆ قوستەنتینییە و جەنەوا و ڤینیسیا و بەندەرەکانی تری دەریای سپیی ناوەڕاست، دەشێت ئەوانە بەشدارییان لە بڵاوبوونەوەی دووەم پەتای

---

[1] https://listverse.com/2016/09/05/10–historical–biological–and–chemical–attacks/

[2] Chevrier, M.I., and Co–Authors , The Implementation of Legally Binding Measures to strengthen The Biological and Toxin Convention, Kluwer Academic Publishers, New York, 2004, p. 15

تاعووندا کردبێت کە لە ماوەی سەدەی چواردەیەمدا نزیکەی پەنجا ملیۆن کەسی کوشت.[1]

* ساڵی ١١٥٥: سەربازانی ئیمپراتۆر باربارۆسا، بیرە ئاوەکانی شاری تۆرتۆنا (Tortona)ی ئیتالیایان بە لاشەی مرۆڤی مردوو و ئاژەڵی تۆپیو ژەهراوی دەکرد.[2]

* ساڵی ١٤٢٢: لە ماوەی گەمارۆدانی شاری کارۆلشتاین لە لایەن سەربازانی لیتوانییەوە، سەربازە لیتوانییەکان بە هۆی مەنجەنیقەوە لاشەی سەربازە مردووەکانیان و پیساییەکانیان هەڵدەدەنە ناو شارەکە، ئەمەش بوو بە هۆی ترساندنیان و بڵاوبوونەوەی تای کوشندە لە ناویاندا.[3]

* ساڵی ١٤٩٥: سەربازە ئیسپانییەکان کە لە سەرتاسەری باشووری ئیتالیا شەڕیان لەگەڵ ئیتالییەکان دەکرد، چەکی بایۆلۆجییان دژی ئیتالییەکان بەکار هێنا و تا ڕادەیەک ئەم چەکە کاری خۆی کرد. سەربازە ئیسپانییەکان خوێنی تووشبوانی نەخۆشیی گولییان لەگەڵ شەراب تێکەڵ دەکرد و لە شاری ناپۆلیی ئیتالیا بوتڵە شەرابەکانیان بە دوژمنە ئیتالیاییەکانیان دەفرۆشت.[4]

* ساڵی ١٧١٠: سوپای ڕووسیا، هێزەکانی سوید لە ڕیڤاڵ، کە دەکەوێتە لیتوانیای ئێستا، گەمارۆ دەدەن و سەربازانی ڕووسیا لاشەی ئەو مردوانەیان کە بە تاعوون مردبوون، بە مەنجەنیق

---

[1] Croddy, E. A.and Wirtz, J. J., Weapons of Mass Destruction, An Encyclopedia of Worldwide Policy, Technology, and History, Santa Barbara, California , 2005, p.xxxii.

[2] Cenciarelli, O., and Co–workers, Bioweapons and Bioterrorism: A Review of History and Biological Agents, Defence S&T Tech. Bull., 6(2): 2013, pp.111–129

[3] Cenciarelli, O., and Co–workers, Bioweapons and Bioterrorism: A Review of History and Biological Agents, Defence S&T Tech. Bull., 6(2): 2013, pp.111–129

[4] https://listverse.com/2016/09/05/10–historical–biological–and–chemical–attacks/

هەڵدەدایە ناو شارەکە. سەرکەوتنی ئەم تەکتیکەی سوپای ڕووسیا بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ترس و هیستریایان لە ناو سویدییەکاندا بڵاو کردبووەوە.[1]

* ساڵانی ١٧٥٤–١٧٦٧: کە شەڕی نێوان فەڕەنسی و هیندییە ئەمەریکاییەکان بەرپا بوو، فەرماندەی بەریتانی، سێر جیفەری ئەمهێرست، فەرمانی دەرکرد کە بەتانیی پیسبوو بە ڤایرۆسی ئاوڵە بەسەر ئەو هۆزە هیندییە ئەمەریکییانەدا دابەش بکرێت کە نەیاری بەریتانییەکان بوون بۆ ئەوەی لەناو بچن. دابەشکردنی بەتانییە پیسبووەکان بە ڤایرۆسی ئاوڵە لە هاوینی ساڵی ١٧٦٣دا بوو، دەرکەوتنی نەخۆشییە ڤایرۆسییەکە لە ناو دانیشتوانە ڕەسەنە هیندییە ئەمەریکییەکان، بۆ زیاتر لە دوو سەد ساڵ بەردەوام بوو.[2]

* ساڵی ١٧٨٥، کاتێک هێزەکانی تونس شاری ئەلقالەیان لە جەزائیر گەمارۆ دابوو، جلوبەرگی پیسبوو بە تاعوونیان وەک چەک، دژی دانیشتوانی شارەکە بەکار هێنا.[3]

* ساڵی ١٨٦٣: لە ماوەی شەڕی ناوخۆ لە ئەمەریکا، کۆنفیدراڵیخوازەکان جلوبەرگی پیسبوو بە زەردەتا و ئاوڵەیان بە هێزەکانی یەکێتیخوازەکان (Unions) دەفرۆشت، بۆ ئەوەی تووشی ئەو نەخۆشییانەیان بکەن.[4]

* ساڵانی ١٩١٦–١٩١٨: بەکرێگیراوانی ئەڵمانیا، وڵاخەکانی باریان –ئەو ئەسپانەشی دەگرتەوە کە هاوپەیمانان لە ئەورووپا بەکاریان دەهێنان– تووشی نەخۆشیی پیسەکوان (anthrax) و مقاو دەکرد.[5]

---

[1] https://c.aarc.org/resources/biological/history.asp
[2] https://c.aarc.org/resources/biological/history.asp
[3] https://www.historyofvaccines.org/content/articles/biological-weapons-bioterrorism-and-vaccines
[4] EMBO reports VOL 4 | special issue | 2003, pp. S 47– S 52 .
[5] Croddy, E. A.and Wirtz, J. J., Weapons of Mass Destruction, An Encyclopedia of Worldwide Policy, Technology, and History, Santa Barbara, California , 2005, p.xxxii.

* له نێوان ساڵانی ١٩٣٢–١٩٤٥دا، پسپۆڕانی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی ژاپۆن چەند هۆکارێکی بایۆلۆجییان لەسەر دیلەکانی جەنگ تاقی کردەوە، ئەمەش بوو بە هۆی کوشتنی پێنجهەزار بۆ دەهەزار دیل. ئەو دیلانەی کە بە هۆکارە بایۆلۆجییەکان نەمردبان، ئەوا دەیانکوشتن.[1]

* ساڵی ١٩٣٩: ژاپۆنییەکان هەوڵ دەدەن ئاو بە بەکتریای سالمۆنیلا (سالمۆنیلا هۆکاری تووشبوون بە نەخۆشیی گرانەتایە) ژەهراوی بکەن. لەم ڕووداوە کە بە ڕووداوی نۆمۆنهۆن ناو دەبرێت و هێرشێکی بایۆلۆجی بوو بۆ سەر سەربازانی سۆڤییەت، دەردەکەوێت کە هێرشەکە سەرکەوتوو نەبووبێت.[2]

* ساڵانی ١٩٤٠–١٩٤٢: سوپای ژاپۆنی لە چین، بە بەکتریای کۆلێرا و بەکتریا نەخۆشخەرەکانی تر، هێرش دەکاتە سەر ١١ شاری چین و دەبێتە هۆی کوشتنی ٢٤٠٠ دانیشتووی ئەو شارانە و بریندارکردنی دەهەزار کەسیش. لە ناو قوربانییەکاندا ژمارەیەکی بەرچاو سەربازی ژاپۆنی هەبوون.[3]

* ٢٥ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٥١: ویلیام ئەی. بۆیل، دەمرێت، دوای ئەوەی لە تاقیگەیەک لە فۆرت دیتریک لە ویلایەتی ماریلاند لە ئەمەریکا، بەکتریای پیسەکوانی بەردەکەوێت. پسپۆڕانی تاقیگەکە ئەندامەکانی لەشی بۆیل دەردێنن و وەک چاندنگەیەک بۆ چاندنی تیرەیەکی (strain) نوێی پیسەکوان بە ناوی VIB بەکاری دەهێنن، بە

---

[1] https://www.atsu.edu/faculty/chamberlain/bioterror/history.htm

[2] Croddy, E. A.and Wirtz, J. J., Weapons of Mass Destruction, An Encyclopedia of Worldwide Policy, Technology, and History, Santa Barbara, California , 2005, p.xxxiii.

[3] https://historycollection.com/48-terrifying-times-deadly-chemicals-were-used-during-biological-warfare/#

مەبەستی ئەوەی ئەم تیرە نوێیەی پیسەکوان وەک چەکێک لە چەکە بایۆلۆجییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەکار بهێنرێت.[1]

* سالّی ١٩٦٢: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەست بە کردارەکانی بەکارهێنانی گیاکوژەکان (herbicides) لە جەنگی ڤێتنامدا دەکات، لەوانە، بەکارهێنانی هۆکاری پرتەقالّی (agent orange) کە هۆکارێکی گەلاوەرێنە. بەکارهێنانی ئەم هۆکارە بۆ ئەوە بوو کە گەلای درەختەکان هەلّوەرن و چیتر ڤێتکۆنگەکان نەتوانن لە بن ئەو درەختانەدا خۆیان بشارنەوە. دواتر ئەم گیاکوژانە بوون بە هۆی بلاوبوونەوەی زۆر نەخۆشیی جینی لە ناو ڤێتنامییەکاندا کە تا ئێستاش بەردەوامە.

* ١٠ی نیسانی ١٩٧٢: بەریتانیای گەورە و یەکێتیی سۆڤییەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رێککەوتننامەیەک واژۆ دەکەن و بە شێوەیەکی یاسایی پابەند دەبن بە قەدەغەکردنی بەکارهێنانی چەکە بایۆلۆجی و تۆکسینەکانەوە.[2]

* سالّی ١٩٧٣، یەکێتیی سۆڤییەت دەست بە دامەزراندنی رێکخراوی Biopreparat دەکات کە تەرخان کرابوو بۆ بەرهەمهێنانی هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی. رێکخراوی Biopreparat بە رووکار رێکخراوێکی مەدەنی بوو و تۆرێکی بەرفراوانی تاقیگەی لە خۆ دەگرت و هەر یەکێک لەو تاقیگانە کاری لەسەر هۆکارێکی بایۆلۆجیی کوشندەی جیاواز دەکرد. ژمارەی کارمەندەکانی ئەم رێکخراوە ٣٠٠٠٠ کارمەند بوو کە توێژینەوەیان لەسەر هۆکارەکانی بایۆلۆجی

---

[1] Garrett, B.C., and Hart, J., Historical dictionary of Nuclear , Biological and Chemical Warfare , Scarecrow Press, Inc , USA , 2007, p. xxiii.

[2] Croddy, E. A.and Wirtz, J. J., Weapons of Mass Destruction, An Encyclopedia of Worldwide Policy, Technology, and History, Santa Barbara, California , 2005, p.xxxiii

دەکرد و گەلێک چەکی نەخۆشخەریان بەرهەم هێنا بۆ بەکارهێنانیان لە جەنگی گەورەدا.[١]

* لە ٢٦ی ئازاری ١٩٧٥دا، قەدەغەکردنی بەکارهێنانی چەکە بایۆلۆجی و تۆکسینەکان دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە.[٢]

* لە ١١ی سێپتەمبەری ١٩٧٨، جۆرجی ئای. مارکۆڤ کە نووسەرێکی هەڵگەڕاوەی بولگاری بوو و لە لەندەن دەژیا، دەمرێت. توێکاریکردنی جەستەکەی دەری دەخات کە حەبێکی بچووک لە لاقیدایە. شیکردنەوەی کیمیایی ئەم حەبە بچووکە دەری دەخات کە ڕایسین (Ricin)ی تێدایە. ڕایسین تۆکسینێکە کە لە تۆوی ڕووەکی ڕۆنی گەرچەک دەردەهێنرێت. مارکۆڤ چەند ڕۆژێک پێش ئەوەی بمرێت، باسی ئەوەی کردبوو لە نزیک پردی واتەرلۆی لەندەن، نووکی تیژی چەترێک لە لایەن کەسێکەوە بە لاقیدا کرابوو. دواتر دەرکەوت ئەو کەسە بەکرێگیراوی بولگاریا بووە و حکومەتی ئەو کاتەی بولگاریا ناردوویەتی بۆ ئەوەی مارکۆف بکوژێت. چەترەکە تفەنگ بوو و لە شێوەی چەتر دروست کرابوو.

* ٣ی نیسانی ساڵی ١٩٧٩: سپۆرەکانی بەکتریای پیسەکوان (anthrax) بە ڕێکەوت لە دامەزراوەیەکی چەکە بایۆلۆجییەکان لە شاری سڤێردلۆڤیسک لە ڕووسیا بڵاو دەبنەوە و بە لایەنی کەمەوە ٦٤ کەس بە هۆی هەڵمژینی ئەم سپۆرانەوە دەمرن.[٣]

* لە سێپتەمبەری ساڵی ١٩٨٤دا، تاقمێکی ئایینی بە ناوی ڕاجنیشییەکان (Rajneeshes) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، هۆکاری بایۆلۆجیی سالمۆنیلا تایفیمیوریوم ( Salmonella

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Biopreparat

[2] Croddy, E. A.and Wirtz, J. J., Weapons of Mass Destruction, An Encyclopedia of Worldwide Policy, Technology, and History, Santa Barbara, California , 2005, p.xxxiv.

[3] Garrett, B.C., and Hart, J., Historical dictionary of Nuclear , Biological and Chemical Warfare , Scarecrow Press, Inc , USA , 2007, p.xxii

Typhimurium)یـان دژی دانیشـتوانی شـاری دالاس بەکـار هێنـا، شـاری دالاس لە ویلایەتـی ئۆریگـۆن (Oregon)ـە. بەرپرسـانی تەندروسـتیی گشـتی ئەوەیـان خەملانـد کە ٧٥١ کەس بە هـۆی ئەم هێرشـەوە نەخـۆش کەوتبـوون، بەلام کەس نەمردبـوو. نـزیکەی ٤٠ کەس لە نەخۆشـکەوتووەکان ڕەوانەی نەخۆشـخانە کرابـوون. هێرشـەکە بە دوو قۆنـاغ کرابـوو، قۆنـاغی یەکەم لە ١١ بـۆ ١٨ی سێپتەمبەر بوو و بە لایەنی کەمەوە دوو ڕیستۆرانت و مەیخانەی بە ئامـانج گرتبـوو. قۆنـاغی دووەم لە ١٩ بـۆ ٢٥ سـێپتەمبەر بـوو کە بەئامـانجگرتنی ١٠ ڕیستۆرانت و مەیخانە بوو. ئامانجی هێرشـەکەی ئەم تـاقمە پیسـکردنی زەلاتەی ئەم ڕیسـتۆرانت و مەیخانـانە بـوو بە هۆکـاری بـایۆلۆجیی سـالمۆنیلا تـایفیمیوریوم، بـۆ ئەوەی دانیشـتوانی ئەم شـارە نەخـۆش بـکەون و نەتـوانن لە هەڵبژاردنـی خـۆجێیی شـارەکەدا بەشـداری بـکەن و نـوێنەری تـاقمەکە لە هەڵبـژاردنەکەدا دەربچێت. بێگومـان دوای ئەوەی ئەم تـاقمە نەیانتوانی سەرچاوەکانی ئاوی شارەکە بە سالمۆنیلا پیس بکەن، پەنایان بۆ پیسکردنی زەلاتەی ڕیستۆرانت و مەیخانەکان برد.[1]

* ئۆکتـۆبەری ٢٠٠١: تاوانکارێـک کە تـا ئێسـتا تـاوانەکەی بە تەواوی بەسـەردا سـاغ نەبـووەتەوە، چـونکە لە مـاوەی لێکۆڵینەوەکـان لەگەڵیـدا خـۆی کوشـت، چـوار نـامەی کە سـپۆرەکانی بەکتریـای پیسـەکوانیان تێدا بوو، ناردبوو بۆ چەند قوربانییەکی بێئاگا لە فلۆریدا و نیویـۆرک و نیوجێرسـی و واشـنتۆنی پایتەخـت. لە ئەنجامـدا پێـنج کەس بە هـۆی هەڵمژینـی پیسـەکوانەوە مردبـوون و لە کاتێکدا بیسـت

[1] Pilch, F.R., Zilinskas, R. A., Encyclopedia of Bioterrorism Defense, John Wiley & Sons, Inc., New Jersey, 2005, pp. 415–418

کەسی تر تووشی نەخۆشی یان شێوەیەک لە شێوەکانی نەخۆشیی پێست بووبوون، بەڵام چارەسەر کرابوون.[1]

* تا ساڵی ٢٠١١، ١٦٥ وڵات بووبوون بە ئەندام لە پەیماننامەی قەدەغەکردنی چەکی بایۆلۆجی و بەڵێنیان دابوو، واز لە چەکە بایۆلۆجییەکانیان بهێنن.[2]

---

[1] Croddy, E. A.and Wirtz, J. J., Weapons of Mass Destruction, An Encyclopedia of Worldwide Policy, Technology, and History, Santa Barbara, California , 2005, p.xxxv.

[2] https://en.wikipedia.org/wiki/History_of_biological_warfare#Antiquity

### ١–٢: بڵاوبوونەوەی پێنج پەتا لە دوو دەیەی سەرەتای سەدەی بیستویەکەمدا

* لە ماوەی نێوان دیسەمبەری ٢٠٠٣ و شوباتی ٢٠٠٤دا، بڵاوبوونەوەی نەخۆشخەرێکی توندی ئەنفلونزای باڵندەی جۆری A (H5N1)، لە ناو باڵندە ماڵییەکان لە کەمبۆدیا، چین، ئەندۆنیسیا، ژاپۆن، لاوس، کۆریای باشوور، تایلەند و ڤێتنام ڕاگەیەنرا. لە ٩ی شوباتی ساڵی ٢٠٠٤دا، ٢٣ حاڵەتی تووشبوونی مرۆڤ بە ئەنفلونزای باڵندەی A (H5N1) کە لە تاقیگە پشتڕاست کرابووەوە و مردنی ٢٣ کەسی لێ کەوتبووەوە، لە تایلەند و ڤێتنام ڕاگەیەنرا. سەرەڕای ئەوەش، ١٠٠ حاڵەتی گومانلێکراوی تووشبوونی مرۆڤ بە ئەنفلونزا کە لەژێر لێکۆڵینەوەی دەسەڵاتدارانی تەندروستیی نیشتیمانیدا بوون، لە تایلەند و ڤێتنام ڕاگەیەنرابوو.

دەیان ملیۆن باڵندەی ماڵی بەم ڤایرۆسە مرداربوونەوە و سەدان ملیۆنیش بۆ ڕزگاربوون لێیان سەربڕان. ئەو وڵاتانەی کە حاڵەتێک یان زیاتری تووشبوونی زۆری باڵندەی ماڵییان بە ئەنفلونزای H5N1 ڕاگەیاند (کە بە لایەنی کەمەوە بوو بە هۆی مرداربوونەوەی هەزاران باڵندەی ماڵی یان لە گەلێک حاڵەتدا مرداربوونەوەی ملیۆنان باڵندەی ماڵیی لێ کەوتەوە)، ٤٧ وڵات بوون لەسەر ئاستی جیهان.[1]

* ئەنفلونزای بەراز، بۆ یەکەم جار، لە ساڵی ٢٠٠٩ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەرکەوت و بە خێرایی بە هەموو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و جیهاندا بڵاو بووەوە.

پەتای ئەنفلونزای بەرازی ساڵی ٢٠٠٩، پەتایەکی ئەنفلونزا بوو، نزیکەی ماوەی ١٩ مانگ بەردەوام بوو، لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٩ تا ئابی ٢٠١٠. ئەم پەتایە دووەم پەتا بوو، لە دوو پەتای ڤایرۆسی ئەنفلونزای H1N1 (یەکەم پەتا، پەتای ئەنفلونزای ئیسپانی ١٩١٨–١٩٢٠ بوو). لە سەرەتادا، ئەم پەتایە لە نیسانی ٢٠٠٩ باس

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/2009_swine_flu_pandemic

کرا، وا دەرکەوت کە ئەم ڤایرۆسە تیرەیەکی نوێی H1N1 بێت کە لە ئەنجامی دووبارە تێکەڵبوون و ڕێکخستنەوەی مادە جینییەکانی سێ ڤایرۆسی باڵندە و بەراز و مرۆڤ پەیدا بووبێت و جارێکی تر لەگەڵ ڤایرۆسی ئەنفلونزای بەرازی ئۆراسیا یەکی گرتبێت و زاراوەی "ئەنفلونزای بەراز"ی خوڵقاندبێت.[1] هەندێک لێکۆڵینەوە ژمارەی ڕاستەقینەی حاڵەتەکانی تووشبوون بە پەتای ئەنفلونزای ساڵی ٢٠٠٩، لەوانە، ئەو حاڵەتانەی نیشانەکانی تووشبوونەکانیان تێیدا دەرناکەوێت یان بە سووکی دەردەکەون، بە ٧٠٠ ملیۆن بۆ ١،٤ ملیار کەس خەمڵاندبوو - یان ١١٪ بۆ ٢١٪ی سەرجەم دانیشتوانی جیهان کە ئەو کاتە ٦،٨ ملیار کەس بوو. ٧٠٠ ملیۆن کەس کە ژمارە کەمەکەیە، زۆر زیاترە لەو ٥٠٠ ملیۆن کەسە خەمڵێنراوەی کە تووشی پەتای ئەنفلونزای ئیسپانی بووبوون.[2]

* پەتای ڤایرۆسی ئیبۆلای ڕۆژئاوای ئەفریقیا (٢٠١٣-٢٠١٦)، کە بڵاوترین نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلایە (EVD) لە مێژوودا، بوو بە هۆی مردنی ژمارەیەکی زۆر و تێکچوونی پەیوندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان لە ناوچەکەدا، بە شێوەیەکی سەرەکی لە وڵاتەکانی غینیا و لیبریا و سیرالیۆن. یەکەم حاڵەتی تووشبوون بە نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا، لە دیسەمبەری ٢٠١٣ لە غینیا تۆمار کرا و دواتر نەخۆشییەکە بە وڵاتانی لیبریا و سیرالیۆن کە دوو هاوسێی غینیان بوون، بڵاو بووەوە، لەگەڵ بڵاوبوونەوەیەکی کەم لە وڵاتانی تر. ئەم ڤایرۆسە بوو بە هۆی گیانلەدەستدانێکی زۆر، لە سەرەتادا ڕێژەی حاڵەتەکانی گیانلەدەستدان ڕێژەیەکی زۆر بوو، لە کاتێکدا ڕێژەی مردنی ئەو تووشبوانەی لە نەخۆشخانەکان بوون، لە نێوان ٥٧٪ بۆ

---

[1] – https://en.wikipedia.org/wiki/2009_swine_flu_pandemic
[2] https://www.cdc.gov/flu/pandemic-resources/2009-h1n1-pandemic.htm

٥٩٪ بـوو. کۆتـا ژمـارەی تووشـبووەکان ٢٨٦١٦ کەس بـوو، لەوانە، ١١٣١٠ کەسـیان مردبـوون، کە ڕێژەی مـردن دەکـاتە ٤٠٪. لە وڵاتـانی نایجیریـا و مـالی بە شـێوەیەکی کەم بـڵاو بووبـووەوە و هەنـدێک تووشـــبوونی لاوەکـــی لە نــاو کارمەنـــدانی پزیشـــکیی ویـــلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئیسپانیا ڕوویـان دابوو. وێڕای ئەوانەش، حـاڵەتی تووشـبوونی جیاجیـا لە سـینیگال و شانشـینی یەکگرتـوو و ئیتالیا ڕوویان دابوو. ژمارەی حاڵەتەکانی تووشـبوون لە ئۆکتـۆبەری ٢٠١٤ گەیشـــتبوو بە لـــوتکە، ئینجـــا دوای پابەنـــدبوون بە کـــۆمەکی گەورەی نێودەوڵەتی، وردەوردە ژمارەکە کەم ببووەوە.

لە ٨ی ئایـاری ٢٠١٦دا، ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهـانی و ئەو حکومەتـانەی ئەم پەتایەیـان تێدا بـڵاو بووبـووەوە، ٢٨٦٤٦ی حـاڵەتی تووشـــبوون و ١١٣٢٣ مردنیـــان ڕاگەیانـــد (دەکـــاتە ٣٩,٥٪ی مردنـــی تووشـبوان). ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهـانی بـڕوای وابـوو کە ئەم ژمـارانە بە شـێوەیەکی سـەرەکی کەمتـرن لە ژمـارەی ڕاسـتەقینەی بڵاوبوونەوەی پەتاکە.[1]

*پەتای کۆڤید-١٩ (COVID-19) هەر وەک بە بە پەتـای ڤایرۆسـی تەندروســـتیی جیهـــانی، لە ٣٠ی کـــانوونی دووەمـــی ســـاڵی ٢٠٢٠، حاڵەتێکی لەناکاوی تەندروستیی گشتی، کە نیگەرانیی نێودەوڵەتیی لـێ کەوتەوە، ڕاگەیانـــد. ڕێکخـــراوەکە لە ١١ی ئـــازاری ســـاڵی ٢٠٢٠دا بڵاوبـوونەوەی کۆڤیـد-١٩ی وەک پەتـایەک ڕاگەیانـد. لە ٢٠٢٠/٩/٩، زیـاتر لە ٢٧,٤ ملیۆن کەس لە زیـاتر لە ١٨٨ وڵات و نـاوچە، تووشـی ڤایرۆسـی کۆڤیـد-١٩ بووبـوون و لەوانەش زیـاتر لە ٨٩٦٠٠٠ کەس مردبوون و زیاتر لە ١٨,٤ ملیۆنیش چاک بووبوونەوە.

ئەم پەتـایە بـوو بە هـۆی تێکچـوونی بـاری کـۆمەڵاتی و ئـابووریی جیهـان، لەوانە، گەورەتـرین سســتیی ئـابووریی جیهـانی، لەوەتـەی

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Western_African_Ebola_virus_epidemic#

سستییە گەورەکەی ئابووری کە لە ساڵانی ١٩٣٠ لەسەر ئاستی جیهان ڕووی دابوو. نزیکەی سەد ملیۆن کەس لە جیهاندا تووشی ئەوپەڕی هەژاری بوون. برسێتیی جیهانی کاری کردە سەر سەدوسی ملیۆن کەس. هەروەها کۆڤید-١٩ بووەتە هۆی دواخستن یان هەڵوەشاندنەوەی ڕووداوە وەرزشی و ئایینی و سیاسی و کولتوورییەکان و زیاتر کەمبوونەوەی بەرفراوانی خستنەڕووی کاڵاکان بە هۆی کڕین، لە ترسی گرانی و قاتوقڕی. هەروەها کەمبوونەوەی فڕێدانی پیسکەرەکان بۆ ناو هەوا و گازەکانی گوڵخانەی (greenhouse gases) لێ کەوتەوە. خوێندنگە و زانکۆ و کۆلێجەکان بە نیوەچڵی یان بە تەواوی لە ٧٣ وڵات داخران، ئەمەش کاری کردە سەر نزیکەی ٧٢,٩٪ی سەرجەم خوێندکارانی جیهان. زانیاریی هەڵە دەربارەی ئەم ڤایرۆسە لە سۆشیال میدیا و هۆیەکانی ڕاگەیاندن بڵاو بووەوە. گەلێک ڕووداوی لەبیگانەترسان و ڕووداوی جیاکاری لە دژی چینییەکان (Chineses) و ئەوانەی هەست دەکرا کە چینین، یان ئەوانەی لەو ناوچانە بوون کە ڕێژەی بڵاوبوونەوەی پەتاکەی تێدا زۆر بوو، ڕوویان دەدا.[1]

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/COVID-19_pandemic

چەکی بایۆلۆجی، کە چەکی میکرۆبییشی پێ دەڵێن، بریتییە لە هەر یەکێک لە هۆکارە نەخۆشخەرەکان -وەک بەکتریا، سپۆری بەکتریا، ڤایرۆس، ریکێتسیا، کەڕوو یان تۆکسینەکان- یاخود هۆکارە بایۆلۆجییەکانی تر- کە دەشێت بە مەبەست وەک چەک دژی مرۆڤ، ئاژەڵ یاخود ڕووەک بەکار بهێنرێن.

بەکارهێنانی ڕاستەوخۆی هۆکارە نەخۆشخەرە درمەکان و ژەهرەکان، دژی سەربازانی دوژمن، کارێکی لەمێژینە بووە لە جەنگەکاندا. لە ڕاستیدا، لە زۆر لە ناکۆکی و جەنگەکاندا، ئەوەندەی هۆکارە نەخۆشخەرەکان لە لایەنەکانی کوشتووە، زۆر زیاتر بووە لە سەرجەم ئەو چەکانەی لە جەنگەکاندا لە لایەنەکانی کوشتووە، تەنانەت کاتێک ئەم هۆکارە درمانە یان ژەهرانە بە مەبەستیش بەکار نەهێنرابن.

چەکە بایۆلۆجییەکانیش، وەک چەکە کیمیاییەکان و چەکە تیشکییەکان و چەکە ناوکییەکان بە گشتی، وەک چەکی کۆکوژ ئاماژەیان بۆ دەکرێت، هەرچەندە، لە ڕاستیدا زاراوەی چەکی کۆکوژ بۆ چەکە بایۆلۆجییەکان گونجاو نییە. دەشێت چەکە بایۆلۆجییەکان بتوانن کوشتارێکی زۆر بخەنەوە، بەڵام ناتوانن ژێرخان یان خانووبەرە یان کەلوپەل بە تەواوی وێران بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، بە هۆی سروشتی ئەم چەکە بایۆلۆجییانە کە جیاوازی لە نێوان دۆست و دوژمندا ناکات -وێڕای ئەگەری بڵاوبوونەوەی و بە زەحمەت کۆنترۆڵکردنی کاریگەرییەکانی و ئەو ترسە زۆرەی دەیخوڵقێنن- زۆرینەی دەوڵەتان قایل بوون بەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان قەدەغە بکەن.[1]

---

[1] https://www.britannica.com/technology/biological-weapon

**بەراورد لە نێوان چەک بایۆلۆجییە بەکتریاییەکان و چەکە کیمیاییەکان**

١- چەکی بایۆلۆجیی بەکتریایی زیانی زیاتر دەدات و تێچووی کەمتری بۆ ئامادەکردنی پێویستە وەک لە چەکی کیمیایی.

٢- دەتوانرێت هەردوو جۆرە چەکەکە لە هەوادا بڵاو بکرێنەوە.

٣- هەردوو جۆرەکە لە ڕێی هەناسەدانەوە دەچنە ناو لەشی مرۆڤ، ئەگەر مرۆڤەکە دەمامک بەکار نەهێنێت.

٤- هەردووکیان دەتوانن خۆراک و ئاو و جلوبەرگ و کەلوپەل پیس بکەن.

٥- هەندێک لە هۆکارەکانی هەردوو جۆرەکە کاریگەریی درێژخایەنیان دەبێت و لە ژینگەدا دەمێننەوە یاخود نامێننەوە.

٦- کاری دۆزینەوەی هۆکارە بایۆلۆجییە بەکتریاییەکان کارێکی قورسە، بەڵام ئەوەی هۆکارە کیمیاییەکان ئاسانترە.

٧- کاریگەریی هۆکارە بایۆلۆجییەکان لەسەر لەشی مرۆڤ جیاوازە لەوەی هۆکارە کیمیاییەکان. هۆکارە بایۆلۆجییەکان دەبنە هۆی گەلێک نەخۆشی و دەستبەجێ هەستیان پێ ناکرێت، لە کاتێکدا کاریگەرییەکانی هۆکارە کیمیاییەکان زووتر دەردەکەون و دەبنە هۆی گەلێک نەخۆشیی وەک نەخۆشیی کرژبوونی ماسوولکەکان یان دەرکەوتنی بلۆق لەسەر لەش.[1]

چەکی بایۆلۆجی (biological weapon) پێشی دەوترێت هۆکاری هەڕەشەی بایۆلۆجی یان هۆکاری جەنگی بایۆلۆجی (biological warfare agent) یان زیندە-هۆکار (bio-agent) یاخود زیندەچەک (bioweapon). تاکو ئەمڕۆ زیاتر لە ١٢٠٠ جۆری جیاواز لە زیندە-هۆکار هەن کە باس کراون و لێیان کۆڵراوەتەوە و دەکرێت بکرێنە چەکی بایۆلۆجی.

---

[1] الساكت، منيب، صباريني، غالب، الجغبير، ماضي، اسلحة الدمار الشامل، عمان: دار زهران، ٢٠٠٩، ص ٩٥.

چەکە بایۆلۆجییەکــان توانــای ئەوەیــان هەیە بە چەنــدین ڕێگــەی جۆراوجــۆر کــاریگەریی زیــانبەخش لەســەر تەندروســتیی مــرۆڤ دروســت بــکەن، لە کــاردانەوەی هەســتیارییانەی کەمەوە بــۆ چەنــدین حــاڵەتی مەترسیدار کە برینداربوونی مەترسیدار یان کەمئەندابوونی بەردەوام یــاخود تەنــانەت مردنیشــی لــێ دەکەوێــتەوە. زۆر لەو زیندەوەرانەی دەکرێنە چەکی بایۆلۆجی، لە ژینگەی سروشتیدا هەن، لە هەموو شوێنێکدا هەن، لە ناو ئاو، گڵ، ڕووەکەکان یاخود لە لەشی ئاژەڵانــدا. دەشــێت زینــدە-هۆکارەکــان بکــرێن بە چەک بــۆ ئەوەی بە ئاســانی بەکــار بهێنــرێن یــان بــڵاو بکــرێنەوە. لەوانەیە گۆڕانکــاریی بۆماوەییــان تێــدا بکرێــت بــۆ ئەوەی ڕەوشــتە پەکخەرەکانیــان یــان کوشــندەییەکانیان بەهێزتــر بکــرێن، یــان وایــان لــێ بکرێت کە ئەوانەی بەم هۆکــارانە تووشــی نەخۆشــی دەبــن، چارەســەرە ئاســاییەکان یــان دەرمانەکــانی چارەســـەرکردنیان هــیچ کاریگەرییەکیــان لەســـەر چاکبوونەوەیــان نەبێــت. لەبەر ئەوەی زینــدە-هۆکارەکــان بە خێرایــی زۆر دەبن و پێویستیان بە کەمترین هۆ هەیە بۆ بڵاوبوونەوە، دەشــێت لە داهــاتوودا مەترســییەکی گەورە بــۆ ســەر کۆمەڵگــە و ژیــنگە پیشەییەکان دروست بکەن.[1]

هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی، لە زۆر شتدا لە نێوان خۆیاندا لێک جیاوازن: جۆری وردەزیندەوەر یان تۆکسینی بەکارهێنراو لە چەکدا، کوشــندەیی، درێژیــی مــاوەی کــڕکەوتن (incubation)، درمێتــی (لێگــرتنەوە)، جێگیــری، توانــای چارەســـەرکردنی بە پێکــوتە و دەرمانەکانی ئێستا.

پێنج جۆری جیاواز لە هۆکارە بایۆلۆجییەکان هەن کە دەتوانرێت بکرێن بە چەک و لە جەنگ و کاری تیرۆریستیدا بەکار بهێنرێن. ئەم پێنج جۆرەش ئەمانەن:

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Biological_agent

* بەکتریا (Bacteria): زیندەوەری وردبینی یەکخانەیین و دەبنە هــــۆی زۆر نەخۆشـــیی وەک پیســـەکوان (anthrax)، گرانەتـــا، کەروێشـکەتا و تـاعوون. بەکتریـا بە شـێوەیەکی سروشـتی لە زۆر شوێنی جۆراوجۆردا هەیە، لە نـاو ئاژەڵ و رووەکـی زیندوو، لە نـاو مـادە رزیوەکـان و تەنـانەت مـادە مردووەکانیشـدا. هەروەهـا لە گڵ و هەوادا هەیە. بەکتریـا لە رووی ژینگەیـیەوە خـۆراگرە؛ پێویسـتی بە خانەخوێیەکی زیندوو نییە بۆ وەچەخستنەوە؛ دەتوانرێ بە ئاسـانی بچێنـرێ (cultivated). زۆر گونجـاون بـۆ ئەوەی بکـرێن بە چەک. لە لایەکی ترەوە، زۆر لە بەکتریاکان دژەزیندە (antibiotic) کاریان تێ دەکات و دەتوانرێت بە دژەزیندە چارەسـەر بکرێن، ئەمەش دەکەوێتە سەر جۆری بەکتریاکە و کاتی چارەسەرکردنەکە.

* ریکێتسـیاکان (Richettsiae): وردەزینـدەوەری بچـووکن و لە بەکتریـا و ڤایرۆســەکان دەچـن، بەڵام لە راسـتیدا مشـەخۆری راسـتەقینەن و لە نـاو خانەکانـدا زۆر دەبـن و وەچە دەخەنەوە. لە کاتێکدا ریکێتسـیاکان زینـدەوەری بچـووکن، تـا رادەیەک جێگیـرن و دەتوانرێت بە شێوەی پرژە (aerosol) لە هەوادا بڵاو بکرێنەوە، بەڵام بەرهەمهێنانیـان، بە هەر برێـک بێـت، کـارێکی قورسـە و چارەسـەری کاریگەریش بۆ بەرهەڵستیی کاریگەرییەکانیان هەیە. ریکێتسیاکان بە ئاسانی لە تووشبوویەکەوە بۆ کەسێکی تر ناگوێزرێنەوە و بە گشتی بە هەرەشە دانانرێن بۆ بەرهەمهێنانی چەکی بـایۆلۆجی. رەشـەگرانەتا و تـای کیـو (Q–fever) نمـوونەیەکن لەو نەخۆشـییانەی بە هـۆی زیندەوەرەکانی ریکێتسیاوە روو دەدەن.

* ڤایرۆسـەکان (Viruses): ئەوانە مشـەخۆری ئەوپەری بچـووکی نـاو خانەکـانن، قەبارەکانیـان نـزیکەی یەک لەسـەر سـەدی قەبـارەی بەکتریـایە. هەرچەنــدە ئەو ڤایرۆســانە، بە گشـتی، پێویسـتیان بە خانەخوێیەکی زیندوو هەیە بۆ زۆربوون و وەچەخستنەوە و دەشێت خۆنەگر بن بەرامبەر تێکچوونی ژینگەیی، بەڵام هێشتا بەربژێرێکن بۆ

ئەوەی بکرێن بە چەکی بایۆلۆجی. ڤایرۆسەکان دەبنە هۆی گەلێک نەخۆشی، وەک نەخۆشییەکانی هەوکردنی مێشکی وڵاخی ڤەنزویلایی و ئاوڵە یان تایەکانی خوێنبەربوون، وەک: ئیبۆلا (Ebola) و ماربورگ (Marburg).

* کەڕووەکان (Fungi): ئەمانە هەندێکیان نەخۆشخەرن و دەتوانرێت بکرێن بە چەکی بایۆلۆجی. بۆ نموونە، ئەو کەڕوانەی تۆکسین بەرهەم دەهێنن، دەتوانرێت دژی مرۆڤ بەکار بهێنرێن، چونکە تا ڕادەیەکی زۆر لە ڕووی ژینگەییەوە خۆگرن و دەتوانرێت بە شێوەی پرژە لە هەوادا بڵاو بکرێنەوە. ئەگەری ئەوە زۆرە کەڕووەکان بکرێن بە چەکی بایۆلۆجی و بۆ لەناوبردنی بەروبوومی کشتوکاڵی بەکار بهێنرێن و زیانێکی گەورەی ئابووری بە دوژمن بگەیەنن. نموونەی ئەو نەخۆشییانەی کەڕووەکان بە بەروبوومی کشتوکاڵیی دەگەیەنن، وەک نەخۆشییەکانی وشکبوونی مەرەزە، ژەنگهێنانی دانەوێڵە، خەڵووزەی گەنم و دەردەپەتاتە.

* تۆکسینەکان (Toxins): تۆکسینەکان لە لایەن هەندێک زیندەوەرە وردبینەکانەوە بەرهەم دەهێنرێن، بەڵام دەکرێت بە ڕێگەی پیشەسازییش دروست بکرێن. تۆکسینەکان دەتوانرێت بکرێن بە چەک، ئەوەیش لە ڕێی دەرهێنانیان لە ژەهرەکانی مار و مێروو و جاڵجاڵۆکە و زیندەوەرە دەریاییەکان و ڕووەک و بەکتریا و کەڕووەکان و ئاژەڵان. بە گشتی، تۆکسینەکان لە ڕێی دەستوەردانیان لە کارەکانی ناو خانە و شانەکان، کار لە گیانەوەران دەکەن، دەبنە هۆی ئەوەی گیانەوەران نەتوانن کۆنترۆڵی هەناسەدان یان کۆنترۆڵی کاری ماسوولکەکانیان بکەن. تۆکسینەکان هێڵی جیاکردنەوەی نێوان هۆکارە بایۆلۆجییەکان و کیمیاییەکان کاڵ دەکەنەوە. لە دانوستاندنە سەرەتاییەکانی پەیماننامەی قەدەغەکردنی چەکە بایۆلۆجییەکاندا مشتومڕ لەسەر چۆنێتیی پۆلێنکردنی تۆکسینەکان هەبوو، چونکە بە پێچەوانەی زۆر لە هۆکارە بایۆلۆجییەکان، تۆکسینەکان نازیندوون،

ناتوانن زۆر ببن و وەچە بخەنەوە. بۆ نموونە، تۆکسینی ڕایسین (ricin) کە لە تۆوی ڕووەکی گەرچەک دەردەهێنرێت، هێڵی جیاکەرەوەی نێوان هۆکاری بایۆلۆجی و هۆکاری کیمیایی کاڵ دەکاتەوە.[1]

چەکە بایۆلۆجییەکان، بە شێوەیەکی سەرەکی، لە ڕێی هەڵمژین بە هۆی هەناسەدانەوە، یان لە ڕێی هەوپێکردنی برینی کراوە یان لە ڕێی پیسکردنی خۆراک و ئاوەوە، کاری خۆیان دەکەن. زۆرینەی هۆکارەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان، کاتێک لە هەوادا بە شێوەی پرژە (aerosol) بڵاو دەکرێنەوە، چالاکن و دەشێت لە ڕێی هەناسەدانەوە هەڵبمژرێن و بچنە ناو سییەکانەوە. بۆ ئەوەی هۆکارەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان بتوانن بچنە ناو سێکڵدانۆچکەکانی سییەکانەوە، دەبێت قەبارەکەیان نزیکەی لە نێوان یەک بۆ پێنج مایکرۆن بێت، ئەمەش قەبارەیەکی نموونەییە. ئەم دڵۆپە بچووکانە یان پرژانە، دەگەنە بەشی خوارەوەی سییەکان و بە ناو بەربەستی خوێن-گازدا ڕەت دەبن، بۆ ئەوەی لە ناو سێکڵدانۆچکەکاندا هەوکردن دەست پێ بکەن.

لە کاتێکدا هەزاران نەخۆشخەر و تۆکسین لە سروشتدا هەن، بەڵام تەنها نزیکەی ١٦٠یان بەوە ناسراون کە توانای زیانگەیاندنیان بە مرۆڤ هەبێت؛ تەنها ٣٠ لەو ١٦٠ نەخۆشخەرە یان تۆکسینانە، دەشێت بە هۆکاری جەنگی دابنرێن. ئەم هۆکارانە تاقیکردنەوەیان لەسەر کراوە و پەرەیان پێ دراوە، بۆ ئەوەی وەک هۆکار بۆ چەکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێن، هەروەها دەرکەوتووە کە هەندێکیان لەوانی تر کاریگەرترن.

ئەو هۆکارە بایۆلۆجییانەی بە گونجاو دادەنرێن، بۆ ئەوەی بکرێن بە چەکی بایۆلۆجی، دەبێت یەکێک یان زیاتر لەو خەسڵەتانەی خوارەوەیان تێدا بێت. بێگومان زۆر کەم لە ئێمە بەرگریی زگماکیی

---

[1] a. Chemical and Biological Warfare Overview, 2015 – Air University, b. www.airuniversity.af.edu › Books › cbwprimer2015, c. https://www.britannica.com/technology/biological-weapon

دژی هۆکارەکانی چەکی بایۆلۆجی و نەخۆشییەکانی پەیوەست بەو هۆکارانەوە هەیە:

١- هۆکارە بایۆلۆجییەکە، بە ژەمێکی (dose) کەم و بە شێوەیەکی متمانەپێکراو، توانای تووشکردنی ئامانجەکەی بە نەخۆشی هەبێت.

٢- ژەهراوێتییەکەی زۆر بێت یان توانای نەخۆشخستنی توندی هەبێت، کە مردن یان پەککەوتەیی تووشبووەکەی لێ بکەوێتەوە.

٣- توانای ئەوەی هەبێت کە لە ماوەی بەرهەمهێنان و هەڵگرتن و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیدا، بە چالاکی بمێنێتەوە.

٤- ماوەی کڕکەوتنەکەی (incubation) کورت بێت. ماوەی کڕکەوتن ئەو ماوەیەیە کە دەکەوێتە نێوان تووشبوون بە نەخۆشییەکە و دەرکەوتنی نیشانەکانی تووشبوون بە نەخۆشییەکە.

٥- بەرهەڵستیی بەرامبەر چارەسەری پزیشکی هەبێت.

٦- بەرهەمهێنانی لە ڕووی ئابوورییەوە گونجاو بێت، کە سوپا بتوانێت بڕێکی زۆری، بە تێچوویەکی کەم، لێ بەرهەم بهێنێت.

٧- بە ئاسانی بڵاو بکرێتەوە و توانای مانەوەی لە دۆخە ژینگەییە سەختەکاندا هەبێت.

٨- ئەو هێزە هێرشبەرە یان لایەنەی کە چەکە بایۆلۆجییەکە دژی دوژمن بەکار دەهێنێت، لە چەکەکە پارێزراو بێت.

ئامانجی چەکی بایۆلۆجی وەک ئامانجی هەندێک چەکی کیمیاییە، کە پەکخستنی هێزە چەکدارەکانی دوژمنە، نەک کوشتنیان. لەبەر ئەم هۆیە، زۆر لە هۆکارە بایۆلۆجییەکان یان نەخۆشخەرەکان، گونجاون بۆ ئەوەی وەک چەکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێن، چونکە توانایەکی زۆری تووشکردنیان بە نەخۆشی هەیە وەک لەوەی توانای کوشتنیان هەبێت. بۆ نموونە، تای کیو (Q fever) کوشندە نییە؛ بەڵام تاکە زیندەوەرێکی ئەم هۆکارە کە Coxiella burnetilیە، بەشی ئەوە دەکات نەخۆشییەکە تووشی سییەکان بکات. ڤایرۆسی هەوکردنی مێشکی ڕەشەوڵاخی ڤەنزویلایی دەبێتە هۆی نەخۆشییەک کە بە

دەگـــمەن کوشـــندەیە. ئەم ڤایرۆســـە لە لایەن بەرنـــامەی چەکە بایۆلۆجییەکـانی ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا و یەکێتیـی سـۆڤییەتەوە پەرەی پـێ درا، چـونکە توانـایەکی زۆری تووشـکردنی ڕەشەوڵاخی هەبوو.[1]

## ڕێگەکانی بڵاوکردنەوەی چەکی بایۆلۆجی

چەکە بایۆلۆجییەکان بە سێ ڕێگە بڵاو دەکرێنەوە:

١- پیسـکردنی ئەو خـۆراک و ئـاوانەی کە قوربانییەکـان بەکـاری دەهێنن، بەو چەکانە.

٢- بڵاوکـردنەوەی گـوێزەرەوە یـان هەڵگرانـی نەخۆشـیی چەکە بـایۆلۆجییەکە، بە تـایبەتی ئەوانەی لەسـەر قوربـانییەکە دەژیـن، وەک مێشوولە و کێچی هەڵگری نەخۆشییەکە.

٣- دروستکردنی تەمومژێک یان هەورێک لە چەکە بایۆلۆجییەکە لەسـەر ئەو نـاوچەیەی کە قوربـانییەکەی لێـیە، کاتێـک قوربـانییەکە هەوای نـاوچەکە هەڵـدەمژێت، تووشـی نەخۆشـییەکە دەبێـت. ئەگەر ئامـانجەکە ڕووەک بێت، ئەوا تەمـومژەکە یـان خـودی هەوری چەکە بایۆلۆجییەکە، لەسەر ئەو شوێنەی ڕووەکەکانی لێیە، ڕێک دەخرێت و دەوەستێنرێت بۆ ئەوەی ڕووەکەکان تووشی نەخۆشی بکات.

پیســـکردنی خـــۆراک بە هۆکـــارە بایۆلۆجییەکـــان (چەکە بایۆلۆجییەکان)، ئەگەر بە هێرشـی سـەربازی بەراورد بکرێت، یەکێکە لە ڕێگـە هەرە باوەکـان بـۆ ئەنجامـدانی تـاوانی بـایۆلۆجی. پیسـکردنی بڕێکی زۆری خۆراک بە هۆکاری بایۆلۆجی، بۆ ئەوەی دەسـتکەوتێکی زۆری سـەربازیی لـێ بکەوێـتەوە، بە کـارێکی قـورس دادەنرێـت. دەتوانرێت چەکی بایۆلۆجی بە چەند ڕێگـەیەک بـڵاو بکرێتەوە، ڕێگـە هەیە پشت دەبەستێت بە تەقاندنەوەی بۆمبێک یان مووشەکێک یـاخود

---

[1] Croddy, E., Chemical and Biological warfare, Springer Science Business Media New York, New York, 2002, pp. 193– 194

لوولەکێـک، یـان ڕشـاندن و بڵاوکـردنەوەی لە ڕێـی کونەکـانی ئەو تانکییەی کە تێیدایە.[1]

### پۆلێنکردنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان

چەنـدین جـۆری جیـاواز لە هۆکـارە بایۆلۆجییەکـان هەن، کە دەتوانرێت بۆ چەکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێن، لە کاتێکدا جۆرەکانی هۆکـارە کیمیاییەکـان کە بـۆ چەکـی کیمیـایی بەکـار دەهێنـرێن، زۆر کەمتـرن لەچـاو هۆکـارە بایۆلۆجییەکـان. سـوپای ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا هۆکـارە بایۆلۆجییەکـانی بەگـوێرەی سەرچاوەکانیان پۆلێن کردووە، هەریەکەیان پیتێک و ژمارەیەکی بۆ داناون. پۆلێنەکە لەم خشتەیەی خوارەوەدا پیشان دراوە. بۆ نموونە، بۆ ڤایرۆس پیتی (V)، بۆ بەکتریا (B)، بۆ ڕیکێتسیا (R) و بۆ تۆکسین (T)ی داناوە، وەک لە خشتەی (٢-١) پیشان دراوە.

خشـتەی (٢-١): پـۆلێنکردنی هۆکـارە بایۆلۆجییەکـان لەسـەر بنچینەی سـەرچاوەکانیان کە سـوپای ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەم پۆلێنەی ڕێک خستووە.

| Virusڤایرۆس | ناوی ڤایرۆس |
|---|---|
| V1 | Chikungunya virus |
| V2 | Congo–Crimean hemorrhage fever virus |
| V3 | Dengue fever virus |
| V4 | Eastern equine encephalitis virus |
| V5 | Ebola virus |
| V6 | Hantaan virus |
| V7 | Junin virus |
| V8 | Lassa fever virus |

[1] زايد، خليفة عبدالمقصود، الاسلحة البيولوجية و وسائل مقاومتها، دار الكتاب الجامعي، العين، الامارات العربية المتحدة، ٢٠١٤، ص ٢١.

| | |
|---|---|
| V9 | Lymphocytic choriomeningitis virus |
| V10 | Machupo virus |
| V11 | Marburg virus |
| V12 | Monkey pox virus |
| V13 | Rift Valley fever virus |
| V14 | Tick–borne encephalitis virus (Russian spring–summer encephalitis virus) |
| V15 | Variola virus |
| V16 | Venezuelan equine encephalitis virus |
| V17 | Western equine encephalitis virus |
| V18 | White pox |
| V19 | Yellow fever virus |
| V20 | Japanese encephalitis virus |
| Rickettsia ریکیتسیا | ناوی ریکیتسیا |
| R1 | Coxiella burnetii |
| R2 | rickettsia Quintana |
| R3 | rickettsia prowasecki |
| R4 | rickettsia rickettsia |
| Bacteria بەکتریا | ناوی بەکتریا |
| B1 | Bacillus anthracis |
| B2 | Brucella abortus |
| B3 | Brucella melitensis |
| B4 | Brucella suis |
| B5 | Chlamydia psittaci |
| B6 | Clostridium botulinum |
| B7 | francisella tularensis |
| B8 | fseudomonas mallei |
| B9 | fseudomonas pseudomallei |
| B10 | salmonella typhi |
| B11 | shigella dysenteriae |
| B12 | Vibrio cholera |
| B13 | Yersinia pestis |

| Toxin تۆکسین | ناوی تۆکسین |
|---|---|
| T1 | Botulinum toxins |
| T2 | Clostridium perfringens |
| T3 | Conotoxin |
| T4 | Ricin |
| T5 | Saxitoxin |
| T6 | Shiga toxin |
| T7 | staphylococcus aureus |
| T8 | Tetrodotoxin |
| T9 | Verotoxin |
| T10 | Microcystin (cyanginosin) |

بێگومـان ژمـارەی هۆکـارە بایۆلۆجییەکـان ئەوپەڕی زۆرن، بەڵام هەنـدێکیان لە چەنـدین بەرنـامەی سـەربازیدا لێکۆڵینەوەیـان لەسـەر کراوە و پەرەیان پێ دراوە بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا وەک چەکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێن. مرۆڤ یەکێکە لەو ئامـانجە هەرە گرنگانەی کە چەکـی بـایۆلۆجی لـە دژی بەکـار دەهێنرێـت. هەرچەنـدە چەکە بایۆلۆجییەکـان لە لایەن زۆریـنەی وڵاتـانەوە قەدەغە کـراون، بەڵام هەندێک وڵات هەتا ئێستاش ئەم چەکە بایۆلۆجییانە ئامـادە دەکەن. لە ویلایـەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا، ئەو چەکە بایۆلۆجییـانەی کە بـۆ هێرشکردن بەکار دەهێنرێن، بە یاسـا قەدەغە کراون، بەڵام توێژینەوە بـۆ بەرگریکـردن لە چەکـی بـایۆلۆجی و گـرتنەبەری ڕێکارەکـان دژی چەکە بایۆلۆجییەکـان ڕێپێـدراون. هـیچ وڵاتێـک بە ئاشـکرا باسـی بەرنـامەی پەرەپێـدانی چەکە بایۆلۆجییەکـانی ناکـات. تەنـانەت نـاوی دەزگـــای تـــوێژینەوە و پەرەپێـــدان و ئامـــادەکردنی چەکە بایۆلۆجییەکانیشـیان، بە مەبەسـتی شـاردنەوە و هێشـتنەوەیان بە نهێنی، نابەن و نـاوێکی بێوەییان لێ دەنێن، وەک دەزگـای پاراسـتنی پزیشـکی یـان دەزگـای کیمیـای دەرمانسـازی. ئەگەر وڵاتێـک (A) A بزانێت وڵاتێک (B) کار لەسـەر چ جۆرە چەکێکی بـایۆلۆجی دەکـات،

ئەوا بۆ وڵاتی A ئاسانترە، لە ڕێی بەکارهێنانی دژەتۆکسینێک یان پێکوتەیەکی دیاریکراو دژی ئەو چەکە بایۆلۆجییەی کە B هەیەتی، بەرگری لە خۆی بکات. هەر وڵاتێک بەرنامەی پەرەپێدانی چەکی بایۆلۆجیی هەبێت، هەموو شتێکی ئەم بەرنامەیە بە نهێنی دەهێڵێتەوە، بۆ ئەوەی وڵاتانی تر لە ڕێی هەواڵگرییەوە بە بەرنامەکەی نەزانن.

ئەم لیستەی خوارەوە ئەم هۆکارە بایۆلۆجییانەن کە وڵاتان چەندین لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردوون بۆ ئەوەی وەک چەکی بایۆلۆجی بەکاریان بهێنن:

**ڤایرۆس – Virus**

کلامیدیا سیتاسی – Chlamydia psittaci

ئەیئیدینا ئیجیاپتی – aedena egypti

تای دانگ – Dengue fever

چیکونگونیا – Chikungunya

مایارۆ ڤایرۆس – Mayaro virus

ڤایرۆسی ڕووباری ڕۆس – Ross River virus

هەوکردنی مێشکی ڕەشەوڵاخی ڤەنزویلایی – Venezuelan equine encephalitis

هەوکردنی مێشکی ڕەشەوڵاخی ڕۆژهەڵاتی – Eastern equine encephalitis

هەوکردنی مێشکی ڕەشەوڵاخی ڕۆژئاوایی – Western equine encephalitis

هەوکردنی مێشک کە لە ڕێی گەنەوە دەگوازرێتەوە – Tick-borne encephalitis

نەخۆشی جەنگەڵی کیاسانور – Kyasanur Forest disease

تای ڕیفت ڤالی – Rift Valley fever

هەوکردنی وێڵداشی لیمفەیی – Lymphocytic choriomeningitis

جـونين (تـای خوێنبەربـوونی ئەرجەنتینـی) هـانتین – Junin.
(Argentine hemorrhagic fever) Hanteen
تای لاسا – Lassa fever
سیندبیس – Sindbis
ماربورگ – Marburg
ئیبۆلا – Ebola
ڤاریۆلا (ئاوڵە) – Variola

**بەکتریا – Bacteria**
ڤابریۆ کۆما – Vibrio comma
سالمۆنیلا تایفۆس – salmonella typhosa
شیگیلا – Shigella
فرانسیسلا تولارینسیس – Francisella tularensis
جۆرەکانی بروسیلا – Brucella species
کلۆستریدیۆم تیتانی – Clostridium tetani
کلۆستریدیۆم پێرفرینگنز – Clostridium perfringens
پاستورێلا پێستیس – Pasteurella pestis
باسیلەس ئەنثراسیس – Bacillus anthracis
ئاکینتۆباسیلەس مەلەی – actinobacillus mallei
**ریکێتسیا – Rickettsia**
ریکێتسیا پرۆوازەکی – rickettsia prowazekii
ریکێتسیا تسوتسو گاموشی – rickettsia tsutsugamushi
کۆکسیلا بونیتی (تای کیو) – Coxiella burnettii (Q fever)
ریکێتسیا ریکێتسی – rickettsia rickettsii
**کەڕوو – Fungus**
پوچینیا گرامینیس – Puccinia graminis
پایریکیولاریا ئۆریزەی – pyricularia oryzae

**هەندێک لەو هۆکارە بایۆلۆجییانەی کە ئاژەڵەماڵییەکان دەکەنە ئامانج و تووشی نەخۆشییان دەکەن:**

*Western equine encephalitis*

*Western equine encephalitis* ڤایرۆسێکە، دەبێتە هۆی هەوکردنی پارەنکیمای مێشک و بە هۆی مێشوولەی Culex tarsalisـەوە بڵاو دەبێتەوە.

*acetobacter pasteurianus Ab3*

*acetobacter pasteurianus Ab3* بەکتریایەکی مشەخۆرە و لە ناو لەشی ئاژەڵە کاوێژکەرەکاندا دەژی و مەترسییەکی ئەوپەڕی گەورە لەسەر بەخێوکردنی ڕەشەوڵاخ دروست دەکات.

*mycoplasma mycoides*

*mycoplasma mycoides* زیندەوردبینێکی مشەخۆرە، زۆر جۆری هەیە، دوانیان کە بریتین لە: *mycoplasma mycoides* کە لە ناو لەشی ڕەشەوڵاخدا دەژی و *mycoplasmas capri* لە ناو لەشی ئاژەڵە کاوێژکەرە بچووکەکانی وەک بزندا دەژی.

*rickettsia ruminantium*

*rickettsia ruminantium* جۆرێکە لە بەکتریای مشەخۆر و بە هۆی گەنەوە لە ناو ئاژەڵە کێوی و ماڵییەکاندا بڵاو دەبێتەوە و ڕەشەوڵاخ و مەڕ و بزن و ئاسک و گامێش و تووشی نەخۆشی دەکات.

*Trypamosoma vivax*

*Trypamosoma vivax* مشەخۆرێکە ڕەشەوڵاخ و بزنەکێوی تووشی نەخۆشیی دەردەخەو (nagana) دەکات و لە ڕۆژئاوای ئەفریقا هەیە و لە ئەمەریکای باشووریش بڵاو بووەتەوە.

**هەندێک لەو هۆکارە بایۆلۆجییانەی کە ڕووەکە دانەوێڵەییەکان دەکەنە ئامانج و تووشی نەخۆشییان دەکەن:**

*Claviceps purpurea*
*Colletotrichum coffeanum var. Virulans*
*Dothistroma Pini*
*Erwinia amylovora*
*Erwinia carotovora*
*Ralstonia solanacearum*
*peronospora hyoscyami* de Bary f. sp. *Tabacina* (Adam) skalicky
*Puccinia graminis*
*Puccinia striiformiis (puccinia glumarum)*
*Pyricularia oryzae*
*Sclerotinia sclerotiorum*
Sugarcane Fiji disease virus
*Tilletia indica*
*Ustilago maydis*
*Xanthomonas albilineans*
*Xanthomonas campestris* pv. *Citri*
*Xanthomonas campestris* pv. *Oryaze*[1]

**دابەشکردنی هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی بەسەر سێ گرووپدا**

سەنتەرەکانی کۆنترۆڵکردن و پاراستن لە نەخۆشییەکان (CDC) لە ئەمەریکا، هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی یان بایۆتیرۆریزمیان بەگوێرەی ئەو هەڕەشانەی دروستی دەکەن، بەسەر سێ گرووپدا دابەش کردووە کە بریتین لە گرووپەکانی A و B و C. دابەشکردنەکەش لەسەر ئەم بنچینانەی خوارەوەیە:

* توانای بڵاوکردنەوەی هۆکارە بایۆلۆجییەکە.
* ڕێژەی مردن بە هۆکارە بایۆلۆجییەکە.

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, pp. 29–30

* ئەو ڕێکارانەی پێویستن بۆ ئامادەباشیی تەندروستیی گشتی.
* توانای نانەوەی ترس و تۆقاندن لە ناو کۆمەڵگەدا.

**هۆکارەکانی/ نەخۆشییەکانی گرووپی A**

ئەم ڕەوشتانەیان هەیە:

* دەتوانرێت بە ئاسانی بڵاو بکرێنەوە یان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بگوازرێنەوە.

* ڕێژەی مردنێکی زۆریان لێ دەکەوێتەوە و کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر تەندروستیی گشتی دەبێت.

* دەشێت ببنە هۆی ترس و تۆقانێکی زۆر و پشێویی کۆمەڵایەتییان لێ بکەوێتەوە.

* پێویستیان بە ڕێکاری تایبەت هەیە، بۆ ئامادەباشیی پاراستنی تەندروستیی گشتی.

**هۆکارەکانی/ نەخۆشییەکانی گرووپی B**

ئەم ڕەوشتانەیان هەیە:

* تا ڕادەیەکی مامناوەندی ئاسانن بۆ بڵاوکردنەوە.

* توانای نەخۆشخستنیان مامناوەندییە و ڕێژەیەکی کەمی مردنیان لێ دەکەوێتەوە.

* پێویستیان بە توانایەکی تایبەتی بەهێزی دەستنیشانکردن هەیە، لە سەنتەرەکانی کۆنترۆڵکردن و پاراستن لە نەخۆشییەکانی ئەمەریکا (CDC).

* پێویستیان بە چاودێریکردن هەیە.

**هۆکارەکانی/ نەخۆشییەکانی گرووپی C**

* ئەو هۆکارە نەخۆشخەرانەن کە سەرهەڵدەدەن و بە هۆی ئاسانیی دەستکەوتنیان، دەکرێت لە ئاییندەدا، بە ڕێگەی ئەندازیاریی

بۆمـاوەزانی، وایـان لـێ بکرێـت کە بە شـێوەیەکی بەرفـراوان بـڵاو بکرێنەوە.

* بە ئاسانی بەرهەم دەهێنرێن و بڵاو دەکرێنەوە.

* ئەگەری ئەوە هەیە کە ڕێژەیەکی زۆر نەخۆشی و مردنیان لێ بکەوێتەوە.

* کاریگەریی گەورەی تەندروستییان هەبێت.[1]

هۆکارەکـانی نەخۆشـییەکانی گرووپەکـانی A و B و C و ئەو نەخۆشـییانەی لێیـان دەکەونەوە، لەم خشـتەیەی خـوارەوەدا، خشـتەی ژمارە (٢-٢)، ڕێک خراون.

خشـتەی (٢-٢): هۆکارەکانی نەخۆشییەکانی گرووپەکانی A و B و C و ئەو نەخۆشییانەی لێیان دەکەونەوە.

| جـۆری گرووپ | نەخۆشییەکان | هۆکارەکانی نەخۆشییەکان |
|---|---|---|
| A | پیسەکوان – Anthrax | *Bacillus anthracis* |
| | بۆتیولیزم – Botulism | *Clostridium botulinum toxin* |
| | تاعوون – Plague | *Yersinia pestis* |
| | ئاوڵە – Smallpox | *Variola major* |
| | کەروێشـکەتا – Tularemia | *Francisella tularensis* |
| | تایەکـانی خوێنبەربـوونی ڤایرۆسـی – Viral Hemorrhagic Fevers | *Filoviruses and Arenaviruses* |
| | تایماڵتا – Brucillosis | *Brucella spp.* |
| | تۆکیسـنی ئیپسـیلۆن – Epsilon toxin | *Clostridium perfringens* |

[1] Cenciarelli, O., and co–workers, Bioweapons and Bioterrorism: A Review of History and Biological Agents, Defence S&T Tech. Bull., 6(2): 111–129, 2013.

| | | |
|---|---|---|
| *Salmonella spp., E. coli O157:H7, Shigella* | هەڕەشەکانی سەر سەلامەتیی خۆراک – Food safety threats | B |
| *Burkholderia mallei* | Glanders – مقاو | |
| *Burkholderia pseumallei* | Melioidosis | |
| *Chlamydia psittaci* | نەخۆشییەکی تووتییە – Psittacosis | |
| *Coxiella burnetti* | Q fever – تای کیو | |
| *Ricinus communis* | تۆکسینی رایسین – Ricin toxin | |
| *Staphylococcus spp.* | ریخۆڵە تۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی – Staphylococcal enterotoxin B | |
| *Rickettsia proazekii* | Typhus fever – گرانەتا | |
| *Alphaviruses* | هەوکردنی ڤایرۆسیی مێشک – Viral encephalitis | |
| *Vibrio cholera, Cryptosporidium parvum* | Water safety threats | |
| *Niphavrus and Hantavirus* | نەخۆشییە درمییە دەرکەوتووەکان – Emerging infectious diseases | C |

ئەم خشتەیەی سەرەوە، لە هەمان سەرچاوەی پێشوو وەرگیراوە.[1]

[1] Cenciarelli, O., and co–workers, Bioweapons and Bioterrorism: A Review of History and Biological Agents, Defence S&T Tech. Bull., 6(2): 111–129, 2013.

## هۆکارەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان

هۆکارەکـانی چەکە بایۆلۆجییەکـان ژمـارە و جۆرەکانیـان زۆرن و ئەستەمە بتوانرێت هەموو جۆرەکانیان لێرەدا باس بکرێن، لەبەر ئەوە، لە بەشـــەکانی داهـــاتووی ئەم کتێـــبەدا ژمـــارەیەک لە هۆکـــارە بایۆلۆجییەکـان، کە کـراون بە چەکـی بـایۆلۆجی و دابەش کـراون بـۆ چەکە بـایۆلۆجییە بەکتریاییەکـان و ڤایرۆسـییەکان و کەڕوویيەکـان و تۆکسینییەکان، باس دەکەین.

## پیسەکوان – Anthrax

نەخۆشـیی پیسـەکوان نەخۆشـییەکە هەرەشـە لە ژیـانی مـرۆڤ دەکات و بە هۆی بەکتریاییەکەوە کە پێی دەڵێن Bacillus anthracis، تووشی مرۆڤ دەبێت (بۆ وشـەی anthrax، مـن "پیسـەکوان"م بەکار هێنـاوە، ئەو فەرهەنگـانەی کە بە ئینگلیـزی–کـوردی هەن، لەسـەر وشەیەک ڕێک نەکەوتوون کە بە کوردی بۆ anthraxی دابنێن، هەر فەرهەنـگە و چەنـد وشـەیەکی بەرامـبەر دانـاوە، وەک وشـەکانی: دوومەڵ، پیسەکوان، ئەنسراکس، موو، شێرپەنجە، کوانەپیسە، تیراوێ، هەوەپیسـە، ڕەشـەبرین، کەوگیـرە). ئەم نەخۆشـییە بە شـێوەیەکی ئاسایی تووشی ئاژەڵ دەبێت، بە تایبەتی ئـاژەڵە کاوێژکەرەکانی وەک بـزن و ڕەشـەوڵاخ و مەڕ و ئەسـپ. ئەم نەخۆشـییە لە ڕێـی ئـاژەڵی تووشبوو یان بەرهەمەکانیان بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە. لەم سـاڵانەی دواییدا گرنگییەکی زۆر بە پیسەکوان درا، دوای ئەوەی ڕوون بووەوە کە دەشـێت ئەم نەخۆشـییە بە هـۆی هێرشـی زیندەتیرۆریسـتی (bioterrorist attack) یـان بە هـۆی جەنگـی بـایۆلۆجییەوە بـڵاو بکرێتەوە.[1]

## مێژووی پیسەکوان

* یەکەم ڕاپۆرتی تۆمـارکراوی پیسـەکوان، لە سـەردەمی پێنجەم تاعوونی میسریدا بووە لە ساڵی ١٥٠٠ی پێش زایینی کە بووەتە هـۆی مردنی ژمارەیەکی زۆری ئاژەڵ.

---

[1] https://www.medicinenet.com/anthrax/article.htm#what_causes_anthrax

* دەشێت شەشەم تاعوونی میسری کە بە "تاعوونی زیپکەکان" ناسراوە، یەکەم حاڵەتی تۆمارکراوی پیسەکوانی پێست بووبێت و ژمارەیەکی زۆر مردنی لێ کەوتبێتەوە.

* لە ماوەی ساڵانی ١٦٠٠ـەکاندا، نەخۆشیی "Black Bane" زیاتر لە ٦٠٠٠٠ ڕەشەوڵاخی کوشتووە کە نیشانەکانی پیسەکوانیان لێ دەرکەوتووە. نەخۆشیی "Black Bane" جۆرێک بووە لە نەخۆشیی پیسەکوانی سی.

* ساڵی ١٨٦٣، زیندەوەرزانی فەرەنسی، کازیمیر جۆزیف داڤاین، دەری خست کە بەکتریای باسیلەس ئەنتراسیس (Bacillus Anthracis)، یەکەم زیندەوەری مایکرۆسکۆپییە کە بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوانە پەیوەندیی بە نەخۆشیی پیسەکوانەوە هەیە.

* ساڵی ١٨٧٦، ڕۆبەرت کوخ بۆ یەکەم جار بەکتریای Bacillus Anthracisی شێوەچیلکەیی، لە ناوەندێکی خاوێنی چاندنی بەکتریاکە جیا کردەوە.

* هەروەها نەخۆشیی پیسەکوان پێی دەوترا، نەخۆشیی جیاکەرەوانی خوری، نەخۆشیی برادفۆرد (Bradford disease)، نەخۆشی پەڕۆکۆکەرەوە.

* ساڵی ١٨٩٧، ڕێساکانی ڕادفۆرد بە شێوەی یاسا، لە لایەن دەستەی لێکۆڵینەوە لە پیسەکوان دەرچوو.

* ساڵی ١٩١٩، یاسای خۆپاراستن لە پیسەکوان لە ئینگلتەرا دەرچوو، لە لیڤەرپووڵ کۆمەڵە خانوویەکی پاکژکردنەوەی خورییان دروست کرد.

* ساڵی ١٩٤٥ پەتای پیسەکوان لە ناو ئاژەڵانی ئێران (مەڕ) بڵاو بووەوە و یەک ملیۆن سەر مەڕی لەناو برد.

* لە ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٥دا، پەتای پیسەکوانی پێست لە زیمبابۆی بڵاو بووەوە و ١٠٠٠٠ حاڵەتی تووشبوونی مرۆڤ تۆمار کرا، لەوانە،

١٨٢ کەسیان مردن. نەخۆشییەکە بە هۆی مێش و مەگەز و گۆشتی پیسبوو بە بەکتریای پیسەکوانەوە بڵاو بووبووەوە.

لەسەر ئاستی جیهان، ساڵانە لە نێوان ٢٠٠٠ بۆ ٢٠٠٠٠ حاڵەتی تووشبوون بە پیسەکوان ڕوو دەدات.[1]

## پیسەکوان وەک چەکێکی بایۆلۆجی

لە ڕابوردوودا، پیسەکوان وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار هێنراوە.

* یەکەم ڕووداوی نوێی بەکارهێنانی پیسەکوان، لە لایەن یاخیبووە باکوورییەکانەوە (Nordic) بووە. یاخیبووە باکوورییەکان کە بەکتریای پیسەکوانیان لە لایەن ئەرکانی گشتیی سوپای ئەڵمانییەوە پێ درابوو، لە ساڵی ١٩١٦ دژی سوپای ئیمپراتۆری ڕووسیا لە فینلەندا بەکاریان هێنا.

* پیسەکوان، کە بۆ یەکەم جار وەک چەکێکی بایۆلۆجی تاقی کرابێتەوە، لە لایەن یەکەی ٧٣١ی سەر بە سوپای کوانتونگی ژاپۆنی لە مەنشووریا بوو لە ساڵانی ١٩٣٠یەکاندا. هەندێک لە تاقیکردنەوەکانی پیسەکوان بە مەبەست لەسەر دیلەکانی جەنگ کراون کە هەزارانیان لێ مردووە. ئەو کاتە پیسەکوان بە هۆکاری ئێن (agent N) ناو براوە. هەروەها لە ساڵانی ١٩٤٠یش، هاوپەیمانان لێکۆڵینەوەیان لەسەر پیسەکوان کردووە.

* ساڵی ١٩٤٢، تاقیکردنەوەکانی بەریتانیا لەسەر چەکە بایۆلۆجییەکان، بوو بە هۆی ئەوەی دوورگەی گروینارد ( Gruinard Island) لە سکۆتلەندە، بە توندی بە سپۆرەکانی پیسەکوانی جۆری Vollium 14578 پیس ببێت و دوورگەکەش بوو بە ناوچەیەکی قەدەغەکراو، تاکو ساڵی ١٩٩٠ لە سپۆرەکانی پیسەکوان پاک کرایەوە. تاقیکردنەوەکانی دوورگەی گروینارد بریتی بوون لە چەند

---

[1] anthrax as a biological weapon – Columbia University,www.columbia.edu › biology › courses › presentations

تـاقیکردنەوەیەکی چـالاکی (N– bomb). (N– bomb) چەکێکـی بایۆلۆجی بوو کە سپۆرە وشکراوەکانی پیسەکوانی تێدا بوو.

* لە مـاوەی جەنگـی دووەمـی جیهانـدا، لە بەریتانیـا پێنج ملیـۆن کێکـی گـاوگۆل (cattle cake) (کێکـی گـاوگۆل، ئـالیکی ئـاژەڵە کە سپۆرەکانی پیسەکوانی تێ کرابوو) ئامادە کرابوو و لە پۆرتـۆن داون هەڵگیرابـوو بـۆ "ئۆپەراسـیۆنێکی ڕووەکـی" – بـۆ هێرشـگەلێکی دژ بـە گـاوگۆلی ئەڵمانیـا لە لایەن هێـزی ئاسـمانیی شـاهانەوە. پـلانەکە ئەوە بـوو لە سـاڵی ١٩٤٤دا ئەڵمانیـا بە چەکـی بـایۆلۆجیی لە پیسـەکوان دروستکراو بۆردوومـان بکەن. بەڵام کێکەکانی گاوگۆل و بۆمبەکانی چەکی بایۆلۆجی بەکار نەهێنران و لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٥دا کێکەکانی گاوگۆل لە ڕێی سووتاندنیان لەناو بران.

* پـێش سـاڵی ١٩٧٢، کاتێـک ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا پەیماننـامەی قەدەغەکردنـی چەکـی بـایۆلۆجیی واژۆ کردبـوو، چەکـی بـایۆلۆجیی پیسـەکوان بەشـێک بـوو لە چەکـی یەدەکـی عەمبـارکراوی ئەمەریکـا. سـاڵی ١٩٦٩ ڕیچـارد نیکسـۆن، سـەرۆکی ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا، فەرمـانی هەڵوەشـاندنەوەی بەرنامەکـانی چەکە بایۆلۆجییەکانی ئەمەریکای دەرکرد.

* لە سـاڵانی ١٩٧٨–١٩٧٩، حکـومەتی ڕۆدیسـیا، لە مـاوەی هێرشەکانی بۆ سەر یاخیبووەکان، چەکی پیسەکوانی دژی گاوگۆل و مرۆڤ بەکارهێنا.[1]

* لە نیسان و ئایاری ساڵی ١٩٧٩دا، پەتایەکی نائاسایی پیسەکوان لە شـاری سڤێردلۆڤسـک لە یەکێتیـی سـۆڤییەت بـڵاو بـووەوە. بەرپرسـەکانی سـۆڤییەت هـۆی بڵاوبوونەوەکەیـان بـۆ بەکارهێنـانی گۆشـتی پیسـبوو بە پیسـەکوان گەڕانـدەوە. ئاژانسـەکانی ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا هـۆی پەتاکەیـان بـۆ هەڵمژینـی سـپۆرەکانی پیسـەکوانی نـاو هەوا گەڕانـدەوە، کە ئەم سـپۆرانە بە هەڵە لە

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Anthrax

دەزگایەکی وردەگیانەوەرزانی (مایکرۆبایۆلۆجی)ی سەربازی بە ناو هەوادا بڵاو بیوونەوە. زۆربەی قوربانییەکانی ئەم پەتایە ئەو هاووڵاتییانە بوون کە لە نزیک ئەم دەزگایە کاریان دەکرد، یاخود نیشتەجێی نزیکی دەزگاکە بوون. پسپۆڕان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە پرژەکانی هۆکاری نەخۆشیی پیسەکوان لە ناو هەوادا، لە ناو ئەم دەزگایەوە هاتوونەتە دەرەوە و بە هەوای شارەکەدا بڵاو بوونەتەوە. بە لایەنی کەمەوە ٩٤ کەسی ئەم شارە تووشی نەخۆشیی پیسەکوان بوون و لەوانەش ٦٨ کەسیان مردن.[١]

* ساڵی ٢٠٠١، دوای هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر بۆ سەر سەنتەری بازرگانیی جیهانی و پنتاگۆن، چەند نامەیەک کە پڕ کرابوون لە هاڕاوەیەکی سپی و سپۆرەکانی پیسەکوانیان تێدا بوو، لە ڕێگەی پۆستەوە بۆ نووسینگەی دوو سیناتۆر و چەند ئاژانسی ڕاگەیاندن لە کەناری ڕۆژهەڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نێررابوون. دەسەڵاتدارانی ئەمەریکا چوار لەو نامانەیان بە دەست هێنایەوە کە مۆری نووسینگەی پۆستەیان پێوە بوو و بەرواری مۆرەکان دەگەڕایەوە بۆ ١٨ی سێپتەمبەر و ٩ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠١. هاڕاوەکانی ئەم نامانە، ئەو نووسینگانەی پۆست کە نامەکانیان پێدا نێررابوو و ئەو باڵەخانانەی کە نامەکانیان تێدا کرابووەوە، بە سپۆری پیسەکوانیان پیس کردبوو. بە هۆی ئەم نامانەوە، ٢٢ کەس تووشی نەخۆشیی پیسەکوان بوون و لەوانە شەشیان مردن. نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی، لێکۆڵینەوەیەکی ٧ ساڵیی کرد، دەربارەی ئەوەی کێ ئەم نامانەی ناردووە، دوایی بۆیان دەرکەوت کە بەکتریای پیسەکوانەکە لە چ تاقیگەیەکی تایبەتی تویژینەوەوە هاتووە. نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی لە ١٩ی شوباتی ساڵی ٢٠١٠، بە

[1] Meseleson, Matthw, and Co–workers, The Sverdlovsk Anthrax Outbreak of 1979, Science 1994, Volume 266, Pages 1202–1208.

فەرمی کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکە هێنا. دواتر لە بەشێکی سەربەخۆی ئەم کتێبەدا، بە درێژی باسی ئەم کەیسە دەکەین.[1]

بەکتریای پیسەکوان، هۆکارێکی کاریگەرە بۆ ئەنجامدانی هێرشی تیرۆریستیی بایۆلۆجی، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

* بە ئاسانی بەکتریای پیسەکوان لە سروشتدا دەست دەکەوێت.

* دەتوانرێت بەکتریای پیسەکوان لە تاقیگەدا بەرهەم بهێنرێت.

* بەکتریای پیسەکوان دەتوانێت بۆ ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، بەبێ ئەوەی پێویستی بە بارودۆخێکی توندی عەمبارکردن بێت.

* دەتوانرێت بکرێت بە چەکی بایۆلۆجی.

* دەتوانرێت بە ئاسانی بە شێوەی هاڕاوە یان بە شێوەی پرژە بڵاو بکرێتەوە، بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی سەرنجڕاکێشان.

* سپۆرەکانی پیسەکوان وردن و بە وردبین نەبێت نابینرێن، بە هۆی هەستەکانی تامکردن و بۆنکردن نادۆزرێنەوە و بە چاویش نابینرێن.[2]

پیسەکوان نەخۆشییەکە بە هۆی بەکتریای Bacillus anthracis تووشی مرۆڤ و ئاژەڵ دەبێت. بەکتریای بەسیلەس ئەنثراسیس (Bacillus anthracis) بە بەربژێرێکی ئەوپەڕی نموونەیی بۆ دروستکردنی چەکی بایۆلۆجی دادەنرێت. زۆر وڵات بەکتریای پیسەکوان وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار دەهێنن. سپۆرەکانی پیسەکوان دەیان ساڵ لە ناو گڵدا دەمێننەوە بەبێ ئەوەی هیچیان لێ بێت. بەڵگەش بۆ ئەوە، لە ئوسترالیا دوای هەڵکەندنی زەوی بە مەبەستی دروستکردنی خانوو، لەناکاو نەخۆشیی پیسەکوان سەری هەڵدا و بە ناو ئەو کرێکارانەی شوێنەکەیان هەڵدەکەند، بڵاو بووەوە. سەد ساڵ لەوەوپێش، ڕەشەوڵاخ لە هیندستانەوە بۆ گۆشتەکەیان بۆ

[1] a. https://www.cdc.gov/anthrax/resources/history/index.html b. Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018 , pp. 101–110

[2] https://www.healthline.com/health/anthrax#causes

ئوسترالیا هاوردە کرابوون، بەڵام لەبەر ئەوەی نەخۆشیی پیسەکوان لە ناو ڕەشەوڵاخەکاندا بڵاو بووبووەوە، هەندێک لە ڕەشەوڵاخە تووشبووەکان یان مردووەکان، لە هەمان ئەو شوێنەی هەڵدەکەنرا، کاتی خۆی بە ژێر خاکەوە کرابوون. ئەم ڕووداوە ڕوونی دەکاتەوە کە سپۆرەکانی ئەنثراکس دەتوانن زیاتر لە سەد ساڵ لە ناو گڵدا بە زیندوویی بمێننەوە.[1]

## شێوەکانی نەخۆشیی پیسەکوان

سێ شێوەی سەرەکی لە نەخۆشیی پیسەکوان هەیە کە بریتین لە: شێوەکانی پیسەکوانی پێست و سی و کۆئەندامی هەرس. لەو سێ شێوانە، پیسەکوانی پێست لە هەموویان باوترە و ئەمەش کاتێک ڕوو دەدات کە بەکتریاکە لە ڕێی برین یان ڕووشانی پێستەوە دەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە. نەخۆشیی پیسەکوانی کۆئەندامی هەرس، لە ئەنجامی خواردنی گۆشتێکی نەکوڵاو کە بەکتریای Bacillus anthracisی پێوە بێت، تووشی مرۆڤ دەبێت. نەخۆشیی پیسەکوانی سی بە هۆی هەناسەدانەوە لە هەوایەکدا کە بەکتریای پیسەکوانەکە یان سپۆرەکانی تێدا بێت، دەگوازرێتەوە و ئەم جۆرەیان کوشندەیە.

## پیسەکوانی پێست

نزیکەی ٩٥٪ی حاڵەتەکانی تووشبوون بە پیسەکوان، جۆری پیسەکوانی پێستە. سپۆری پیسەکوان لە ڕێی برین یان ڕووشانی پێستەوە، دەچێتە ناو لەشی مرۆڤ و تووشی نەخۆشیی دەکات، ئەمەش کاتێک ڕوو دەدات کە مرۆڤ لە کاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ خوری یان پێست یان پێستی خۆشکراو یاخود مووی ئاژەڵێکی تووشبوو (بە تایبەتی مووی بزن)، دەستی یان هەر شوێنێکی ڕووشاوی پێستی بەر ئەوانە بکەوێت.

[1] https://www.cdc.gov/anthrax/basics/types/index.html

تووشبوون بە پیسەکوانی پێست، بە ئاوسانێکی بەخوروو لە سەر پێست دەست پێ دەکات کە لە گەستنی مێش و مەگەز دەچێت و لە ماوەی ڕۆژێک یان دوو ڕۆژدا دەبێت بە بلۆق. بلۆقەکە دەبێت بە برینێکی بێئازار و لە ناوەڕاستی برینەکەدا چاڵێکی ڕەش (مردوو) دروست دەبێت. دەشێت ڕژێنە لیمفییەکانی نزیک برینەکە تووشی ئاوسان ببن.

نزیکەی ٢٠٪ی حاڵەتە چارەسەرنەکراوەکانی پیسەکوانی پێست دەبنە هۆی مردن. مردن بەم جۆرە پیسەکوانەیە دەگمەنە ئەگەر تووشبووەکە چارەسەری گونجاو وەربگرێت.

**پیسەکوانی سی**

پیسەکوانی سی، بە هۆی هەڵمژینی ئەو هەوایەی بەکتریای Bacillus anthracis یان سپۆرەکانی تێدایە، تووشی مرۆڤ دەبێت. بە زۆری بە هۆی هەڵمژینی سپۆرەکانی بەرهەمەکانی ئاژەڵی تووشبوو، تووشی مرۆڤ دەبێت. دەشێت پیسەکوانی سی تووشی مرۆڤ بێت، کاتێک بەکتریا یان سپۆرەکانی پیسەکوان وەک چەکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێن. بە گشتی ئەم جۆرە پیسەکوانە کوشندەیە. ئەوانەی تووشی پیسەکوانی سی دەبن، لە ماوەی هەفتەیەکدا نیشانەکانیان لێ دەردەکەوێت. دەشێت نیشانەکان بە خێرایی دوای ٢ ڕۆژ لە تووشبوون دەربکەون، یان بگاتە ٤٥ ڕۆژ دوای تووشبوون ئینجا دەربکەون. نیشانەکانیش ئەوانەن:

- نیشانەکانی وەک نیشانەکانی تووشبوونی هەڵامەتن
- برینی قورگ
- تالێهاتن
- ئازاری ماسوولکەکان
- کۆکە
- تەنگەنەفەسی

- ماندویتی
- هەڵەرزین
- ڕشانەوە

**پیسەکوانی گەدە و ڕیخۆڵە**

نەخۆشیی پیسەکوانی گەدە و ڕیخۆڵە کاتێک ڕوو دەدات کە مرۆڤ گۆشتی پیسبوو بە بەکتریای پیسەکوان یان سپۆرەکانی بەکار بهێنێت. ئەم جۆرە پیسەکوانە بەوە دەناسرێتەوە کە هەوکردنێکی توندی ڕیخۆڵەی لەگەڵدا دەبێت. نیشانەی تووشبوون بەم نەخۆشییە ئەمانەن:

- دڵتێکەڵهاتن
- نەمانی ئیشتیهای خواردن
- سکچوونی خوێناوی
- تالێهاتن
- ئازارێکی زۆری گەدە
- خوێنهێنانەوە بە ڕشانەوەوە

پیسەکوانی گەدە و ڕیخۆڵە دەبێتە هۆی مردنی ٢٥٪ بۆ ٦٠٪ی تووشبوانی.[١]

مرۆڤ لە ڕێی ئەوانەی خوارەوە، تووشی نەخۆشیی پیسەکوان دەبێت:

١- ئەگەر بەرکەوتنی لەگەڵ ئاژەڵی ماڵی یان ئاژەڵی کێویی گیاخۆری تووشبوو هەبێت.

٢- ئەگەر بەرکەوتنی لەگەڵ بەرهەمەکانی ئاژەڵی تووشبوو هەبێت، وەک خوری یان پێست.

٣- هەڵمژینی سپۆرەکانی پیسەکوان لە کاتی بەکارهێنانی بەرهەمەکانی ئاژەڵی تووشبوو بە (پیسەکوانی سی).

---

[1] http://anthrax.emedtv.com/anthrax/types-of-anthrax.html

٤- خواردنی گۆشتی باشنەکوڵاوی ئاژەڵی تووشبوو بە پیسەکوان.[١]

**چارەسەرکردنی تووشبوانی پیسەکوان**

ئەو دژەزیندانەی بۆ چارەسەرکردنی تووشبوانی پیسەکوان بەکار دەهێنرێن، ئەمانەن:

* سیپرۆفلۆکساسین (Ciprofloxacin)
* دۆکسیسایکلین (Doxycyline)
* پەنسیلین (Penicillin)

ئەوەی تووشبووەکە دەکوژێت، بەکتریای پیسەکوان نییە، بەڵکو ئەو تۆکسینەیە کە بەکتریای پیسەکوانەکە دەری دەدات. دەرمانی سیپرۆ (Cipro) دەرمانێکی بەکتریاکوژی باشە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیی پیسەکوان، بەڵام ئەم دەرمانە دەبێت لە قۆناغە سەرەتاییەکانی تووشبوونی نەخۆشییەکەدا بەکار بهێنرێت، چونکە هەر کە سپۆرەکانی پیسەکوان تۆکسینیان دەردا، خواردنی دەرمانی سیپرۆ هیچ کاریگەرییەکی لەسەر نەخۆشییەکە نابێت. لە جەنگی کەنداودا، سەربازەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، پێش ئەوەی بچنە مەیدانی جەنگەوە، بۆ ئەوەی لە نەخۆشیی پیسەکوان پارێزراو بن، بە پێکوتەی نەخۆشیی پیسەکوان کوترابوون.




وێنەی (٣-١): پێکهاتی کیمیایی دەرمانی سیپرۆ (Cipro) کە بەکتریاکوژێکە بۆ چارەسەری نەخۆشیی پیسەکوان بەکار دەهێنرێت.

[1] https://www.healthline.com/health/anthrax#causes

دەشێت هەندێک تیرەی بەکتریای پیسەکوان بەرهەم هێنرابن و لە ڕێی ئەندازەی بۆماوەزانییەوە گۆڕانکارییان تێدا کرابێت و وایان لێ کرابێت بەرهەڵستییان بۆ دژەزیندە (antibiotic) جۆراوجۆرەکان هەبێت. لەبەر ئەوە، شیکردنەوەی تاقیگەیی پێویستە بۆ دەستنیشانکردنی جۆری تیرەی بەکتریاکە و جۆری ئەو دژەزیندەیەی کە زۆر کاریگەرە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیی پیسەکوانەکە.

**تیرەکانی بەکتریای پیسەکوان**

چەند جۆرێک لە بەکتریای پیسەکوان هەن کە پێیان دەڵێن تیرە (strain)، بەڵام تەنها سێ تیرەیان بە باشی لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە. ئەم سێ تیرانەش بریتین لە:

١- تیرەی ئامیس (Ames strain)

٢- تیرەی ڤۆلوم (Vollum strain)

٣- تیرەی ستیرن (Sterne strain)

تیرەی ئامیس، سەد ساڵ لەوەوپێش، لە شاری Ames لە ویلایەتی Iowa لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا جیا کراوەتەوە و بەسەر چەندین تاقیگەی ویلایەتە یەکگرتووەکان و تاقیگەکانی تری جیهاندا دابەش کراوە. لەو سەردەمەدا هیچ یاسایەک بۆ کۆنترۆڵکردنی گواستنەوەی بەکتریا بوونی نەبووە و زۆر لە زانایان لە سەرتاسەری جیهاندا ئەم تیرەیەیان هەبووە.

تیرەی ڤالوم (Vollum) لە بنچینەدا لە دوورگەی گروینارد (Gruinard) لە ئینگلتەرا لە ساڵی ١٩٣٥دا جیا کراوەتەوە و پەرەی پێ دراوە. شانشینی یەکگرتوو و عێراق ئەم تیرەیەیان بۆ دروستکردنی چەکی بایۆلۆجی بەکار هێناوە. عێراق ئەم تیرەیەی لە کۆمپانیایەکی ئەمەریکی بە ناوی American Type Culture Collection کڕیوە و بۆ دروستکردنی چەکە بایۆلۆجییەکانی بەکاری هێناوە.

تیرەی ستێرن (Sterne) لە لایەن ماکس ستێرن (Max Sterne) لە ئەفریقای باشوور پەرەی پێ دراوە. ئەم تیرەیەیان بۆ مرۆڤ ژەهر نییە. هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم جۆرە تیرەیەی ستێرن هیچ بەرگێک یان قاوغێکی پاراستنی نییە و کاتێک دەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە، خانە بەکتریاخۆرە گەورەکان تێکی دەشکێنن. تیرەی ستێرن جگە لەوەی بەرگ یان قاوغی پاراستنی نییە، هەموو پێکهێنەکانی تیرەکانی تری تێدایە، لەبەر ئەوە، بۆ پێکوتە (vaccine) بەکار دەهێنرێت. وەک باس کرا، بەکتریای پیسەکوان لە ناو لەشی تووشبوودا تۆکسینێک دەردەدات، ئەم تۆکسینە دەبێتە هۆی نەخۆشییەکە و مردنی نەخۆشەکە.

### میکانیزمی کارکردنی تۆکسینی بەکتریای پیسەکوان لە ناو خانەی مرۆڤ و ئاژەڵدا

تۆکسینی بەکتریای پیسەکوان لە سێ پرۆتین پێک هاتووە کە بریتین لە:

١- پرۆتینی هۆکارەئاوبەند (Edema factor (EF

٢- پرۆتینی دژەپێکهێنپارێز (ئەنتیجن پارێز) (Protective antigen (PA

٣- پرۆتینی هۆکارە کوشندە (Lethal factor (LF

بۆ ئەوەی تۆکسینەکە بچێتە ناو خانەوە، پرۆتینی PA بە وەرگری دیواری خانەوە دەنووسێت و جۆگەیەک لە ناو دیواری خانەکەدا دروست دەکات، بۆ ئەوەی پرۆتینی EFی پێدا بچێتە ناو خانەکەوە. پرۆتینی EF لە ماوەیەکی کورتدا، لە ناو خانەکەدا، بڕێکی زۆر لە مادەی ئەدینۆسیی یەکە فۆسفاتی ئەڵقەیی (Cyclic AMP – cyclic adenosine monophosphate) دروست دەکات. ئەدینۆسیی یەکە فۆسفاتی ئەڵقەیی (Cyclic AMP) ڕۆڵێکی گرنگ لە کۆنترۆڵکردنی کردارە بایۆلۆجییەکانی ناو خانەدا دەگێڕێت. ئەدینۆسیی یەکە

فۆسـفاتی ئەڵقەیـی دەبێـتە هـۆی سـکچوونێکی زۆر و لە کۆتاییـدا تووشبووەکە دەکوژێت. پرۆتینی LF لە ڕێی پرۆتینی PAـەوە دەچێتە نـاو خـانەوە و کـاری ئەنزیمـی هەڵوەشـاندنەوەی پـرۆتین دەکـات. پرۆتینی LF لە ناو خـانەدا، ئەنزیمی ( mitogen–activated protein kinase) هەڵدەوەشـێنێتەوە کە ئەنزمێکی بنچینەییە بۆ ژیـانی خـانە و لە ئەنجامدا کوشتنی خانەکان و لە کۆتاییدا مردنی تووشبووەکەی لـێ دەکەوێتەوە. بێگومان ئەم میکانیزمەی کارکردنی تۆکسـینی بەکتریـای پیسەکوان، لە ناو خانەی ئاژەڵانیشدا ڕاستە کە مردنی ئـاژەڵەکەی لـێ دەکەوێتەوە.[١]

[1] a. Croddy, E. , Perez–Armendariz, Clarisa and John, Hart, Chemical and Biological Warfare, A Comprehensive Survey for concerned Citizen, Springer Science+ Business Media New York, New York, 2002, p.67.
b. Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018 , pp. 33–35

### تاعوون – Plague

تاعوون کە بە ڕەشەمەرگ (black death)یش ناسراوە، یەکێکە لە کوشندەترین نەخۆشییەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لە کوشندەییدا، دوای نەخۆشیی ئاوڵە، بە پلەی دووەم دێت. ئەو بەکتریایەی دەبێتە هۆی تووشبوون بە تاعوون، بە شێوەیەکی سەرەکی لە کرتێنەرەکان و ئەو کێچانەی لەگەڵیاندا هەن هەیە و کاتێک ئەمانە لە نزیک مرۆڤ دەبن و بەر مرۆڤ دەکەون، نەخۆشییەکە بۆ مرۆڤ دەگوازنەوە. بڵاوبوونەوەکانی تاعوون بە خراپترین پەتا لە مێژوودا ناوبانگیان دەرکردووە، ئەمەش ئەو ترسەی دروست کردووە کە تاعوون وەک چەکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێت.

لەم ڕۆژگارەدا، حاڵەتەکانی تووشبوون بە تاعوون، بە شێوەیەکی پچڕپچڕ لە سەرانسەری جیهاندا هەن، بەڵام وەک جاران کوشندە نەماون، بە هۆی چارەسەرکردنی بەو دژەزیندانەی (antibiotic) کە بەردەستن و دەست دەکەون.[1]

### کورتەمێژوویەکی تاعوون بەگوێرەی سەردەمەکان

* لە ماوەی نزیکەی سالانی ٣٥٠٠–٣٠٠٠ی پێش زایین، کە دەکاتە سەردەمی چەرخی بەردینی نوێ لە ڕۆژئاوای ئاسیا و ئەورووپا، ژمارەی دانیشتوان بە ڕێژەیەکی بەرچاو کەم بووەتەوە؛ وەک دەردەکەوێت، دەشێت بە هۆی پەتای تاعوونەوە بووبێت. ساڵی ٢٠١٨، گۆڕێکی سویدی هەڵدرایەوە، لەم گۆڕەدا بەڵگەی هەبوونی

[1]https://www.nationalgeographic.com/science/health-and-human-body/human-diseases/the-plague/

بەکتریای یارسینیا پیستیس لە ناو پاشماوەکانی مرۆڤێکی نێژراو لەم گۆڕەدا دۆزرایەوە. مێژووی خەملێنراوی مردنی ئەم مرۆڤە گەڕێنرایەوە بۆ سەردەمێکی مێژووی ئەورووپایی کە کۆتایی سەردەمی چەرخی بەردینی نوێیە؛ هەبوونی تاعوون لەو پاشماوانەدا بەڵگەی ئەوەیە دەشێت تاعوون هۆی مردنی ئەم مرۆڤە بووبێت.

* لە ماوەی نزیکەی سالانی ٥٤١–٧٥٠ی زایینی، یەکەم شەپۆلی پەتای تاعوون لە میسرەوە بۆ دەریای سپیی ناوەڕاست (دەسپێکی بلاوبوونەوەکەی لەگەڵ بلاوبوونەوەی تاعوونی جوستینیانی یەکەم بووە، جوستینیانی یەکەم ئیمپراتۆرێکی ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی بووە) و باکووری ڕۆژئاوای ئەورووپا بلاو بووەتەوە.

* لە ماوەی سالانی ١٣٤٦–١٨٤٠ی زایینی، دووەم شەپۆلی پەتای تاعوون لە چینەوە (ئەوەیان مشتومڕی لەسەرە) بۆ دەریای سپیی ناوەڕاست و ئەورووپا بلاو بووەتەوە. تاعوونی سالانی ١٣٤٦–١٣٥٣ی زایینی وا دادەنرێت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وێنەی نەبووبێت. تاعوون لە ساڵی ١٣٤٦ تاکو ساڵی ١٣٥٣، نزیکەی ٧٥ ملیۆن بۆ ٢٠٠ ملیۆن کەسی لە ئۆراسیا (ئەورووپا و ئاسیا) کوشتووە.

* لە ماوەی سالانی ١٨٦٦– ١٩٦٠ی زایینی، سێیەم شەپۆلی پەتای تاعوون لە چین سەری هەڵداوە و بووەتە هۆی کوشتنی نزیکەی دوو ملیۆن و دووسەد هەزار کەس. ئەم پەتایە بە هیندستاندا بلاو بووەتەوە و سەرجەم، ٢٢,٥ ملیۆن کەسی کوشتووە کە لەژێر فەرمانڕەوایی بەریتانیادا بوون. هافکین (Haffkine) زانایەکی جووی ئۆکرانی بووە و لە هیندستان کاری کردووە، پەرەی بە یەکەم ڤاکسینی دژەتاعوونی خەیارە (Bubonic plague) و کۆلێرا داوە. سالانی ١٩٤٠ـەکان دەرمانەکانی دژەزیندە پەرەیان پێ درا و ڕێژەی مردنیان بە تاعوون بە شێوەیەکی یەکجار زۆر کەم کردەوە.

## کورتەمێژوویەکی تاعوون بەگوێرەی سالانی بلاوبوونەوەی

* ساڵی ٤٣٠ی پێش زایین، پەتای تاعوونی ئەسینا دانیشتوانی شارەکە لەناو دەبات. سەرەتای بڵاوبوونەوەی تاعوونەکە لە ئەسیوپیا بووە، ئینجا لە ڕێی میسر و لیبیاوە بە ناوچەی دەریای ناوەڕاستدا بڵاو بووەتەوە.

* ساڵی ٢٢٤ی پێش زایین، بۆ یەکەم جار تاعوون وەک پەتایەک لە چین تۆمار کراوە.

* لە ساڵانی ١٦٥–١٨٠ی زایینیدا، تاعوونی ئەنتۆنین ( Antonine plague)، کە بە تاعوونی گالین (Galen)یش ناسراوە، وەک پەتایەک بڵاو بووەتەوە. گالین پزیشکێکی یۆنانی بووە، لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی ژیاوە و باسی تاعوونی کردووە. هەروەها گومان لەوە کراوە کە تاعوونەکە ئاوڵە یان سووریژە بووبێت. سەرجەم مردوان بە تاعوونەکە بە پێنج ملیۆن کەس مەزەندە کراوە. ئەم نەخۆشییە لە هەندێک ناوچە سێیەکی دانیشتوانەکەی کوشتووە و سوپای ڕۆمانیی لەناو بردووە.

* لە ساڵانی ٢٥٠–٢٧٠ی زایینیدا، پەتای تاعوونی قوبرسی لە ڕۆما بڵاو بووەتەوە. مەزەندە دەکرێت کە نزیکەی ٥٠٠٠ کەسی لە ڕۆژێکدا کوشتبێت.

* ساڵی ٥٤٠ی زایینی، پەتای تاعوون لە ئەسیوپیا سەرهەڵدەدات و بە شاری تەل ئەلفەراما (Tel- el-farama)ی میسردا بڵاو دەبێتەوە. تەل ئەلفەراما دەکەوێتە ٣٠ کیلۆمەتری باشووری ڕۆژهەڵاتی بەندەری بورسعید.

* لە ساڵانی ٥٤١–٥٤٢ی زایینیدا، تاعوونی جوستینیان بە یەکەم پەتای تۆمارکراو دادەنرێت کە بە کەناراوەکانی دەریای ناوەڕاستدا بڵاو بووەتەوە. بەپێی هەندێک مێژوو، ئەم نەخۆشییە لە دوو ساڵی دواتردا، چەندین جار سەری هەڵداوەتەوە، مەزەندە دەکرێت لە

کۆتاییدا ٢٥ ملیۆن کەسی کوشتبێت، بەڵام لەم دواییەدا، ئەم ژمارەیە جێگەی مشتومڕ بووە.

* ساڵی ٥٤٢ی زایینی، پەتای تاعوون دەگاتە قوستەنتینییە (ئەستەمبوڵی ئێستا). لە بەهاری ئەو ساڵەدا، ڕۆژانە نزیکەی ٥٠٠٠ کەس بەم پەتایە مردوون، هەرچەند هەندێک مێژوونووس بە ١٠٠٠٠ مردووی مەزەندە دەکەن. ئەم پەتایە بەردەوام دەبێت و سێیەکی دانیشتوانی ئەم شارە دەکوژێت.

* ساڵی ٦٢٧ی زایینی، پەتایەکی گەورەی تاعوون لە تیسفۆن (سەلمان پاکی ئێستا) پایتەختی ساسانییەکان بڵاو بووەتەوە و زیاتر لە ١٠٠٠٠٠ کەسی کوشتووە.[1]

بەگوێرەی کتێبی (الاسلحة الکیمیائیة و الجرثومیة)[2]، نەخۆشیی تاعوون لە ساڵی ١٣٣٦ لە چین دەرکەوتووە و لە ماوەی ١٧ ساڵدا، وڵات بە وڵات بە هەموو جیهاندا بڵاو بووەتەوە. لە چینەوە گوازراوەتەوە بۆ هیندستان و لە هیندستانەوە بۆ ئێران و لە ئێرانەوە بۆ تورکیا (قوستەنتینییە) و لە تورکیاوە بۆ مەرسیلیا لە فەڕەنسا. لە ماوەی ٦ ساڵدا، بە فەڕەنسا و ئەڵمانیا و ئینگلتەرا و هەموو ئەورووپادا بڵاو بووەتەوە. لە مەرسیلیا لە ساڵی ١٧٢٠، ٤٠٠٠٠ کەسی کوشتووە، لە مۆسکۆ لە ساڵانی ١٧٧٠–١٧٧١، ٨٠٠٠٠ کەس، لە قوستەنتینییە لە ساڵی ١٨٠٣، ١٥٠٠٠٠ کەس، لە مەنشووریا لە چین لە ساڵی ١٩١٠، ٤٢٠٠٠ کەس، لە مەراکیش لە ساڵی ١٩١١، ١٥٠٠٠ کەس.

هەروەها کاتێک باسی چەکی بایۆلۆجی دەکەین، یەکەم شت کە بە خەیاڵدا بێت، ئەوەیە، ئەم تاعوونە بکرێت بە چەکی بایۆلۆجی.

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Timeline_of_plague

[2] محمود، معین احمد، الاسلحة الکیمیائیة و الجرثومیة، دار العلم للملایین، بیروت – لبنان، ١٩٨٢، ص ١٢٧.

دوایین ڕووداوی بڵاوبوونەوەی پەتای تاعوون لە ١٩٩٤ لە شاری (سـورات) لە هیندسـتان بـوو، ڕاگەیەنـراوە کە ٦٩٣ کەس تووشـی تـاعوونی خەیـارە و تـاعوونی هەوکردنـی سـییەکان بـوون. ئەوەیـش ترس و هیستریای لە ناو خەڵکی ئەو شارەدا بڵاو کردبووەوە و بوو بە هـۆی ئەوەی هەزاران کەس لەم شـارە هەڵبـێن و شـارەکە بەجـێ بهـێڵن. زۆر لە وڵاتـان گەشـتی هـاتن و چـوونی فڕۆکەوانـی و هاوردەکردنی کەلوپەلیان لە هیندستان قەدەغە کردبوو.[1]

بـۆ سـەدان سـاڵ، هـۆی تووشـبوون بە تـاعوون بە نادیـاری مـابووەوە و ئەفسـانەی پڕوپـووچ و بیمانـای بـۆ هۆنرابـووەوە، بەڵام دوای ئەو پێشـکەوتنانەی لە بـواری وردبینـدا (مایکرۆسـۆپ microscope) بەدی هێنران، هۆی تووشبوون بە تـاعوون دۆزرایەوە. ساڵی ١٨٦٩ی زایینی، ئەلیکساندەر یەرسین ئەو بەکتریایەی دۆزییەوە کە دەبێتە هـۆی تـاعوون و بەکتریـاکەش نـاونرا یەرسـینیا پێسـتیس (Yersinia pestis).[2]

بەکتریـای یەرسـینیا پێسـتیس بەکتریـایەکی ئەوپەڕی درمە و لە شێوەی چیلکەدایە. ئەم بەکتریایە لە ڕێی ئەوەی تۆکسینەکانی دەخاتە نـاو خانەکانی بەرگرییەوە، کۆئەندامی بەرگریی خـانەخوێیەکەی پەک دەخـات. کاتێک ئەو خانـانەی بەرگـری سـەرکوت دەکرێن، بەکتریـای یەرسـینیا پێسـتیس دەتوانێـت بەبـێ هـیچ کۆسـپێک، لە نـاو لەشـی خانەخوێیەکەیدا زۆر ببێت و بڵاو ببێتەوە.

چەنـدین لە شـیردەرە بچووکەکـان دەبـن بە خـانەخوێی ئەم بەکتریایە، لەوانە جرج، مشک، سەگی دەشتەکی، کەروێشک و سمۆرە. بەکتریای یەرسینیا پێستیس لە ماوەی خولێکی زۆربوونیدا، دەتوانێت بە خێراییەکی کەم لە ناو کرتێنەرەکاندا بڵاو ببێتەوە، لەم حاڵەتـەدا، بە

---

[1] عاشـور، مصـطفى، الميكروبـات و الحـرب البيولوجيـة، منشـأة المعـارف، جـلال حـزى و شركاؤه، الاسكندرية و ٢٠٠٥ , ص ٣٣.

[2] https://www.nationalgeographic.com/science/health-and-human-body/human-diseases/the-plague/

زۆری نادۆزرێتەوە، چونکە نابێتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، بەڵام کاتێک ئەم بەکتریایە دەگوازرێتەوە بۆ جۆری تری شیردەری بچووک، لە ماوەی بڵاوبوونەوەی بە ناو ئەم شیردەرە بچووکانەدا، مرۆڤ ڕووبەڕووی مەترسییەکی زۆری تووشبوون بەم بەکتریایە دەبێتەوە.

دەمێکە بڕوا وایە کە مشک گوێزەرەوەی سەرەکیی تاعوونە، چونکە لە ناوچە شارستانییەکاندا لە نزیک مرۆڤەوە ژیاوە. زانایان بۆیان دەرکەوتووە ئەو کێچانەی لەسەر جرج و مشک دەژین، هۆی سەرەکیی تووشبوونی مرۆڤن بە تاعوون.[1]

### تاعوون وەک چەکێکی بایۆلۆجی

تاعوون لە ئێستادا بە مەترسیدارترین هەڕەشەی تیرۆریزمی بایۆلۆجی دادەنرێت. بەکتریای تاعوون (Yersinia pestis)، لە ڕابوردوودا، لە لایەن چەند وڵاتێکەوە کراوە بە چەکێکی ئەیرۆسۆڵ (an aerosol weapon) (مەبەست لە چەکی ئەیرۆسۆڵ ئەوەیە کە بە شێوەی پرژە لە هەوادا بڵاو دەکرێتەوە) و پەرەی پێ دراوە و ئامادە کراوە. بڵاوکردنەوەی بەکتریای تاعوون بە شێوەی پرژە لە هەوادا، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو دانیشتوانەی بکەونە بەر ئەم هەوایە، تووشی تاعوونی هەوکردنی سییەکان ببن. ئەم جۆرە تاعوونە شێوەیەکی ناباو و کوشندە و درمی تاعوونە.

چەند هۆکارێک هەیە کە دەبنەی مایەی نیگەرانی ئەگەر تاعوون وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێت. هۆکارەکانیش ئەمانەن:

* بەکتریای تاعوون (Yersinia pestis) بە شێوەیەکی بەرفراوان لە بانکەکانی میکرۆب (Microbe bank) لە سەرتاسەری جیهاندا هەیە.

---

[1] https://www.nationalgeographic.com/science/health-and-human-body/human-diseases/the-plague/

* بەکتریــای تــاعوون (Yersinia pestis) بە بڕێکــی زۆر و بە شـێوەیەکی سروشـتی لەو شـوێنانەی کە نەخۆشـییەکەی تێدا بـڵاوە، دەست دەکەوێت.

* تەکنیکەکـانی بەرهەمهێنـانی بەکتریـای یەرسـینیا پێسـتیس بە بڕێکی زۆر و بڵاوکردنەوەی پەرەیان پێ دراوە.

* ڕێـــژەی مـــردن بە تـــاعوونی ســـییەکان لە حـــاڵەتی چارەسەرنەکردنی تووشبواندا، ئەوپەڕی زۆرە.

* ئەگەری ئەوە هەیە کە دوای هێرشـکردن بە بەکتریـای تـاعوون، تــاعوونەکە بە شـێوەیەکی لاوەکـی لە کەسـیکەوە بـۆ یەکێکـی تـر بگوازرێتەوە.

* دەتوانرێت بەکتریای یەرسـینیا پێسـتیس بە شێوەی پرژە بڵاو بکرێتەوە.

* تـاعوون بە ژەمێکـی کەم، مـرۆڤ تـووش دەکـات، واتـا بڕێکـی کەمی بەکتریاکە، مرۆڤ تووشی تاعوون دەکات.

* هەنــدێک تیــرە (strain)ی بەکتریــای یەرســینیا پێســتیس لە سروشتدا هەن کە بەرهەڵستیی دژەزیندەکان دەکەن.

ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهـانی لە هەڵسـەنگاندنێکیدا لە سـاڵی ١٩٧٠، جەختــی لەوە کــردەوە لە ســیناریۆیەکی ئەوپەڕی خراپــدا، حـاڵەتی بڵاوکـردنەوەی ٥٠ کیلـۆ لە بەکتریـای یەرسـینیا پێسـتیس بە شـــێوەی هەورێکـــی پرژەیـــی بە ســـەر شـــارێکدا کە ژمـــارەی دانیشـــتوانەکەی ٥ ملیـــۆن کەس بێـــت. دەشـــێت ١٥٠٠٠٠ حـــاڵەتی تووشـبوون بە تـاعوونی هەوکردنـی سـی ڕوو بـدات. لەو ١٥٠٠٠٠ تووشـــبووە، ٨٠٠٠٠ بـــۆ ١٠٠٠٠٠یـــان پێویســـتیان بە چارەســـەر لە نەخۆشـخانە دەبێـت و ٣٦٠٠٠ کەسـیش چـاوەڕوانیی ئەوەیـان لـێ دەکرێت بە تاعوونەکە بمرن.[1]

[1] https://www.centerforhealthsecurity.org/our-work/publications/plague-fact-sheet

**تاعوون سێ شێوەی سەرجێیی (clinical forms) هەیە کە ئەمانەن:**

* **تاعوونی خەیارە** (Bubonic plague): ئەوەی تووشی ئەم شێوە تاعوونە دەبێت، لەناکاو تا و سەرئێشە و لاوازی و گرێی لیفی هەڵئاوساو و بەئازاری لێ دەردەکەوێت، ئەو گرێیانە پێیان دەڵێن خەیارە. ئەم جۆرە تاعوونە لە ئەنجامی گەستنی کێچەوە تووشی مرۆڤ دەبێت. بەکتریای ئەم تاعوونە لە ناو ئەو گرێ لیمفاوییانەدا زۆر دەبێت کە نزیکن لە شوێنی چوونەناوەوەی بەکتریاکەوە. ئەگەر تووشبووەکە بە دژەزیندەیەکی گونجاو چارەسەر نەکرێت، ئەوا بەکتریاکە بە بەشەکانی تری لەشیدا بڵاو دەبێتەوە. ئەم جۆرە تاعوونە لە ٨٠٪ی ئەوانەی تووشی دەبن، دەکوژێت.

* **تاعوونی ژەهراوییبوونی خوێن** (Septicemic plague): ئەوەی تووشی ئەم شێوە تاعوونە دەبێت، تووشی تا و هەڵلەرزین و ئەوپەڕی لاوازی و ئازاری زگ و شۆک دەبێت، لەوانەیە تووشی خوێنبەربوونی پێست و ئەندامانی تری لەشی ببێت. دەشێت پێست و شانەکانی تری لەشی ڕەش هەڵبگەڕێن و بمرن، بە تایبەتی پێستی سەر پەنجەکانی دەست و پێی و لووتی. دەشێت ئەم جۆرە تاعوونە وەک نیشانە سەرەتاییەکانی تووشبوون بە تاعوون دەربکەوێت، یان دەشێت لە ئەنجامی چارەسەرنەکردنی تاعوونی خەیارەوە پەیدا ببێت. لەوانەیە مرۆڤ، بە هۆی گەستنی کێچی هەڵگرتووی نەخۆشییەکە یان بەرکەوتن بە ئاژەڵی تووشبوو بەم جۆرە تاعوونە، تووشی ئەم پەتایە ببێت.

* **تاعوونی سییەکان** (Pneumonic plague): لەم شێوە تاعوونەدا، تووشبوو تووشی تا و سەرئێشە و لاوازی و هەوکردنی سی لەگەڵ تەنگەنەفەسی و ئازاری سنگ و کۆکە و هەندێک جار خوێناوییبوون یان ئاولێهاتنی ناوپۆشەپەردەکان دەکات. تاعوونی هەوکردن لە ئەنجامی هەڵمژینی پرژەی تاعووناوی یان

چارەسەرنەکردنی تاعوونی خەیارە یان تاعوونی ژەهراویبوونی خوێن، تووشی مرۆڤ دەبێت و بە ناو سییەکانیدا بڵاو دەبێتەوە. دەشێت هەوکردنی سییەکان ببێتە هۆی پەککەوتنی سییەکان و تووشهاتن بە شۆک. تاعوونی هەوکردنی سی جۆرە هەرە مەترسیدارەکەی تاعوونە و تەنها جۆرە لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر بە هۆی پرژە (دڵۆپەی زۆر بچووک)ی کەسی تووشبووەوە بگوازرێتەوە.

تاعوون بە نەخۆشخەری گرووپی A پۆلین کراوە، چونکە بە ئاسانی بە ناو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە و ئەگەر چارەسەر نەکرێت، مردنێکی زۆری لێ دەکەوێتەوە. ئەم پۆلێنکردنەی تاعوون بە گرووپی A، ترسێکی زۆری دروست کرد، لەوەی ئەگەر بەکتریای یەرسینیا پێستیسی تاعوون وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێت و بە شێوەی پرژە بڵاو بکرێتەوە. تەنۆکەیەکی بچووکی بەکتریای تاعوون لە هەوادا دەشێت ببێتە هۆی تووشبوون بە تاعوونی هەوکردنی سی کە جۆرە هەرە کوشندە و درمەکەی تاعوونە.[1]

**گوێزرانەوەی تاعوون بۆ مرۆڤ**

بەکتریای تاعوون بەم ڕێگەیانەی خوارەوە بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە:

**گەستنی کێچ**

بە زۆری بەکتریای تاعوون لە ڕێی گەستنی کێچی هەڵگری بەکتریای تاعوون بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە. لە ماوەی بڵاوبوونەوەی تاعوون لە ناو ئاژەڵدا، زۆر لە گیانلەبەرە کرتێنەرەکان دەمرن، ئەمەش وا لە کێچە برسییەکان دەکات بۆ سەرچاوەی تری خوێن بگەڕێن. مرۆڤ یا ئاژەڵ، کاتێک دەچێتە ئەو شوێنانەی کە تازە کرتێنەرەکانی تێدا مردوون، مەترسیی ئەوەیان لەسەرە کە بە هۆی گەستنی کێچەکانەوە تووشی تاعوون ببن. دەشێت سەگ و پشیلە

[1] https://www.cdc.gov/plague/faq

کێچی هەڵگری تاعوون بێننە ناو ماڵەکان. گەستنی کێچ دەشێت ببێتە هۆی تاعوونی خەیارە یان تاعوونی ژەهراویبوونی خوێن.

### بەرکەوتنی شلە یان شانەی تووشبوو

دەشێت مرۆڤ، کاتێک دەست لە شانە یان شلەکانی لەشی ئاژەڵێکی تووشبووی تاعوون بدات، یاخود بەر لەشی بکەوێت، تووشی تاعوون ببێت. بۆ نموونە، کاتێک ڕاوکەرێک پێستی کەرویشکێک یان ئاژەڵێکی ڕاوکراو دادەماڵێت، بەبێ ئەوەی ڕێکاری پێویست بگرێتە بەر، دەشێت بە هۆی گواستنەوەی بەکتریای تاعوونەوە تووشی تاعوون ببێت. ئەم شێوە کەوتنەبەرە، کە زۆر باوە، دەبێتە هۆی تووشبوون بە تاعوونی خەیارە یان تاعوونی ژەهراویبوونی خوێن.

### پرژەی پیسبوو بە بەکتریای تاعوون

کەسێک کە تاعوونی هەوکردنی سیی هەبێت، کاتێک دەکۆکێت، دڵۆپەی زۆر بچووک کە بەکتریای تاعوونیان تێدایە، فڕێ دەداتە ناو هەواوە. ئەگەر کەسێکی تر ئەو هەوایە هەڵبمژێت کە دڵۆپە پیسبووەکانی بە بەکتریای تاعوون تێدایە، ئەوا تووشی تاعوونی هەوکردنی سی دەبێت. بە شێوەیەکی ئاسایی، ئەم گواستنەوەیە ئەوە دەخوازێت کە کەسەکە ڕاستەوخۆ بەر تووشبووەکە بکەوێت یان زۆر لێی نزیک بووبێتەوە. گواستنەوەی ئەم دڵۆپە بچووکانە تەنها ڕێگەیە بۆ بڵاوبوونەوەی تاعوون لە ناو خەڵکدا و نەخۆشییەکە لە یەکترەوە بگرن.

بە تایبەتی پشیلە کاتێک گیانلەبەرێکی کرتێنەری تووشبوو بە تاعوون دەخوات، ئەگەری ئەوە زۆرە تووشی تاعوون ببێت. پشیلەی تووشبوو بە تاعوون مەترسییەکی گەورەی گواستنەوەی دڵۆپەی بچووکی پیسبوو بە بەکتریای تاعوون بۆ خاوەنەکانیان یان پزیشکانی ڤێترنەری دروست دەکەن.

## نیشانەکانی تووشبوون بە تاعوون

نیشـانەکانی تووشـبوون بە تـاعوون دەکەوێتە سـەر ئەوەی چۆن نەخۆشەکە تووشی بەکتریـای تـاعوون بووە. دەشـێت تـاعوون گەلێک شـێوەی جۆراوجۆری سـەرجێیی (clinical form) وەربگرێت، بەڵام شێوە هەرە سەرجێییە باوەکانی تـاعوون بریتین لە تـاعوونی خەیـارە و هەوکردنـی سـی و ژەهراویبـوونی خـوێن. نیشـانەکانی تووشـبوون هەر یەکێکیان بە جیا باس دەکەین:

### * نیشانەکانی تاعوونی خەیارە

تووشبوو لەناکاو تووشی تا و سەرئێشـە و هەڵلەرزین و لاوازی و ئاوسانی بەئازاری یەکێک یان زیاتر لە گرێ لیمفاوییەکان دەبێت. تووشـبوون بەم شـێوە تـاعوونە، بە هـۆی گەسـتنی کێچـی هەڵگـری تـاعوونەکەوە دەبێت. بەکتریـای تـاعوونەکە لە نـاو نزیکتـرین گرێـی لیمفـاوی لە شـوێنی هاتنەنـاوەوەی نـاو لەشـی مـرۆڤ دەسـت بە زۆربـوون دەکـات. ئەگەر نەخۆشـەکە بە دژەزینـدەیەکی گونجـاو چارەسەر نەکرێت، ئەوا بەکتریـای تـاعوونەکە بە نـاو بەشـەکانی تـری لەشی نەخۆشەکەدا بڵاو دەبێتەوە.

### * نیشانەکانی تاعوونی ژەهراویبوونی خوێن

نەخـۆش تووشـی تـا و هەڵلەرزیـن و لاوازییەکـی زۆر و ئـازاری ورگ و شـۆک دەبێـت، دەشـێت تووشـی خوێنبەربـوونی پێسـت و ئەندامەکانی تری لەش ببێت. دەشێت تاعوونی ژەهراویبوونی خـوێن وەک یەکەم نیشـانەی تـاعوون دەربکەوێـت یـان دەشـێت لە چارەسـەرنەکردنی تـاعوونی خەیـارەوە پەیدا ببێت. مـرۆڤ بە هـۆی گەسـتنی کێچـی هەڵگـری تـاعوون یـان بەرکەوتـن لەگەڵ ئـاژەڵی تووشبوو، تووشی ئەم جۆرە تاعوونە ببێت.

**• نیشانەکانی تاعوونی سییەکان**

نەخۆش تووشی تا و سەرئێشە و لاوازی و تەشەنەکردنی خێرای هەوکردنی سی دەبێت لەگەڵ تەنگەنەفەسی و ئازاری سنگ و کۆکە، هەندێک جاریش تووشی دەردانی چڵمی خوێناوی یان ئاودار دەبێت. دەشێت تاعوونی هەوکردنی سی، بە هۆی هەڵمژینی دڵۆپەی پیسبوو بە بەکتریای تاعوون، یان لە ئەنجامی چارەسەرنەکردنی تاعوونی خەیارە، یان تاعوونی ژەهراویبوونی خوێن تووشی مرۆڤ بێت، ئەوەیش دوای ئەوەی بەکتریاکە بە ناو سییەکاندا بڵاو دەبێتەوە. دەشێت تاعوونی هەوکردنی سی ببێتە هۆی پەککەوتنی هەناسەدان و تووشبوون بە شۆک. تاعوونی هەوکردنی سی مەترسیدارترین شێوەی تاعوونە و تەنها شێوەیە کە بە هۆی دڵۆپەی پیسبوو بە بەکتریای تاعوون، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بگوازرێتەوە.

**خۆپاراستن**

١- کرتێنەرەکان لە شوێنی نیشتەجێبوون و شوێنی کار و شوێنی بەسەربردنی پشووەکانت کەم بکەرەوە. کۆمەڵە بەرد و لقی دار و داری سووتاندنی هەڵڕژاو و ئەو خواردنانەی دەبن بە خۆراکی کرتێنەرەکان، لە ماڵەکەت دوور بخەرەوە.

٢- دەستکێش بەکار بهێنە ئەگەر مامەڵە لەگەڵ ئاژەڵێک دەکەیت کە دەشێت تووشی تاعوون بووبێت یان دەتەوێ کەوڵی بکەیت، بۆ ئەوەی پێستت بەر بەکتریای تاعوون نەکەوێت.

٣- ئەگەر هەست بەوە بکەیت کە لە کاتی هەندێک چالاکی، وەک مانەوە لە خێوەتدا یان ڕۆیشتن بە پێ بۆ ماوەیەکی درێژ یان ئیشی دەرەوەی ماڵ، دەشێت تووشی ئەوە بیت کە کێچی کرتێنەرەکان بتگەزن، ئەوا دەرمانێکی دوورخەرەوەی وەک DEET (diethyltoluamide) لە پێست و جلەکانت بدە.

٤- لە ڕێی بەکارهێنانی دەرمانەکانی نەهێشتنی کێچەوە، کێچ لە ئاژەڵە ماڵییەکان دوور بخەرەوە. دەشێت ئاژەڵی ماڵی بە ئازادی بسووڕێتەوە و بەر ئاژەڵێکی تووشبوو بە تاعوون یان کێچی هەڵگری تاعوون بکەوێت و نەخۆشییەکە بۆ ناو ماڵ بگوازێتەوە.

٥- مەهێڵە ئەو پشیلە یان سەگەی بە ئازادی لە شوێنێک دەسووڕێتەوە کە تاعوونی تێدا بڵاو بووبێتەوە، لە سەر جێگەی نوستنەکەت بخەوێت.

## دەستنیشانکردنی نەخۆشیی تاعوون

نیشانە هەرە باوەکانی تووشبوون بە تاعوونی خەیارە، خێرا گەشەکردنی ڕژێنە لیمفاوییە ئاوساوەکانە. زانینی ئەو کێچەی کەسەکەی گەستووە یان هەبوونی ئاوسانی ڕژێنەکان، یارمەتیی پزیشک دەدەن کە بزانێت هۆی نەخۆشییەکە تاعوونە.

لە زۆر حاڵەتدا، بە تایبەتی لە حاڵەتەکانی تاعوونی ژەهراییبوونی خوێن و تاعوونی هەوکردنی سییەکاندا، هیچ نیشانەیەکی ڕوون نییە کە ئاماژە بۆ تووشبوون بە تاعوون بکات. لێرەدا، بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە، نموونەی خوێن یان بەشێکی ڕژێنە لیمفییە ئاوساوەکەی نەخۆشەکە وەردەگیرێت و دەنێررێت بۆ تاقیگە بۆ پشکنین. کاتێک دەرکەوت نەخۆشەکە نەخۆشیی تاعوونی هەیە، چارەسەری گونجاوی بۆ دادەنرێت.

## چارەسەرکردنی تاعوون

تاعوون نەخۆشییەکی زۆر مەترسیدارە، بەڵام بە دژەزیندە باوەکان چارەسەر دەکرێت. تووشبووەکە تاکو زووتر بەدوای چارەسەری پزیشکیدا بگەڕێت و چارەسەری گونجاو وەربگرێت، ئەگەری تەواو چاکبوونەوەی زیاترە.[١]

---

[1] https://www.cdc.gov/plague/prevention/index.html

## بۆتولیزم (خۆراکە ژەهراویبوون) – Botulism

### پێشەکی

نەخۆشیی بۆتولیزم یان نەخۆشیی خۆراکە ژەهراویبوون، بە هۆی ئەو دەمارەتۆکسینانەی کە بەکتریاکانی کلۆستریدیوم بۆتولینوم (clostridium botulinum) بەرهەمی دەهێنن، تووشی مرۆڤ یان ئاژەڵ دەبێت. دەمارەتۆکسینەکانی کلۆستریدیوم بۆتولینوم (clostridium botulinum) لە تۆکسینە هەرە بەهێزە ناسراوەکانن. بە هۆی ئەوپەڕی ژەهراویتییان، یەکێک بوون لەو هۆکارانەی کە بیریان لێ کراوەتەوە بۆ ئەوەی وەک هۆکارێکی چەکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێن. دەمارەتۆکسینی کلۆستریدیوم بۆتولینوم لە لایەن چەند وڵاتێکەوە وەک چەکێکی بایۆلۆجی پەرەی پێ دراوە، لەوانە، ئەڵمانیا، ژاپۆن، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ڕووسیا و عێراق. بۆتولیزم نەخۆشییەکی ئیفلیجیی دەمارییە، بە گشتی، بە هۆی خواردنی خۆراکێک کە دەمارەتۆکسینەکانی جۆری A و B و Eی پێوە بێت، تووشی مرۆڤ دەبێت. ئەم نەخۆشییە زۆر جار کوشندەیە ئەگەر چارەسەر نەکرێت.

### مێژووی نەخۆشیی بۆتولیزم

یەکەم جار پزیشکی ئەڵمانی، جوستینیوس کێرنەر، لە ساڵی ١٧٩٣دا بۆتولیزمی دۆزییەوە. وشەی بۆتولیزم (botulism) لە وشەی بۆتولس (botulus)ی لاتینییەوە وەرگیراوە کە بە مانای سۆسەج (sausage) دێت.

ساڵی ١٨٩٥، ئیمیل ڤۆن ئیرمێنگیم ئەوەی دیاری کرد کە سەرچاوەی ڕاستەقینەی بڵاوبوونەوەی بۆتولیزم لە بەلجیکا، بەکتریای کلۆستریدیۆم بۆتولینومە (clostridium botulinum).[١]

لە سەرەتای ساڵانی ١٩٣٠یەکاندا، کاتێک ژاپۆن مەنشووریا (Manchuria)ی داگیر کردبوو، فەرماندەیەکی جەنگی بایۆلۆجی، یەکەیەکی سەربازیی دروست کرد کە پێی دەوترا یەکەی ٧٣١. جەنەراڵ شیرۆ ئیشی، کە فەرماندەی پزیشکی سەربازیی ئەم یەکەیە بوو، ددانی بەوەدا نا کە ناوەندە چاندنە کوشندەکانی بەکتریای کلۆستریدیوم بۆتولینومی دەرخواردی دیلەکانی جەنگ و زیندانییەکانی داوە کە چینی و کۆری بوون.

تویژەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ساڵانی ١٩٤٠ـەکاندا، دەستیان بە کارکردن لەسەر تۆکسینی بۆتولینوم کرد، بۆ ئەوەی بیکەن بە چەکی بایۆلۆجی و هەواڵگریی هاوپەیمانانیش ئاماژەیان بۆ ئەوە کردبوو کە ئەڵمانیاش هەوڵی دابوو پەرە بە تۆکسینی بۆتولینوم بدات، بۆ ئەوەی بیکات بە چەک و دژی هێزی داگیرکەران بەکاری بهێنێت. لەو کاتەدا، پێکهاتی ئەو تۆکسینەی کە کلۆستریدیوم بۆتولینوم بەرهەمی دەهێنا و میکانیزمی پەیدابوونی نەخۆشی بە تۆکسینەکە، بە تەواوی نەزانرابوون.

لەبەر ئەوە، ئامانجە سەرەتاییەکانی تویژینەوە جیاکردنەوە و پاککردنەوەی تۆکسینەکە و دیاریکردنی چۆنێتیی پەیدابوونی نەخۆشی بەم تۆکسینە بوو. هەروەها لە ئەگەری بەکارهێنانی دەمارەتۆکسینی بۆتولینوم وەک چەکێکی بایۆلۆجی بۆ هێرشکردن، کۆڵرایەوە (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بۆ دەمارەتۆکسینی بۆتولینوم کۆدی Agent Xی دانابوو).

---

[1] Erbugh, Frank J., Historical Notes on Botulism, *Clostridium botulinum*, Botulinum Toxin, and the Idea of the Therapeutic Use of the Toxin, Movement Disorders Vol. 19, Suppl. 8, 2004, pp. S2–S6.

دوای فەرمـانە جێبەجێکـارییەکەی سـەرۆکی ئەمەریکـا ڕیچـارد نیکسۆن لە ١٩٦٩–١٩٧٠، هەموو جبەخانەکانی هۆکارە بایۆلۆجییەکان لە بەرنـامەی هێرشـی بـایۆلۆجیی ئەمەریکـا، لەوانە دەمارەتۆکسـینی بۆتولینـوم، لەنـاو بـران. ڕێککەوتننـامەی قەدەغەکـردن و پەرەپێدان و بەرهەمهێنـــان و هەڵگرتنـــی چەکە بەکتریۆلـــۆجی (بـــایۆلۆجی) و تۆکسینەکان و لەناوبردنیان، بەرهەمهێنانی تۆکسـینەکانی هێرشـکردنی قەدەغە کردووە.

هەرچەنـــدە یەکێتیـــی ســـۆڤییەت ئەم ڕێککەوتننامەیـــەی واژۆ و پەســـەند کردبـــوو، لە بەرنـــامەی جەنگـــی بایۆلۆجییەکەیـــدا، کە تـــوێژینەوەی دەمارەتۆکســـینی بۆتولینـــوم و پەرەپێـــدانی چەک و بەرهەمهێنانی دەگرتەوە، بەردەوام بوو، تەنانەت دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤییەتیش ئەم بەرنـامەیە فراوانتـر کرابـوو. وەک دەوتـرێ، یەکێتیـــی ســـۆڤییەت چەکـــی بۆتولینـــومتێکراوی، لە ئارلاســـک–٧ لە دوورگەی فۆزرۆژدینیا کە خـاکی سۆڤییەتییە لە دەریـای ئـاراڵ، تـاقی کـــردەوە. هەروەهـــا یەکێتیـــی ســـۆڤییەت هەوڵـــی دا تەکنۆلۆجیـــای ئەنـدازیاریی بۆمـاوەزانی بەکـار بهێنێـت بـۆ گواسـتنەوەی تەواوی جینەکـانی دەمارەتۆکسـینەکە بـۆ بەکتریـایەکی دیکە. لە نیسـانی سـاڵی ١٩٩٢دا، سەرۆکی ڕووسیا، بۆریس یەڵتسن، بە ئاشکرا ڕای گەیاند کە وڵاتەکەی بە نهێنـــی بەردەوام بـــووە لە پەرەپێـــدانێکی بەرفراوانـــی بەرنامەی جەنگی بایۆلۆجی بۆ مەبەسـتی هێرشکاری، کە پەرەپێدانی تۆکسینی بۆتولینومی وەک چەکێک تێدا بووە.

عێراق لە ساڵی ١٩٧٥، ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردن و پەرەپێدان و بەرهەمهێنـــان و هەڵگرتنـــی چەکە بەکتریۆلـــۆجی (بـــایۆلۆجی) و تۆکسینەکان و لەناوبردنیان، قەدەغەی بەرهەمهێنانی تۆکسینەکانی بـۆ هێرشـــکردن، واژۆ کردبـــوو، بەڵام ســـاڵی ١٩٨٥، بەرنـــامەی جەنـــگە بـــایۆلۆجییەکەی فـراوان کـرد. دە سـاڵ دواتـر، عێـراق لە لای تیمـی پشـکنینی تـایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکـان، ددانـی بەوەدا نـا کە ٤٩٠٠

گالۆن (١٩٠٠٠ لیتر) لە دەمارەتۆکسینی بۆتولینومی خەستی بەرهەم هێناوە و لە ساڵانی ١٩٨٩ و ١٩٩٠دا، ئەو مووشەک و بۆمب و ئامێرە پرژێنەرانەی کە بە تایبەتی بۆ تۆکسینەکە دروست کرابوون، پڕ پڕ کردووە. لەو ٤٩٠٠ گالۆنە، ٢٦٠٠ گالۆنی بەکار هێنابوو بۆ پڕکردنی ١٣ مووشەکی سکۆدی مەودا ٦٠٠ کیلۆمەتر و ١٠٠ بۆمبی ٤٠٠ پاوەندی (دەتوانرا هەر بۆمبێک ٢٢ گالۆن گیراوەی تۆکسینی تێ بکرێت). عێراق لە جەنگی کەنداو و پرۆسەی ئازادکردنی عێراق، چەکی بایۆلۆجیی بەکار نەهێنا، چونکە جەختی لەوە دەکردەوە کە جبەخانەی چەکە بایۆلۆجییەکانی لەناو بردووە. یەک لەسەر سێی ئەم ٤٩٠٠ گالۆنە (١٩٠٠٠ لیترە)، واتا ١٦٣٣ گالۆن لە دەمارەتۆکسینی بۆتولینوم، بەشی ئەوە دەکات کە هەموو دانیشتوانی سەر گۆی زەوی لە ڕێی هەڵمژین بە هەناسەدانەوە بکوژێت.

تاقمی ئوم شینریکیۆ، کە تاقمێکی ئایینی بوو لە ژاپۆن و لە ساڵی ١٩٨٧ شۆکۆ ئاساهارا دروستی کردبوو، دوای شکستهێنانی ئەم تاقمە لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٠، هەوڵی پەرەپێدانی چەکی بایۆلۆجییان دابوو. ئەم تاقمە بەوە ناسرابوون کە ساڵی ١٩٩٥ هێرشێکی کوشندەیان بە گازی سارین بۆ سەر میترۆی تۆکیۆ ئەنجام دابوو. هەروەها تاقمی ئوم شینریکیۆ هەوڵی بەرهەمهێنانی دەمارەتۆکسینی بۆتولینومیان دابوو.[1]

پێش هێرشەکەیان بە گازی سارین، تاقمی ئوم شینریکیۆ پرژەی بۆتولینوم تۆکسینیان لە چەند شوێنێکی ناوەڕاستی تۆکیۆ و دامەزراوە سەربازییەکانی بڵاو کردەوە. بە لایەنی کەمەوە لە سێ ڕووداوی جیاوازدا، لە نێوان ساڵانی ١٩٩٠ و ١٩٩٥ بڵاویان

[1] Zygmunt. F. Dembek, Textbook of Military Medicine, Medical Aspects of Biological warfare, Office of The Surgeon General at TMM Publications, Washington DC., p.338.

کردبـووەوە، بەڵام هـیچ زیانێکیـان لـێ نەکەوتبـووەوە و شکسـتیان هێنابوو.[1]

ئەم تـاقمە کە ٢٣٠٠٠ شـوێنکەوتووی لەسـەر ئاستی جیهـان و بە مەزەندە یەک ملیار دۆلار سامانی هەبوو، توانای پەرەپێدانی تۆکسینە بایۆلۆجییەکانی هەبوو، بۆ ئەوەی وەک چەک بەکاریـان بهێنێت و بە نیـازی ئەوەش بـوو. هەرچەنـدە ئەنـدامانی تـاقمەکە پسـپۆڕ نەبـوون لە پەرەپێـدانی چەکـی بایۆلۆجیـدا، بەڵام لە نـاو شـوێنکەوتووەکانیدا پسـپۆڕی مایکرۆبـایۆلۆجی و پزیشـک و زانـا هەبـوون. بە تەواوی نەزانـرا کە بـۆچی ئەو هێرشـە بـایۆلۆجییە شکسـتی هێنـا، بەڵام زانیارییەکـان لە دادگـاییکردنی ئاسـاهارا، ئاماژەیـان بـۆ ئەوە کـرد کە زانایـانی تـاقمەکە گرفتیـان هەبـووە لەوەی بتـوانن بەسـەر کۆسـپە تەکنیکییەکـانی جیـاکردنەوە و چانـدنی بەکتریـای کلۆسـتریدیوم بۆتولینومدا زاڵ ببن.[2]

بۆتـولیزم بە هـۆی بەکتریـای کلۆسـتریدیوم بۆلتولینـوم (Clostridium botulinum) ڕوو دەدات. بەکتریـای کلۆسـتریدیوم بۆتولینوم بەکتریایەکی شێوەچیلکەیی و خۆگری بۆیەی گرامە ( gram positive) و بەبـێ ئۆکسـجین دەژی. سـپۆرەکانی کلۆسـتریدیوم بۆتولینـوم لە هەمـوو گڵێکـدا هەن و بەرگەیەکـی زۆری گەرمـا و ڕووناکی و وشکی و تیشک دەگرن. سپۆرەکانی ئەم بەکتریایە ئەگەر بۆ ماوەی چەند کاژێرێک لە ١٠٠ پلەی سەدیدا بکوڵێنرێن، هیچیان لـێ نایە، بەڵام ئەگەر بدرێنە بەر گەرمایەکی شێدار لە ١٢٠ پلەی سـەدی

---

[1] Arnon, S. Stephen , and co–workers, Botulinum Toxin as a Biological Weapon , Medical and Public Health Management, JAMA – Vol. 285 No. 8, February 28, 2001.

[2] Zygmunt. F. Dembek, Textbook of Military Medicine, Medical Aspects of Biological warfare, Office of The Surgeon General at TMM Publications, Washington DC., p. 339.

بـۆ مـاوەی ٣٠ خـولەک، ئەوا دەمـرن. هەنـدێک بـارودۆخی تـایبەت پێویستە بۆ ئەوەی سپۆرەکان بڕوێن (germinate). ئەم بارودۆخە تایبەتییانە، بـارودۆخی بێهەوایـی (وەک کەلاکـی ڕزیـو و خـۆراکی لەقوتوونراو) و گەرمی و تفتییەکی مامناوەندی دەگرێتەوە.

سـپۆرەکانی کلۆسـتریدیوم بۆتولینـوم، دوای ڕوانیـان، دەمارەتۆکسـینی بۆتولینـوم دەردەدەن. بەپێـی زانسـتی بەرگریزانـی (immunology)، دەمارەتۆکسـینەکانی بۆتولینـوم بـۆ حەوت جـۆر پـۆلێن کـراون کە بـریتین لە جۆرەکـانی A، B، C، D، E، F، G. پۆلێنکردنەکەشـیان لەسـەر بنچینـەی ئەوەیە کە پێکهـاتی پرۆتینـی جیاوازیان هەیە.

بێگومـان جـۆرە جیاوازەکـانی دەمارەتۆکسـین کـار لە گیـانەوەرە جیاوازەکان دەکەن. چەند مایکرۆگرامێکی کەمی ئەم دەمارەتۆکسینانە دەبنە هۆی نەخۆشییەکی توند. هەموو جۆرەکانی دەمارەتۆکسینەکانی بەکتریـای کلۆسـتریدیوم بۆتولینـوم دەبـنە هـۆی ئیفلیجییەکـی نەرم (flaccid paralysis) لە هەمـوو جۆرەکـانی گیانەوەرانـدا، وەک گاوگۆل، ئەسـپ، مەڕ، سـەگ، بەراز، باڵندەی ماڵی و باڵندەی کێوی. ئەم تۆکسینە لەو خۆراکانە پەیدا دەبێت کە بە شێوەیەکی دروست لێ نەنراون یان لە قوتوودا هەڵنەگیراون و ترشێتییان نزمە، یاخود تفتن. هەروەها ئەم تۆکسینە لە خواردنە پەستەرەکراوەکان (pasteurized) و ئەو خواردنـانەی کە خـوێ و مـادەی پێویسـتیان بـۆ پاراسـتنیان بە باشـی تـێ ناکرێـت و لە نـاو ئـامێری ساردکردنەوەدا هەڵنـاگیرێن، بە تـایبەتی ئەو خواردنـانەی لە قوتـووی زۆر بـاش داخـراو و مـووبڕ لە هەوا هەڵگیراون، دروست دەبێت. چۆنێتیی کارکردنی دەمارەتۆکسین لە لەشـی مرۆڤـدا ئەوەیە کە بە پێکبەنـدی (synapse) ماسـوولکە و دەمارەوە دەنووسێت و پێچەوانەوەبوونەوەی نییە، واتە لێی نابێتەوە، نایەڵێت ئەسیتیل کۆلین (acetylcholine) لە پێکبەندەکە دەربپەڕێت و ئەمەش دەبێتە هـۆی ئیفلیجیی ماسـوولکەیی. بە گشـتی، ئەم تۆکسـینە

کاریگەریی لەسەر دەمارە هەستیارە چێوەییەکان و ناوەندەکۆئەندامی دەمار نابێت. دەتوانرێت ئەم تۆکسینە، بە هۆی گەرمی و کولاندنی خواردن لە ٨٠ پلەی سەدی بۆ ماوەی ٣٠ خولەک، لەناو ببرێت، هەرچەندە ناچالاککردنی سپۆرەکان پێویستیان بە پلەیەکی گەرمیی زۆر بەرزتر هەیە.[١]

### ژەهراویێتیی دەمارەتۆکسینەکانی بۆتولینوم

دەمارەتۆکسینەکانی بۆتولینوم کە تیرەکانی کلۆستریدیۆم بۆتولینوم دروستیان دەکات، ژەهراویترین ژەهرن کە مرۆڤ زانیبێتی.

* کوشندەژەمی دەمارەتۆکسینی بۆتولینوم بۆ کەسێک کە لە رێی دەمەوە قووتی بدات، ٣٠ نانۆگرامە، واتە ئەگەر گرامێک بکەیت بە سێهەزار ملیۆن بەش، ئەوا سی بەشی مرۆڤ دەکوژێت.

* کوشندەژەمی بۆ مرۆڤ کە لە رێی هەناسەدانەوە بۆ ناو سییەکان هەڵبمژرێت، ٠,٨ بۆ ٠,٩ مایکرۆگرامە، واتە ئەگەر گرامێک لە دەمارەتۆکسینی بۆتولینوم بکەیت بە یەک ملیۆن بەش، ٠,٨ بۆ ٠,٩ی یەک بەش مرۆڤ دەکوژێت.

* ئەگەر لە رێی دەرزیی دەمارەوە، ٠,٠٩ بۆ ٠,١٥ مایکرۆگرام دەمارەتۆکسینی بۆتولینوم لە مرۆڤێک بدرێت، ئەوا مرۆڤەکە دەکوژێت. بە واتایەکی تر، ئەگەر یەک گرام لەو ژەهرە بکرێت بە یەک ملیۆن بەش، ئەوا ٠,٠٩ بۆ ٠,١٥ی یەک بەش بکرێتە ناو خوێنی مرۆڤێکەوە، ئەوا مرۆڤەکە دەکوژێت.

لە ئێستادا (کە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٢٠ـە)، ژمارەی دانیشتوانی جیهان ٧,٨ ملیار کەسە و ئەگەر کێشی مرۆڤی ئاسایی بە ٧٠ کیلۆگرام دابنێین، ئەوا ٥٤,٦ گرام لە تۆکسینەدەماری بۆتولینوم بەشی ئەوە دەکات هەموو دانیشتوانی جیهان بکوژێت.

---

[1] http://www.cfsph.iastate.edu/DiseaseInfo/disease.php?name=botulism&lang=en

دەشـێت تۆکیسـنەدەماری بۆتولینـوم بە دوو ڕێگـە بـۆ کـاری تیرۆریستی بەکار بهێنرێت؛ بکرێتە نـاو خـواردن یـان خواردنەوەکان یاخود بە شێوەی پرژە لە هەوادا بڵاو بکرێتەوە.[١]

## گواستنەوەی دەمارەتۆکسینی بۆتولینوم

* لە ڕێـی خـواردنەوە: نەخۆشـیی بوتـولیزم بە زۆری بە هـۆی خـواردنی بەکتریـای کلۆسـتریدیوم بۆتولینـوم یـان خـواردنی دەمارەتۆکسـینی بەکتریـاکە یـاخود خـواردنی سـپۆرەکانی بەکتریـاکە ڕوو دەدەن. ئەگەر بەکتریـاکە بخورێـت، ئەوا لە نـاو گەدەدا سـپۆر بەرهەم دەهێـنن، پاشـان سـپۆرەکان دەڕوێـن (germinate) و دەمارەتۆکسین دەردەدەن. ئەگەر سپۆرەکان بخورێن، ئەوا سپۆرەکان دەڕوێن و دەمارەتۆکسین دەردەدەن.

ئەگەر سپۆرەکان لە ناو خۆراکێکی پیسبوودا ڕوابن و خۆراکەکە بخورێـت یـان خـودی دەمارەتۆکسـینەکە بخورێـت، ئەوا نەخۆشـیی بۆتولیزم بە خێرایی لە ناو لەشدا تەشەنە دەستێنێت.

* لە ڕێی پیسبوونی برینی کراوەوە: شێوەکانی تری گواستنەوەی بەکتریـای کلۆسـتریدیوم بۆتولینـوم، پیسـبوونی برینـی کـراوەیە بە سپۆرەکانی کلۆستریدیۆم.

* لە ڕێی هەڵمژینەوە: دەشێت دەمارەتۆکسینەکە لە ڕێی کرداری هەناسـەدانەوە هەڵبمژرێـت، بێگومـان ئەوەیـان ڕێگەیەکە کە ئەگەری بەکارهێنـانی لە لایەن تیرۆریسـتانەوە زۆرە، واتـە تیرۆریسـتان بە شێوەی پرژە لە ناو هەوادا بڵاوی بکەنەوە. تا ئێستا بەڵگەی وا تۆمار نەکراوە کە بۆتولیزم لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بگوازرێتەوە.

---

[1] Dhaked, R.K., Singh,M.K., Singh,P., Gupta,P., Botulinum toxin: bioweapon and magic drug,__The Indian Journal of Medical Research, 01 Nov 2010, 132:489–503.

## نەخۆشیی بۆتولیزم لە مرۆڤدا

دەشێت نەخۆشیی بۆتولیزم بە سێ شێوە تووشی مرۆڤ ببێت:

١- نەخۆشیی بۆتولیزمی خۆراکەهەڵگری بەکتریاکە یان سپۆرەکانی یاخود دەمارەتۆکسینەکان.

ئەم نەخۆشییە بە هۆی خۆراکێک کە پێشتر دەمارەتۆکسینی تێدا دروست بووبێت، تووشی مرۆڤ دەبێت. سەرچاوە هەرە باوەکانی دەمارەتۆکسینی لە پێشدا دروستبوو، خۆراکی پیسبوو بە دەمارەتۆکسینەکانە، وەک ئەو سەوزانەی لە ماڵدا بە شێوەیەکی گونجاو لە قوتوودا هەڵناگیرێن یان ماسیی بە شێوەیەکی باش خۆشنەکراو (نەترشێنراو). لە سەدا پەنجای نەخۆشیی بۆتولیزم کە بە خۆراکەهەڵگری بەکتریای کلۆستریدیوم لە ئەمەریکا ڕوو دەدەن، بە هۆی تۆکسینی جۆری Aیە. باوترین دەمارەتۆکسینی جیاکراوە، لە خۆراکە لە قوتوونراوەکاندا، دەمارەتۆکسینی جۆری Aیە. هەروەها دەمارەتۆکسینی جۆری E لەو ماسییانەدا هەیە کە بە باشی خۆش ناکرێن (بە باشی نەترشێنراون).

### ٢- نەخۆشیی بۆتولیزمی ساوا

باوترین شێوەی نەخۆشیی بۆتولیزم کە ڕوو دەدات، نەخۆشیی بۆتولیزمی ساوایە. لە ئەمەریکا، ساڵانە لە ١٠٠٠٠٠ حاڵەتی لەدایکبوونی منداڵی زیندوو، دوو حاڵەتی تووشبوون بەم نەخۆشییەی تێدایە. دوای ئەوەی سپۆرەکان لەگەڵ خۆراک دەخورێن و دەڕوێن، دەمارەتۆکسین دەردەدەنە دەرەوە و لە ڕیخۆڵەئەستوورەدا نیشتەجێ دەبن. ئەم نەخۆشییە بە زۆری لە منداڵانی تەمەن خوار یەک ساڵدا ڕوو دەدات. سەرچاوەی سپۆرەکانی ئەم بەکتریایە، هەنگوین و خۆراک و تۆز و شرووبی گەنمەشامیی پیسبووە بەو تۆکسینە.

### ٣- نەخۆشیی بۆتولیزمی پیسبوونی برینی کراوە

ئەم نەخۆشـییەیان دەگـمەنە و کاتێـک ڕوو دەدات کە بەکتریـاکە دەچێـتە نـاو برینێکـی کـراوە و لە بـارودۆخە ناهەواییەکانـدا گەشـە دەکـات. ئەم بەکتریـایە لە خـاکی پـیس یـان چەوی پیسـەوە دێـت. بەکتریـــای کلۆســـتریدیۆم بۆتولینـــوم یـــان ســـپۆرەکانی یـــاخود دەمارەتۆکسینەکەی ناتوانن بە ناو پیستێکی ساغدا گوزەر بکەنە نـاو لەشـی مـرۆڤەوە. ئەم جـۆرە نەخۆشـییە لە نـاو ئەوانەی ئـالوودەی هێرۆیینی قەترانی ڕەشن، ڕوو دەدات. هەندێک لە تووشـبووەکانی ئەم نەخۆشییە دەمرن.

ئەم سێ جۆرەی نەخۆشییەکە بەگوێرەی چۆنێتیی چوونەناوەوەی تۆکسـینەکە بـۆ نـاو لەشـی مـرۆڤەکە دەگـۆڕێن. هەرسـێ شـێوەکە نەخۆشـیی کوشـندەن و دەبێـت بە بـاری لەناکـاوی پزیشـکی دابنـرێن. مـاوەی تووشـبوون بە نەخۆشـییەکە و دەرکەوتنـی نیشـانەکانی لە ٦ کـاتژێرەوە بـۆ ٢ هەفـتەیە. لەگەڵ ئەوەشـدا، بە گشـتی نیشـانەکانی تووشبوون، دوای ١٢-٣٦ کاژێر لە دەرپەڕینی تۆکسینی نەخۆشـییەکە دەردەکەون. دەشێت مرۆڤ بە دەمارەتۆکسـینەکانی جۆری A و B و E تووشـی نەخۆشـییەکە ببێـت. هەروەهـا بە دەگمەنـیش مـرۆڤ بە تۆکسینی جۆری F تووشی نەخۆشییەکە دەبێت.[1]

### نیشانەکانی تووشبوون بەم نەخۆشییە

* نیشانەکانی مرۆڤی پێگەییو (باڵق) ئەمانەن:

جـووتبینین (بینینـی شـتێک بە دوو شـت)، شـتبینین بە لێڵـی، شۆڕبوونەوەی پێڵوو، تێکئاڵانی زمـان، بە قورسـی شـت قووتـدان، بە قورســـی هەناســـەدان، هەســـتکردن بە ئەســـتووربوونی زمـــان، وشکبوونەوەی ناودەم و لاوازبوونی ماسوولکەکان.

---

[1] http://www.cfsph.iastate.edu/DiseaseInfo/disease.php?name=botulism&lang=en

* نیشانەکانی منداڵی ساوا دەشێت ئەمانە بن:

خەواڵوویی، تووشبوون بە کەمخۆراکی، قەبزبوون، قیژاندنی لاواز، لاوازیی هێزی ماسوولکەکان.

هەموو ئەم نیشانانە لە ئەنجامی ئیفلیجبوونی ماسوولکەکان بە هۆی تۆکسینەکەوە ڕوو دەدەن. ئەگەر نەخۆشەکە چارەسەر نەکرێت، ئەوا نەخۆشییەکە بەرەو خراپتر دەڕوات و دەبێتە هۆی ئیفلیجبوونی هەندێک ماسوولکەی دیاریکراو، لەوانە، ئەو ماسوولکانەی بۆ هەناسەدان بەکار دەهێنرێن و ماسوولکەکانی باسکەکان و لاقەکان و قەدی مرۆڤەکە. دەشێت هەموو ئەو نیشانانە بە یەک جار دەرنەکەون.

## چارەسەرکردن

پزیشکەکان نەخۆشیی بۆتولیزم بە دەرمانێک چارەسەر دەکەن کە پێی دەڵێن دژەتۆکسین (antitoxin). دەمارەتۆکسینەکان هێرش دەکەنە سەر دەمارەکانی لەشی مرۆڤ و دژەتۆکسینەکە نایەڵێت چیتر زیانی زیاتر بەو دەمارانە بگات. هەروەها دژەتۆکسین ئەو زیانە چاک ناکاتەوە کە تۆکسینەکە بە دەمارەکانی گەیاندووە. مانەوەی تووشبووەکە لە نەخۆشخانە دەکەوێتە سەر توندیی نیشانەکانی نەخۆشییەکە، لەوانەیە چەند هەفتەیەک و تەنانەت چەند مانگێکیش لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە، پێش ئەوەی بڕواتەماڵەوە.

ئەگەر نەخۆشییەکە توند بێت، دەشێت نەخۆشەکە تووشی گرفتەکانی هەناسەدان بکات، تەنانەت پەککەوتنی هەناسەدانی لێ بکەوێتەوە ئەگەر تۆکسینەکە ئەو ماسوولکانە تووشی ئیفلیجبوون بکات کە بەشداری لە هەناسەداندا دەکەن. ئەگەر ئەوە ڕوو بدات، ئەوا پزیشک ئامێری هەناسەدانی بۆ دادەنێت، تاکو نەخۆشەکە بۆ خۆی دەتوانێت هەناسە بدات. ئەو ئیفلیجبوونەی بە هۆی تۆکسینەکەوە ڕوو دەدات، بە هێواشی چاک دەبێتەوە.

دەشێت نەخۆشیی بۆتولیزمی برینی کراوە پێویستی بەوە هەبێت پزیشک لە ڕێی نەشتەگەرییەوە سەرچاوەی تۆکسینەکە، کە بەکتریای ناو برینەکەیە، لاببات و ئینجا دژەتۆکسینی بداتێ.[1]

•

[1] https://www.cdc.gov/botulism/testing–treatment.html

## تولاریمیا – Tularemia

نەخۆشـیی تولاریمیـا کە بە کـوردی پێـی دەڵـێن کەروێشـکەتا، نەخۆشییەکی پەتایی زۆر ترسناکە، بە هۆی بەکتریایەکی نەخۆشخەر کە پێی دەڵێن فرانسیسیلا تولارنسیس (*Francisella tularensis*)، ڕوو دەدات. بە گشـتی، ئەم نەخۆشـییە تووشـی ئـاژەڵ دەبێـت، بە تـایبەتی کرتێنەرەکـان و کەروێشـکە مـاڵی و کێوییەکـان. هەروەهـا دەشێت باڵندە و مەڕ و بزن و ئاژەڵە ماڵییەکانی وەک سەگ و پشیلە و هامسـتەر (hamster) تووشـی ئەم نەخۆشـییە بـبن. نەخۆشـیی تولاریمیا نەخۆشییەکە سەرچاوەکەی ئاژەڵە. شوێنە سروشتییەکانی مانەوەی، شیردەرە بچکۆلەکانن، لەوانە، مشکی ماڵان، مشکی کێڵگە، جرجی ئاوی، سمۆرە، کەروێشک و کەروێشکی کێوی. ئەم نەخۆشییە بە گشـتی تووشـی پێسـت و چـاو و ڕژێـنە لیمفییەکـان و سـییەکان دەبێت.[1]

ئەم نەخۆشـییە لە نیـوە بـاکوورییەکەی گـۆی زەوی هەیە کە ئەمەریکای باکوور و چەند بەشێکی ئەورووپا و ئاسیا دەگرێتەوە، لەو ناوچانە نەخۆشییەکی ئەوپەڕی باوە.[2]

### مێژووی نەخۆشیی تولاریمیا

* نەخۆشیی تولاریمیا بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٣٦ لە تورکیا ڕاگەیەنراوە، بەڵام بڕوا وایە کە بۆ چەند هەزار ساڵێک لە تورکیا

---

[1] https://www.mayoclinic.org/diseases–conditions/tularemia/symptoms–causes/syc–20378635

[2] WHO Guidelines on Tularemia, WHO Library Cataloguing–in–Publication Data, France, 2007, p.5.

هەبووبێت. بوونی نەخۆشییەک، کە دەشێت تولاریمیا بووبێت، لە سەدەی چواردەیەمی پێش زایینەوە لە ئاناتۆلیای ناوەڕاست، لە سەردەمی هیتییەکاندا، زانراوە. بڕوا وایە کە ئەم نەخۆشییە بە هۆی جەنگ، گەشتکردن، گەنە یان کرتێنەرەکانەوە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بۆ ئاناتۆلیا گواسترابێتەوە.[1]

* جۆرج واڵتەر مەکۆی، کە پزیشکێکی ئەمەریکی بوو، لە تاقیگەی تاعوونی خزمەتگوزاریی تەندروستیی گشتی کاری دەکرد، بۆ یەکەم جار بەکتریای تولاریمیای جیا کردەوە و لە ساڵی ١٩١٢ جیاکردنەوەی بەکتریاکەی ڕاگەیاند. زانایان جەختیان لەوە کردەوە کە تولاریمیا بۆ مرۆڤ زۆر مەترسیدار بێت؛ دەشێت مرۆڤ بە هۆی بەرکەوتنی بە ئاژەڵێکی تووشبوو، تووشی ئەم نەخۆشییە ببێت.[2]

* بەڵگەکانی تووشبوونی مرۆڤ بە نەخۆشیی تولاریمیا، بۆ یەکەم جار، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، نەرویج، ڕووسیا و ژاپۆن دەرکەوتن.

* ساڵی ١٩٥٩، زانا ڕووسییەکان دوو لقەجۆری (subtype) بەکتریای تولاریمیایان (*Francisella tularensis*) دۆزییەوە، ئەوانیش، بەکتریای جۆری A و B بوون. جۆری A لە مرۆڤ و کەروێشکی cottontailدا لە ئەمەریکای باکوور جیا کرایەوە. ئەم جۆرەیان زۆر ژەهراوی بوو. بەکتریای جۆری B، کە بە شێوەیەکی بنچینەیی لە ئەورووپا و ئاسیا دۆزرایەوە، بۆ مرۆڤ ژەهراوی نەبوو، بەڵام جرجی ئاوی و جرجی بیابانی بەکۆمەڵ دەکوشت.

* لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، یەکەی ٧٣١ کە یەکەیەکی چەکی بایۆلۆجیی ژاپۆنی بوو و ناوبانگێکی خراپی هەبوو لە

---

[1] Gurkan, S., Epidemiology of Tularemia, *Balkan MedJ, Vol. 31, No. 1, 2014* , pp. 3–10.

[2] https://en.wikipedia.org/wiki/Tularemia#History

تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر دیلە چینی و کۆرياییەکان، بایەخی خۆیان بۆ گرنگیدان بە نەخۆشیی تولاریمیا دەربڕیبوو.

* لە سالانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠دا، بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا توانای بەکارهێنانی نەخۆشیی تولاریمیایان وەک چەکێکی بایۆلۆجی پەرە پێ دابوو.

* سالّی ١٩٦٥، لە نزیک دوورگەی هاوای، بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، پرژەی تولاریمیای بە هۆی فڕۆکەوە، لەسەر گەلێک مەیموون کە لە سەر پشتی کەشتییەک ڕاگیرابوون، تاقی کردەوە. دوای چەند ڕۆژێک لە تووشبوونی مەیموونەکان، نیوەیان نیشانەکانی تووشبوونیان بە نەخۆشیی تولاریمیا لێ دەرکەوت و زۆرینەی مەیموونە نەخۆشە تووشبووەکان مردن.

* لە سالانی ١٩٦٦–١٩٦٧دا، هەوکردنی سییەکانی مرۆڤ بە ڕادەیەکی زۆر لە سوید بلاو بووەوە کە گەورەترین بلاوبوونەوەی تۆمارکراوی تولاریمیا بوو لە سوید. ٢٧٠٠ حالّەتی تووشبوون بە هۆی بەکتریای *Francisella tularensis*ی جۆری B لە ماوەی بلاوبوونەوەی نەخۆشییەکە تۆمار کرا. فڕێدانی پووش لە کێلگەکان لە زستاندا، بوو بە هۆی بلاوبوونەوەی بەکتریاکە لە هەوادا، ئەمەش کارئاسانیی بۆ تووشبوونی مرۆڤ بە بەکتریاکە کرد.

* سالّی ١٩٦٩، لیژنەی پسپۆڕانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، مەزەندەی ئەوەیان کردووە کە ئەگەر ٥٠ کیلۆگرام لە بەکتریای *Francisella tularensis*، بە شێوەی پرژە، بەسەر شارێکدا بڕژێنرێت کە ژمارەی دانیشتوانەکەی ٥٠٠٠٠٠ کەس بێت، ئەوا ٢٥٠٠٠٠ کەس تووشی پەککەوتوویی دەکات و ١٩٠٠٠ کەسیش دەکوژێت.[1]

---

[1] https://www.globalsecurity.org/wmd/intro/bio–tularemia.htm

* ساڵی ١٩٩٧، سەنتەرەکانی کۆنترۆڵکردن و پاراستن لە نەخۆشییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، مەزەندەی ئەوەی کرد کە ئەگەر ١٠٠٠٠٠ کەس بخرێنە بەر پرژەی بەکتریای فرانسیسیلا تولارێنسیس لە هەوادا، ئەوا دەبێتە هۆی ٨٢٥٠٠ حاڵەتی تووشبوون بە نەخۆشیی تولاریمیا (٥،٨٢٪ تێکڕای تووشبوون) و مردنی ٦١٨٨ کەس (٨٨،٦١٪ تێکڕای مردن) و تێچوونی چارەسەریان لە نێوان ٤٥٦ ملیۆن بۆ ٨،٥٦١ ملیۆن دۆلار دەبێت.[١]

* تولاریمیا یەکێک بوو لەو چەند چەکە بایۆلۆجییەی کە سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە کۆتایی ساڵانی ١٩٦٠دا، لە جبەخانەکانیدا هەڵی گرتبوو و لە ساڵی ١٩٧٣دا لەناوی بردن. یەکێتیی سۆڤییەت، تا سەرەتای ساڵانی ١٩٩٠، بەردەوام بوو لە بەرهەمهێنانی تیرەکانی گەلێک چەکی بایۆلۆجیی وا، کە بەرهەڵستییان بەرامبەر بە دژەزیندە و پێکوتەکان هەبێت.

* لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، لێکۆڵینەوە لە ئەگەری بەکارهێنانی بەکتریای فرانسیسیلا تولارێنسیس وەک چەکێکی بایۆلۆجی لە لایەن ژاپۆنەوە کرا. هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانیش، بۆ هەمان مەبەست، لێکۆڵینەوەیان لەسەر بەکتریای فرانسیسیلا تولارێنسیس کردبوو.[٢]

بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ساڵانە کەمتر لە دوو تەن لە بەکتریای فرانسیسیلا تولارێنسیسی بەرهەم دەهێنا و یەکێتیی سۆڤییەتیش ساڵانە زیاتر لە یەک تەنی بەرهەم دەهێنا.[٣]

---

[1] Hodges,L., and Penn, Robert, L., Tularemia and Bioterrorism, , Springer Science Business Media, Inc., New York, 2005, pp. 71–98.

[2] https://www.jhsph.edu/research/centers–and–institutes/johns–hopkins–center–for–public–health–preparedness/tips/topics/Biologic_Weapons/tularemia2.htm

[3] https://fas.org/programs/bio/factsheets/tularemia.html

**بەکتریای فرانسیسیلا تولاریێنسیس (*Francisella tularensis*)**

بەکتریـای فرانسیسـیلا تولارێنسـس، کە دەبێـتە هـۆی نەخۆشـیی تولاریمیا، بەکتریایەکی بچووکی هەوایی (aerobic)، زۆر هەستیاری، وردی، چیلکەیی شێوەهێلکەییە و قەبارەکەی لە نێوان ٢,٠ X ٢,٠ بۆ ٢,٠ X ٧,٠ مایکرۆمەتردایە (مایکرۆمەتر بەشێک لە یەک ملیۆن بەشی مەترە).[1]

بەکتریـای فرانسیسـیلا تولارێنسـس بەکتریـایەکە سـپۆر دروسـت ناکات و دەتوانێت بۆ ماوەی چەندین هەفتە لە پلەیەکی گەرمیی نزمدا، لە نـاو ئـاو و گڵـی شـێدار و پـووش و کـا، یـان لە نـاو لاکـی ئـاژەڵانی ڕزیودا بمێنێتەوە. ئەم بەکتریایە یەکێکە لە بەکتریا نەخۆشـخەرە درمە هەرە ناسراوەکان. هەڵمژین یان چوونەناوەوەی کەمتر لە ١٠ بەکتریا بۆ ناو لەشی مرۆڤ، دەبێتە هۆی تووشبوون بە نەخۆشییەکە.

بەکتریای فرانسیسیلا تولارێنسیس، دابەش دەبێت بۆ دوو لقەجۆر (subtype)، لقەجـۆری A و لقەجـۆری B. فرانسیسـیلا تولارێنسیسـی لقەجۆری A، لقەجۆرە ئەوپەڕی بـاوەکەیە، کە لە ئەمەریکـای بـاکوور جیا کراوەتەوە (isolated) و دەشێت زۆر مەترسیدار بێت بۆ مـرۆڤ و ئـاژەڵ. لقەجـۆری B کە تـا ڕادەیەک نامەترسـیدارە، بـڕوا وایە کە هـۆی نەخۆشـیی تولاریمیـای هەمـوو مرۆڤەکـان بێت لە ئەورووپـا و ئاسیا.[2]

بەکتریـــای *Francisella tularensis* لە سروشـــتدا هەیە و دەتوانرێـت بـۆ مەبەسـتی تـوێژینەوەی زانسـتی لە ڕێـی کـڕینەوە بە دەست بهێنرێت.[3]

---

[1] a. Hodges,L., and Penn, Robert, L., Tularemia and Bioterrorism, , Springer Science Business Media, Inc., New York, 2005, pp. 71–98. b. http://eknygos.lsmuni.lt/springer/57/71–98.pdf

[2] https://www.jhsph.edu/research/centers–and–institutes/johns–hopkins–center–for–public–health–preparedness/tips/topics/Biologic_Weapons/tularemia2.htm

[3] https://www.globalsecurity.org/wmd/intro/bio–tularemia.htm

## نیشانەکانی تووشبوون بە نەخۆشیی تولاریمیا

نیشـــانەکانی نەخۆشـــیی تولاریمیـــا لە مـــاوەی ٣ بـــۆ ٥ ڕۆژ لە تووشـبوونیەوە دەردەکەون، بەڵام دەشـێت دوای ١٥ ڕۆژ دەربکەون. چەنـــد جۆرێـــک لە نەخۆشـــیی تولاریمیـــا هەیە، هەر جـــۆرێکی ئەم نەخۆشـــییە دەکەوێـــتە ســـەر ئەوەی چـــۆن بەکتریـــای نەخۆشـــییەکە چووەتە ناو لەشی مرۆڤەوە. هەر جۆرێک لەو نەخۆشییانەی تولاریمیا کۆمەڵێک نیشانەی تایبەت بە خۆی هەیە.

نەخۆشـــیی تولاریمیـــا، بەپێـــی ڕێگـــەی تووشـــبوون و نیشـــانەکانی، دەتوانرێـت بـۆ چەنـد جۆرێـک پـۆلێن بکرێـت کە ئەمـانەن: تولاریمیـای برینەڕژێنی، تولاریمیـای ڕژێنی، تولاریمیای چاوەڕژێنی، تولاریمیـای دەمەگەرووی‌ی، تولاریمیـای سـییەهەوکردن، تولاریمیـای گرانەتـایی. چەندین لە نیشانەکانی تووشبوون لە نێوان ئەم جۆرانەدا هاوبەشن.[1]

## جۆرەکانی نەخۆشییەکە و نیشانەکانی

١- تولاریمیـــای برینەڕژێنـــی (Ulceroglandular): جـــۆرە هەرە بـــاوەکەی تولاریمیـــایە و بە گشـــتی بە هـــۆی گەســـتنی گەنە یـــان مێشەئاسکانە (deerfly) ڕوو دەدات یـان دوای ئەوەی دەسـتی مـرۆڤ بەر ئاژەڵە تووشبووەکە دەکەوێت.

* نیشانەکانی:

لە شـوێنی چـوونەژوورەوەی بەکتریـاکە بـۆ نـاو لەش، برینێـک لە سەر پێست دەردەکەوێت.

ئاوسـانی ڕژێنە لیمفییەکـان لە بـن هەنگڵ یـان سـەرەوەی ڕان کە ئازاریشی لەگەڵدا دەبێت.

تا، هەڵلەرزین، سەرئێشە و ماندووبوونێکی زۆر.

---

[1] Croddy, Eric, A., Weapons of Mass Destruction, Volume1 : Chemical and Biological weapons, California, U.S.A., 2005, pp. 290–291

٢- تولاریمیای ڕژێنی (glandular): بە هۆی گەستنی گەنە یان مێشی تووشبووەوە یاخود دەستخستنەناو ئاژەڵی نەخۆش یان مردوو، تووشی مرۆڤ دەبێت. نیشانەکانی ئەم جۆرەیان وەک نیشانەکانی تولاریمیای برینی ڕژێنییە، بەڵام برینی پێستی لەگەڵدا نییە.

٣- تولاریمیای چاوەڕژێنی (Oculoglandular): لەم جۆرەیاندا بەکتریای نەخۆشییەکە، لە ڕێی چاوەوە، دەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە. ئەمەش کاتێک ڕوو دەدات کە کەسێک ئاژەڵێکی تووشبوو بە تولاریمیا سەردەبڕێت و ئاژەڵەکە یان بەشەکانی ئاژەڵەکە بەر چاوەکانی دەکەون.

* نیشانەکانی:

ئازاری چاو، سووربوونەوەی چاو، ئاوسانی چاو و ئاولێهاتنی، دروستبوونی برینێک لە دیوی ناوەوەی پێڵووی چاو، هەستیاربوونی چاو بە ڕووناکی، ئاوسانی ڕژێنە لیمفییەکانی بەردەم گوێیەکان.

٤- تولاریمیای دەمەگەروویی (oropharyngeal): دەمەگەروو ئەو بەشەی گەرووە کە دەکەوێتە نێوان کەناری زمانەبچکۆلە و مەلاشووەوە. ئەم جۆرەیان بە هۆی خواردن یان خواردنەوەی پیسبوو بە بەکتریای نەخۆشییەکە یان خواردنی گۆشتی باشنەکوڵاو ڕوو دەدات. ئەم جۆرەیان کاریگەریی لەسەر قورگ و دەم و کۆئەندامی هەرس هەیە.

* نیشانەکانی:

تا، ئازاری قورگ، چەند برینێکی ناو دەم، ڕشانەوە، هەوکردنی ئاڵووەکان و ئاوسانی ڕژێنە لیمفییەکان لە ملدا.

٥- تولاریمیـــای ســـییەهەوکردن (pneumonic): ئەم جۆرەیـــان مەترسیدارترین جۆری نەخۆشیی تولاریمیایە. بە هۆی هەڵمژینی ئەو تۆزانە یان پرژانەی کە بەکتریای نەخۆشییەکەیان پێوەیە، ڕوو دەدات. هەروەهـــا، دەشـــێت ئەم جۆرەیـــان، بە هـــۆی چارەســـەرنەکردنی شـــێوەکانی تـــری تولاریمیـــا، وەک تولاریمیـــای برینەڕژێنـــی (Ulceroglandular)، ڕوو بـــدات. بەکتریـــای نەخۆشـــییەکە لە ڕێـــی ڕۆیشتنی خوێن بە ناو سییەکاندا بڵاو ببێتەوە.

* نیشانەکانی:

کۆکەی وشک، ئازاری سنگ، هەناسەدان بە قورسی.

٦- تولاریمیای گرانەتایی (Typhoidal): ئەم جۆرە نەخۆشـییەیان جۆرێکی دەگمەن و مەترسیدارە.

* نیشانەکانی:

تـــای بەرز، ئەوپەڕی شـــەکەتبوون، ڕشـــانەوە و ســـکچوون، ئەستووربوونی سپڵ، ئەستووربوونی جگەر، هەوکردنی سییەکان.[1]

**ڕێگەکانی گواستنەوەی بەکتریای نەخۆشیی تولاریمیا بۆ مرۆڤ**

١- گەستنی ئاژەڵە جومگەدارە تووشبووەکان.

٢- بەرکەوتنـــی دەســـت بە شـــانە یـــان شـــلەکانی ئـــاژەڵە تووشبووەکان.

٣- بەرکەوتنی ڕاستەوخۆ یان خواردنەوەی ئاو، خواردنی خۆراک یان گڵی پیسبوو بە بەکتریاکە.

٤- هەڵمژینی پرژەکانی بەکتریاکە لە هەوادا.

---

[1] a.https://www.mayoclinic.org/diseases–conditions/tularemia/symptoms–causes/syc–20378635
b. https://www.cdc.gov/tularemia/signssymptoms/index.html

گواستنەوەی نەخۆشیی تولاریمیا لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر تا ئێستا تۆمار نەکراوە.

لە ژینگەی سروشتیدا، سەرنج دراوە تولاریمیا نەخۆشییەکە بە زۆری لە لادێکان هەیە و چەند نیشانەیەکی هەیە، لەوانە، هەوکردنی ڕژێنەیی، ڕژێنی چاو، قورگ، سییەکان، گرانەتا، شێوەکانی تری هەوکردن.[1]

## بەکتریای فرانسیسیلا تولارێنسس وەک چەکێکی بایۆلۆجیی سەرنجڕاکێش

سەرنج دراوە ئەم بەکتریایە چەکێکی بایۆلۆجیی سەرنجڕاکێش بێت، ئەوەیش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- دەتوانرێت بە ئاسانی بگۆڕرێت بۆ پرژە لە هەوادا.

٢- ژمەتووشبوونێکی ئەوپەڕی کەمی هەیە (نزیکەی ١٠ بەکتریایە).

٣- تووشبووەکە تووشی نەخۆشییەکی کاریگەری درێژخایەن دەکات، هەندێک جار دەبێتە هۆی مردن.

٤- لەگەڵ ئەوەشدا سپۆر دروست ناکات، بەڵام دەتوانێت بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک لە پلەیەکی گەرمیی نزمدا، لە ناو ئاو، گڵی شێدار، پووش و کا یان لە ناو ڕووەک و لاکی ئاژەڵانی ڕزیودا بمێنێتەوە.

٥- تا ڕادەیەک ڕێژەی کوشتنی تووشبوانی کەمە، ئەمەش بەسوودە، کاتێک سەربازانی دووژمن لە نزیک خەڵکی سیڤیل دەبن و بەکتریاکە بڵاو دەکرێتەوە.[2]

---

[1]https://www.jhsph.edu/research/centers–and–institutes/johns–hopkins–center–for–public–health–preparedness/tips/topics/Biologic_Weapons/tularemia2.htm

[2] https://en.wikipedia.org/wiki/Tularemia#History

## ناسینەوەی نەخۆشیی تولاریمیا

دەشێت ناسینەوەی نەخۆشیی تولاریمیا زەحمەت بێت، لەبەر ئەوەی ئەم نەخۆشییە نەخۆشییەکی دەگمەنە و هەندێک لە نیشانەکانی، لەگەڵ نیشانەکانی نەخۆشییەکانی تردا، هاوبەشن. دەشێت پزیشکان بۆ پشکنینی بوونی بەکتریای *Francisella tularensis* لە نەخۆشێکدا، نموونەی خوێن یان بەڵغەمی نەخۆشەکە وەربگرن و چاندن (culturing)ی بۆ بکەن بۆ هاندانی گەشەکردنی بەکتریاکە لە نموونەکاندا و ئینجا ناسینەوەی.

هەندێک جار نەخۆشیی تولاریمیا بە هۆی هەبوونی ئەو دژەتەنانەی کە بەکتریای نەخۆشییەکە لە ناو خوێنی تووشبووەکەدا دروستی دەکات، دەناسرێتەوە. نموونەیەکی خوێنی تووشبووەکە وەردەگیرێت و پشکنینی بۆ دەکرێت، بۆ ئەوەی بزانرێت کە دژەتەنەکانی تایبەت بە بەکتریای نەخۆشەکەی تێدایە یاخود نا. هەبوونی دژەتەنەکانی تایبەت بە بەکتریای تولاریمیا ئەوە دەردەخات کە نەخۆشەکە تووشی نەخۆشیی تولاریمیا بووە. بەڵام ئەم دژەتەنانە دوای چەند هەفتەیەک لە تووشبوون بە نەخۆشییەکە دروست دەبن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ناتوانرێت لە سەرەتای تووشبوون بەم نەخۆشییەوە، بە هۆی دژەتەنەکانەوە، نەخۆشییەکە بناسرێتەوە. هەروەها دەشێت تووشبووەکە تیشکی ئێکسرەی (x-ray) سنگی بۆ بکرێت بۆ گەڕان بەدوای نیشانەکانی هەوکردنی سییەکانیدا.[١]

## چارەسەرکردن

حاڵەتەکانی تووشبوون بە نەخۆشیی تولاریمیا، بە دژەزیندەکان چارەسەر دەکرێت، لەوانە: ستریپتۆمایسین (Streptomycin)، جێنتامیسین (gentamicin)، دۆکسیسایکلین (doxycycline) و

---

[1] https://www.mayoclinic.org/diseases-conditions/tularemia/diagnosis-treatment/drc-20378639

سیپرۆفلۆکساسـین (Ciprofloxacin). دەتوانرێـت لە مـاوەی دوو کاژێردا پشکنینی سـەرەتایی بـۆ تووشـبوان بە تولاریمیا بکریت، بەڵام بۆ دڵنیابوون لە نەخۆشییەکە، ٢٤ بۆ ٤٨ کاژێری تری دەوێت. تێکڕای مردن، ئەگەر چارەسەری لەگەڵدا بێت، کەمتر لە ٢٪ە.[1]

[1] https://fas.org/programs/bio/factsheets/tularemia.html

## تای کیو – Q fever

تای کیو نەخۆشییەکە بە هۆی بەکتریای کۆکسیلا بورنیتی (*Coxiella burnetii*)یەوە تووشی ئاژەڵ و مرۆڤ دەبێت. بەکتریای کۆکسیلا بورنیتی بەکتریایەکی دەگمەنە، بەڵام دەشێت لە ڕەشەوڵاخ، بزن، مەڕ و هەندێک شیردەری ماڵیدا، وەک سەگ و پشیلە، بدۆزرێتەوە. تووشبوون بە نەخۆشیی تای کیو، بە هۆی هەڵمژینی خانەی بچووکی شێوە سپۆری بەکتریایی یان بەرکەوتن بە شیر و میز و پیسایی و لینجەزێ و تۆوی ئاژەڵە تووشبووەکانەوە دەبێت. ئەم نەخۆشییە بە دەگمەن بە هۆی گەنەوە دەگوازرێتەوە. هەڵمژینی ١ تا ١٠ بەکتریای کۆکسیلا بورنیتی، بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ یان ئاژەڵ تووشی نەخۆشیی تای کیو ببێت. بەکتریای تای کیو، مشەخۆرێکی نەخۆشخەری ناوخانەییە. تای کیو نەخۆشییەکی ئەوپەڕی گوازراوەیە، بەڵام زۆر بە دەگمەن دەبێتە هۆی مردن و دەشێت وەک هۆکارێکی پەکخەر، لە هێرشی بایۆلۆجیدا بەکار بهێنرێت.[١]

سەنتەرەکانی کۆنترۆڵکردن و پاراستن لە نەخۆشییەکان (CDC) لە ئەمەریکا، هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجییان، بەگوێرەی ئەو هەڕەشانەی دروستی دەکەن، بەسەر سێ گرووپدا دابەش کردووە کە بریتین لە گرووپەکانی A و B و C و تای کیویان لە گرووپی Bدا داناوە (لە سەرەتای ئەم بەشەدا، بە درێژی باسی بنچینەکانی ئەم دابەشکردنە کراوە). نەخۆشیی تای کیو نەخۆشییەکی ئاژەڵییە، ئەوپەڕی درمە و لە زۆرینەی ناوچەکانی جیهاندا بڵاوە، جگە لە نیوزیلەندە.[٢]

---

[1] Lesson, K., Medical Association for Prevention of War www.mapw.org.au

[2] – Madariaga, M. G., and Co–workers, Q fever: a biological weapon in your backyard, THE LANCET Infectious Diseases Vol. 3 November 2003, 709–721.

## مێژووی تای کیو

* تـای کیـو، بـۆ یەکەم جـار لە سـاڵی ١٩٣٥دا، لە لایەن دکتـۆر ئێدوارد هۆڵبروک دێریک پێشنیاز کراوە، بۆ باسکردنی نەخۆشییەک کە لە ناو قەسـابەکانی قەسابخانەی بریسبان لە کوینزلاند، ئوسـتراليا بڵاو بووبووەوە. پیتی کیو Q بۆ وشـەی "query" دەگەڕێتەوە کە بە مانای پرسیار دێت و لەو سەردەمەدا بۆ ناوی تایەکە بەکار هێنراوە، چونکە هۆکاری نەخۆشییەکە نەزانراوە.[1]

* هۆکـاری نەخۆشـیی تـای کیـو لە سـاڵی ١٩٣٧دا دۆزراوەتەوە، ئەوەیـش کاتێـک فرانـک ماکفـارلین و مـاڤیس فریمـان بەکتریـای نەخۆشییەکەیان لە نەخۆشێکی ئێدوارد دێریک جیا کردەوە.[2]

* بەکتریای تای کیو، کۆکسیلا بورنیتی (*Coxiella burnetii*)، بە نـاوی دوو پسـپۆڕی بـایۆلۆجییەوە نـاو نـراوە، هیراڵـد ڕی کۆسـی بەکتریـازانی ئەمەریکـی و فـراک ماکفـارلین بـورنیتی ڤایرۆسـزانی ئوستراڵی.[3]

* لە سـەرەتادا وا بیـر دەکرایەوە کە تـای کیـو هەر لە ئوسـتراليا هەبێت، بەڵام سـاڵی ١٩٣٩، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ماوەی لێکۆڵینەوە لە هۆکاری تایەک کە پێی دەوترا تـای ٩–میل، لە ویلایەتـی مۆنتانـا دۆزرایەوە، دەرکەوت کە ئەم تـای ٩–میلە تـایەکی ئاژەڵانی کێوییە و لەوێش هەیە.

[1] Maurin, M., and Raoult, D., Clin Microbiol Rev., 1999 Oct; 12(4): 518–553.

[2] Burnet, F.M., and Freeman, M., Experimental Studies on the Virus of " Q Fever" , Medicinal Journal of Australia, 1937, 299–305.

[3] Maurin, M., and Raoult, D., Clin Microbiol Rev., 1999 Oct; 12(4): 518–553.

**بەکتریای تای کیو، کۆکسیلا بورنیتی (*Coxiella burnetii*) وەک چەکێکی بایۆلۆجی**

* بەکتریای کۆکسیلا بورینتی هەموو ئەو مەرجانەی تێدایە کە بکرێت بە چەکی بایۆلۆجی:

١- دەبێتە هۆی پەککەستنێکی بەردەوام.

٢- دەتوانرێت برێکی زۆری لێ بەرهەم بهێنرێت.

٣- لە حاڵەتی بەرهەمهێنان و هەڵگرتنی لە جبەخانە و گواستنەوەی، بە جێگیری دەمێنێتەوە.

٤- دەتوانرێت بکرێت بە پرژە و بە شێوەیەکی کارامە برێکی زۆری لێ بڵاو بکرێتەوە.

٥- دوای بڵاوکردنەوەی بۆ ماوەی چەندین ساڵ بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

هێرشکردن بە بەکتریای کۆکسیلا بورینتی، دەبێتە هۆی نەخۆشییەک کە وەک نەخۆشیی ئاسایی وایە. کاتێک ئەم بەکتریایە دەکرێتە پرژە، توانای نەخۆشخستنی زیاد دەبێت. دەشێت تەنها یەک بەکتریا ببێتە هۆی نەخۆشی. ئەگەری ئەوە کەمە کە ئاو یان خۆراکی پیسبوو بەو بەکتریایە، هەڕەشە دروست بکات. ئەگەر بەکتریای کۆکسیلا بورینتی دژی هێزەکانی سوپا بەکار بهێنرێت، ئەوا دەبێتە هۆی پەککەستنی ٢٣٪ بۆ ٧٧٪ی هێزەکانی سوپاکە. ئەگەر ئەم بەکتریایە دژی دانیشتوانی سیڤیل بەکار بهێنرێت، ئەوا دەشێت لە ڕێژەی تووشکردنی دانیشتواندا، کێبڕکێ لەگەڵ نەخۆشیی پیسەکواندا بکات، هەرچەندە ڕێژەی مردن بەو بەکتریایە کەم دەبێت. نەخۆشیی تای کیو دەبێتە هۆی نەخۆشیی توندی درێژخایەنی بەرفراوان.

* ڕوون نییە، تای کیو لە جەنگی دووەمی جیهاندا وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار هێنرابێت، بەڵام چەندین حاڵەتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، لە ماوەی ئەم جەنگەدا، گومانی ئەوەی لێ دەکرا کە ئەم نەخۆشییە نەخۆشیی تای کیو بووبێت. زۆرینەی حاڵەتەکانی

بڵاوبـــوونەوەی ئەم نەخۆشـــییە دەدرایە پـــاڵ هەڵمژینـــی تـــۆز کە بە شێوەیەکی سروشتی بەکتریای کۆکسیلا بورنیتیی هەڵگرتبێت. لێرەدا چەنـد نمـوونەیەک دەخەیـنە ڕوو، کە تـای کیـو، لە مـاوەی جەنگـی دووەمی جیهاندا، چەندین جار لە ناو سەربازانی سوپا شـەڕکەرەکاندا بڵاو بووەتەوە.

• سـاڵی ١٩٤١، ٦٠٠ سـەربازی ئەڵمـانی لە باشـووری یوگسـلاڤیا تووشـی تـای کیـو بـوون، بەڵام ئەو کـاتە نەخۆشـییەکە پێـی دەوتـرا ئەنفلونزای هەوکردنی بۆریچکەی هەوای سییەکان.

• ساڵی ١٩٤١، ١٠٠٠ سەربازی ئەڵمانی لە بولگاریا، ئیتالیا، یۆنـان، کۆرسـیکا، ئۆکرانیـا و یوگسـلاڤیا تووشـی نەخۆشـییەک بووبـوون کە پێی دەوترا ئەنفلونزای بەڵقان؛ لە ڕاستیدا نەخۆشییەکە تای کیو بووە، چونکە سەربازەکان لەسـەر پووش و کـای پیسـبوو بە بەکتریـای تـای کیو نوستبوون.

• سـاڵانی ١٩٤٤–١٩٤٥، ١٧٠٠ سـەربازی هاوپەیمانـان لە ئیتالیـا (زۆرینەی سەربازەکان ئەمەریکی بوون) تووشی نەخۆشیی تـای کیو بووبوون، چونکە کا و پووشـیان بەکـار هێنـابوو بۆ ئەوەی لە سـەری بخەون.

• سـاڵی ١٩٤٥، پێـنج بەتـالیۆن لە سـەربازانی ئەمەریکـی و ٥٠٠ سەربازی بەریتانی لە باشووری ئیتالیـا، تووشـی تـای کیـو بووبـوون. ئەو سەربازانە، کە لە ئیتالیا لە کەشتی دابەزیبوون، لە نزیـک شـوێنێک مابوونەوە کە شوێنی لەوەڕاندنی مەڕ و بزن بوو.[1]

* ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا لە بەرنـامەی پەلامـاردان بە چەکی بایۆلۆجیدا، کە لە ساڵی ١٩٤٢ دەستی پێ کردبوو، تـای کیوی لە نـاو لیسـتی ئەو هۆکـارە بایۆلۆجییـانەدا دانـابوو کە دەکرێـت وەک

---

[1] Madariaga, M. G., and Co–workers, Q fever: a biological weapon in your backyard, THE LANCET Infectious Diseases Vol. 3 November 2003, 709–721.

چەکێکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێن. لە ساڵانی ١٩٦٩–١٩٧٠دا، ویلایەتە یەکگرتووەکان کۆتایی بەم بەرنامەیەی چەکی بایۆلۆجی هێنا.[١]

* بەرنـامەی چەکـی بـایۆلۆجیی یەکێتیـی سـۆڤییەت لە کۆتـایی سـاڵانی ١٩٢٠ دامەزرابـوو. وەک بـاس دەکـرا، یەکێتیـی سـۆڤییەت لە پێش جەنگی دووەمی جیهان، تای کیوی کردبوو بە چەکـی بـایۆلۆجی. ئەم بەرنـامەیە تـاکو سـەرەتای سـاڵانی ١٩٩٠ بەردەوام بـوو، بەڵام دوای لێکهەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤییەت، کۆتایی هات.

* تاقمی ئایینیی ئوم شینریکیۆی ژاپۆنی، کە ناوبانگێکی خراپیـان دەرکردبوو لەسـەر ئەوەی لە ئازاری سـاڵی ١٩٩٥دا بە گازی سـارین هێرشـیان کردبـووە سـەر میتـرۆی تۆکیـۆ، لەو کـاتەی کە حکـومەتی ژاپـۆن سـەرگەمی لێکهەڵوەشـاندنەوەیان بـوو، تـاقمەکە توێژنەوەیـان لەسـەر چەنـد هۆکـارێکی جەنگی بـایۆلۆجی دەکـرد، لەوانە، بەکتریـای کۆکسیلا بورنیتی.[٢]

### گواستنەوەی نەخۆشیی تای کیو

* بێگومان ئەم نەخۆشییە لە ڕێی بەکتریـای کۆکسـیلا بورینتییـەوە دەگــوازرێتەوە. ئەم بەکتریــایە بەرگەی گەرمــی و وشــکبوونەوە و پاکژکەرەوەکان دەگرێت. بەکتریای کۆکسـیلا بـورینتی هۆکـارێکی زۆر درمە، یەک بۆ دە بەکتریا بەسە بۆ ئەوەی مـرۆڤ یـان ئـاژەڵ تووشـی نەخۆشییەکە بکات.

* مرۆڤ کاتێک تۆزێک هەڵدەمژێت کە بە پیسـایی، میز، شـیر یـان بەرهەمەکـانی زاوزێـی ئـاژەڵی پـیس بووبێـت و بەکتریـای کۆکسـیلا بورینتیی تێدا بێت، تووشی نەخۆشییەکە دەبێت.

---

[1] Noah, Donald L., and co–workers, The history and threat of biological warfare and terrorism, Emerg Med Clin North Am. 2002 May; 20(2):255–71

[2] – Madariaga, M. G., and Co–workers, Q fever: a biological weapon in your backyard, THE LANCET Infectious Diseases Vol. 3 November 2003, 709–721.

* دەشێت مرۆڤ، بە هۆی خواردنی بەرهەمە شیرەمەنییە پیسبووەکان بە بەکتریای کۆکسیلا بورینتی یان پەستەرەنەکراوەکان، تووشی نەخۆشییەکە ببێت.

* بە دەگمەن تای کیو لە دایکەوە بۆ کۆرپەلەکەی یان لە ڕێی سێکسکردنەوە دەگوازرێتەوە.

* هەندێک پیشە ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشییەکە زیاد دەکەن، وەک پزیشکی ڤێترنەری، گۆشتفرۆش، کرێکارانی کارگەکانی بەرهەمە شیرەمەنییەکان، جووتیارانی بەخێوکەری ئاژەڵ و ئەو توێژەرانەی لەو شوێنانە کار دەکەن کە مەڕ و بزنیان لێیە.

### نیشانەکانی تووشبوون

نزیکەی ٥ کەس، لە هەر ١٠ کەسێک کە تووشی بەکتریای کۆکسیلا بورینتی دەبن، نەخۆش دەکەون. نیشانەکانی تووشبوون بە نەخۆشییەکە دوای ٢ – ٣ هەفتە لە تووشبوون بە بەکتریاکە دەردەکەون. نیشانەکانیش، ئەمانەن:

تالێهاتن

هەڵلەرزین یان ئارەقکردنەوە

ماندوێتی (هەستکردن بە شەکەتی)

سەرئێشە

ئازارەکانی ماسوولکە

دڵتێکەڵهاتن، ڕشانەوە یان سکچوون

ئازاری سنگ

ئازاری گەدە

کەمبوونی کێش

کۆکەی بێ بەڵغەم

دەشێت نیشانەکان مامناوەندی یاخود توند بن. ئەوانەی بە توندی تووشی نەخۆشییەکە دەبن، لەوانەیە تووشی هەوکردنی سییەکان یان هەوکردنی جگەریش ببن.

### تای کیوی درێژخایەن

ڕێژەیەکی سەدیی زۆر کەم (کەمتر لە ٥٪) لەوانەی بە هۆی بەکتریای کۆکسیلا بورینتی تووشی نەخۆشیی تای کیو دەبن، نەخۆشییەکەیان تەشەنە دەسێنێت و لێیان پیس دەکات و تووشی تای کیوی درێژخایەن دەبن. نەخۆشیی تای کیوی درێژخایەن، چەند مانگێک یان چەند ساڵێک دوای یەکەم تووشبوون بە تای کیو، تەشەنە دەسێنێ. ئەوانەی تووشی نەخۆشیی تای کیوی درێژخایەن دەبن، بە زۆری تووشی هەوکردنی یەک زمانەی دڵ یان زۆرتر دەبن، کە پێی دەوترێت هەوکردنی پەردەی ناوەوەی دڵ (endocarditis). ئەوانەی تووشی هەوکردنی پەردەی ناوەوەی دڵ دەبن، تووشی ئارەقکردنەوەی شەوانە، ماندوێتی، تەنگەنەفەسی، کەمبوونەوەی کێشی لەش یان ئاوسانی چوارپەل دەبن. ئەوانەی خزمەتگوزاریی تەندروستی پێشکەش دەکەن، پێویستە زنجیرەیەک پشکنین بۆ نەخۆشەکە بکەن، بۆ ئەوەی نەخۆشیی هەوکردنی پەردەی ناوەوەی دڵ دەستنیشان بکەن.

نەخۆشیی تای کیو نەخۆشییەکی مەترسیدارە، دەشێت کوشندە بێت ئەگەر بە شێوەیەکی دروست چارەسەر نەکرێت. ئەوەی تووشی نەخۆشیی تای کیوی درێژخایەن دەبێت، پێویستی بە چەندین مانگ چارەسەرکردن بە دژەزیندە هەیە، بۆ ئەوەی چاک ببێتەوە.

ئەگەری ئەوە زۆرە کە ئەوانەی نەخۆشیی زمانەی دڵ، نائاساییبوونی بۆریی خوێنیان هەیە، یان کۆئەندامی بەرگریی لەشیان لاوازە، تووشی نەخۆشیی تای کیوی درێژخایەن ببن. ئەو ژنانەی کە لە کاتی دووگیانیدا تووشی نەخۆشیی تای کیو دەبن، ئەگەری ئەوە زۆرە کە نەخۆشییەکە لێیان پیس بکات و ببێت بە تای کیوی درێژخایەن.

## چارەسەرکردن

* زۆرینەی ئەوانەی تووشی نەخۆشیی تای کیو دەبن، بەبێ چارەسەرکردن بە دژەزیندە چاک دەبنەوە.

* لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانەی تووشی نەخۆشیی تای کیو دەبن، وا باشە کە بۆ ماوەی دوو هەفتە چارەسەری دژەزیندەی دیکسۆسایکلین (dexocycline) وەربگرن.

## تای کیوی درێژخایەن

* ئەم تایە هەڕەشە لەسەر ژیانی تووشبووەکە دروست دەکات، دەبێت تووشبووەکە چەند مانگێک چارەسەر وەربگرێت.

* چارەسەرەکەش بە تێکەڵێک لە دژەزیندە دەکرێت، لەوانە، دیکسۆسایکین و هایدرۆکسی کلۆرۆکوین (hydroxychloroquine)، کە تووشبووەکە دەبێت بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک وەریان بگرێت.[1]

[1] https://www.cdc.gov/qfever/symptoms/index.html

## مقاو – Glanders

مقـاو (نەخۆشـیی ولاخەبەرزە)، نەخۆشـییەکی درمە و بە هـۆی بەکتریـای بورکۆڵـدیریا مـالای (*Burkholderia mallei*)، بە پـلەی یەکەم تووشـی ئەسـپ دەبێـت. نەخۆشـیی مقـاو تووشـی مـرۆڤیش دەبێـت. هەروەهـا، تووشـی گوێـدرێژ، ئێسـتر، شـێر، مشـک و بەرازی گینیـا دەبێـت. ئەم نەخۆشـییە، بە شـێوەیەکی سروشـتی، بە هـۆی شیردەری تری وەک بزن و سەگ و پشیلەوە دەگوازرێتەوە.[1]

### کورتەمێژوویەکی مقاو

* مقـاو نەخۆشـییەکی چـاخە کۆنەکـانە و یەکێکە لە کـۆنترین ئەو نەخۆشییانەی کە باس کراوە.

* لە دەوروبەری ساڵی ٤٥٦ی پێش زایینـدا ئەبیکرات نیشـانەکانی ئەم نەخۆشییەی تۆمار کردووە.

* ئەرەسـتۆ، سـاڵی ٣٥٠ی پـێش زایـین، نـاوی "میلـیس (melis)"ی لەم نەخۆشییە ناوە.

* وا پێشـنیاز دەکرێـت کە مقـاو هـۆی شەشـەم تـاعوونی میسـر بووبێت، وەک لە کتێبی تەوراتدا باس کراوە.

* مقــاو، تــاکو ســەرەتای ســەدەی نــۆزدەیەم، بە شــێوەیەکی بەرنامەبۆدارێژراو لێی نەکۆڵراوەتەوە.

* بە هـۆی ئەو کێشـە گەورەیەی کە مقـاو لە نـاو ئەسـپەکانی سەربازە سوارە فەرەنسـییەکاندا خوڵقاندبووی، شـا لویسـی پانزەیەم، یەکەم خوێندنگـەی ڤێترنەریـی لە شـاری لیـۆن لە فەرەنسـا دامەزرانـد.

---

[1] https://www.cdc.gov/glanders/bioterrorism/index.html

زۆر لە توێژەرە سەرەتاییەکان، لە ماوەی لێکۆڵینەوەکانیان لە مقاو، تووشی نەخۆشییەکە بوون و مردن.

* لە ماوەی شەڕی ناوخۆ لە ئەمەریکا، هەزاران ئەسپ کە لە وێستگەکانی هەردوو لای شەڕکەر، یەکێتیخوازەکان (Unionists) و کۆنفیدراڵیخوازەکان، مۆڵ درابوون، مقاو تا ڕادەیەک وەک پەتایەک بە ناویاندا بڵاو بووبووەوە. دوای شەڕی ناوخۆ، هەردوو لا ئەسپەکانیان فرۆشت و ئەو ئەسپانەی تووشی مقاو بووبوون، بوون بە سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی مقاو، هەرچەندە لەو سەردەمەدا هۆکاری نەخۆشیی مقاو نەزانرابوو و دوای ١٧ ساڵ دۆزرایەوە.

* ساڵی ١٨٨٢، پسپۆڕانی ئەڵمانی لۆیفلەر (Loeffler) و شوتس (Schutz)، هۆکاری نەخۆشیی مقاو، کە بەکتریای بورکۆڵدیریا مالاییە (*Burkholderia mallei*)، لە جگەر و سپڵی ئەسپێکی تووشبوو بە مقاویان جیا کردەوە.

* ئێستا ئەم نەخۆشییە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا نەماوە. هەرچەندە وڵاتانی پێشکەوتوو نەخۆشیی مقاویان تێدا نەماوە، بەڵام ئەمەریکای باشوور و ناوەڕاست، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەندێک بەشی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو ناوەندی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییەیان تێدا نیشتەجێیە.[١]

## مقاو وەک هۆکارێکی چەکی بایۆلۆجی

* دەتوانرێت مقاو وەک چەکێکی بایۆلۆجی دژی مرۆڤ و ئاژەڵی کشتوکاڵی بەکار بهێنرێت.

---

[1] Lindler, Luther E., Lebeda, Frank J, & Korch, George W., Biological Weapons Defense, Humana Press Inc., New Jersey , 2005, p.209– 210

* لە جەنگی یەکەمی جیهاندا، ئەڵمانیا نەخۆشیی مقاوی لە بەرەی ڕۆژهەڵات بڵاو کردەوە، بۆ ئەوەی ئەسپ و ئێستری ڕووسەکان تووشی ئەم نەخۆشییە بین.

* لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهاندا، سیخوڕەکانی ئەڵمانیا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، نەخۆشیی مقاویان بە ناو ئەو ئەسپ و ماڵاتەی ئەمەریکییەکاندا بڵاو دەکردەوە کە بە کەشتی بە زەریای ئەتڵەسیدا بۆ فەڕەنسا دەگوازرانەوە.

* لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، ژاپۆنییەکان پەرەیان بە نەخۆشیی مقاو دا، بۆ ئەوەی دژی ئەسپ و خەڵکی سیڤیل و دیلەکانی جەنگ بەکاری بهێنن.

* لە ساڵانی ١٩٤٣–١٩٤٤دا، بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا توێژینەوەیان لەسەر مقاو دەکرد، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکاری بهێنن، بەڵام هەرگیز مقاویان نەکرد بە چەکی بایۆلۆجی.

* بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی یەکێتیی سۆڤییەت پەرەیان بە هەندێک لە تیرەکان (strains)ی مقاو دا، بۆ ئەوەی بەرگری بەرامبەر دژەزیندەکانی مقاو پەیدا بکەن، واتە ئەو دژەزیندانەی بۆ چارەسەری مقاو بەکار دەهێنرێن، چیتر سوودیان بۆ چارەسەرکردنی مقاو نەبێت.

* هەندێک ڕاپۆرت ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە سوپای سۆڤییەت لە ئەفغانستان، لە ساڵانی ١٩٨٠دا، مقاوی لە هەندێک هێرشی بچووکدا دژی ئەفغانییەکان بەکار هێنابێت.[1]

---

[1] a. https://www.globalsecurity.org/wmd/intro/bio–glanders.htm
b. Tang, Ye–Wei, and Co–others, Molecular Medical Microbiology, Academic Press, London, UK, 2015, p.771

**نەخۆشیی مقاو**

نەخۆشـــیی مقـــاو، بە هـــۆی بەکتریـــای بورکۆڵـــدیریا مـــالای (*Burkholderia mallei*) ڕوو دەدات، بەکتریـــای بورکۆڵـــدیریا مـــالای بەکتریایەکی شێوەچیلکەی زیندەهەواییە، نە دەجووڵێت، نە بەرگپۆشـە و نە سـپۆریش دروسـت دەکـات. درێـژییەکەی ١ – ٥ مـایکرۆن و پانییەکەشـــی ٠,٣ – ١ مـــایکرۆنە. ئەم بەکتریـــایە، هۆکـــارێکی نەخۆشـخەری بنەچەئاژەڵییە و لە نـاو خانەدایە. خانەخوێی سـەرەکیی ئەم بەکتریـایە، ئەسـپ، ئێسـتر و گوێـدرێژن. شـیردەرەکانی وەک خێزانـی پشـیلەکان، لە پشـیلە ماڵییەکـانەوە تـاکو شـێر، بە هـۆی ئەم بەکتریایەوە تووشی مقاو دەبن. هەروەها ئەم بەکتریایە دەتوانێت بۆ ماوەیەکی درێژ، لە دەرەوەی خانەخوێیەکەیدا، بە زیندوویی بمێنێتەوە، ئەمەش پشت بە چەندین هۆکار دەبەستێت. ناتوانرێت زانیـاریی ورد دەربـارەی ڕێـژەی تووشـبوون و مـردن بەم نەخۆشـییە لە ئاژەڵانـدا دیـاری بکرێـت، چـونکە ئـاژەڵە تووشـبووەکان بە ڕێـگەی کوشـتنی بێئـازار لەنـاو دەبـرێن، بۆ ئەوەی ڕێ لە بڵاوبـوونەوەی نەخۆشـییەکە بگیرێـت؛ لەگەڵ ئەوەشـدا، گومـان دەکرێـت کە ڕێـژەی مـردن بە نەخۆشییەکە بەرز بێت. شێوەی توندی نەخۆشـییەکە، لە ئاژەڵانـدا، لە مـاوەی چەنـد ڕۆژێکـی کەم بـۆ ١ – ٤ هەفـتە، دەبێـتە هـۆی مردنـی ئاژەڵەکان. ڕێژەی مردنی مرۆڤ بەم نەخۆشییە، ٩٥٪ـە.

نەخۆشـیی مقـاو بـۆ سـێ شـێوە پـۆلێن دەکرێـت کە ئەم شـێوانە، هەریەکەیـــان بە جیـــا، یـــان بە زۆری بە شـــێوەیەکی پێکەوەیـــی لە نەخۆشـــەکەدا دەردەکەون، شـــێوەکانیش بـــریتین لە: مقـــاوی لـــووت، مقـاوی سـی و مقـاوی پێست. مقـاو دەشـێت بە شـێوەیەکی تونـد لە گوێـــدرێژ و ئێســـتر و بە شـــێوەیەکی درێژخـــایەنیش لە ئەســـپدا دەربکەوێت.[1]

---

[1] a. Sellon, Debra ,C., and Long, Maureen, T., Equine Infectious Disease, 2nd edition, printed in China by Saunders, an imprint of Elsevier inc., 2014, p. 333.

### گوێزرانەوەی نەخۆشیی مقاو

بەکتریای مقاو، بورکۆڵدیریا مالای، بە هۆی بەرکەوتنی مرۆڤ بە شانەکان یان شلەکانی لەشی ئاژەڵێکی تووشبوو، بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە. بەکتریاکە لە ڕێگەی برین یان ڕووشانی پێستەوە دەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە. هەروەها، لە ڕێی ناوپۆشەپەردەکانی چاو و لووتیشەوە دەچێتە ناو لەشەوە. دەشێت ئەم بەکتریایە، لە ڕێی هەڵمژینی پرژەی ناو هەوا یان تۆزی هەڵگری بەکتریاکە، بچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە. لە ئەمەریکا، هیچ حاڵەتێکی گوێزانەوەی نەخۆشیی مقاو لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ تۆمار نەکراوە.[1]

لە ئاژەڵدا، باوترین ڕێگەی گواستنەوەی بەکتریای نەخۆشیی مقاو، لە ڕێی خواردنی خواردەمەنیی پیسبوو بە بەکتریاکە، یان خواردنەوەی ئاوێک کە دەردراوەکانی هەناسەدانی تێدا بێت، دەبێت. ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان، بە زۆری، بە هۆی خواردنی گۆشتی نێچیرە تووشبووەکانەوە تووشی نەخۆشیی مقاو دەبن. بەکتریای مقاو دەشێت بە هۆی کراندنی پێست، چڵمینەپەردەکان، هەڵمژینی پرژەکانی ناو هەوا یان بەرکەوتن بە لغاوی ئەسپ و شتی جوانکارییەوە بڵاو ببێتەوە.

دەشێت ئاژەڵان لە ڕێی، پیسایی، میز، لیک یان فرمێسکەوە، بەکتریاکە دەربدەن – تەویلەی ئەسپ، بە شێوەیەکی پچڕپچڕ یان بەردەوام، بەکتریای بورکۆڵدیریا مالای بڵاو دەکاتەوە. دەشێت بوونی ئاژەڵان بە شێوەیەکی چڕ لە شوێنێک، لێکنزیکییان و ژینگەگەلێک کە فشارێکی زۆر بخەنە سەر ئاژەڵان، بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە زیاتر بکەن.

---

b.https://www.aphis.usda.gov/animal_health/emergency_management/downloads/sop/sop_glanders_e–e.pdf

[1] https://www.cdc.gov/glanders/transmission/index.html

**نیشانەکانی نەخۆشیی مقاو**

وەک لە پێشدا باسمان کرد، نەخۆشیی مقاو بە سێ شێوەیە، کە بریتین لە مقاوی لووت، مقاوی سی و مقاوی پێست. نیشانەکانی هەر یەکێکیان جیاوازە لەوی تر. لێرەدا نیشانەکانی هەر یەکێکیان بە جیا باس دەکەین:

١- نیشانەکانی مقاوی لووت

مقاوی لووت بە شێوەیەکی توند ڕوو دەدات و ئەم نیشانە سەرجێییانەی (clinical signs) هەیە:

* بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی و نەمانی ئیشتیهای خواردن.
* هەناسەدان بە قورسی لەگەڵ کۆکین.
* دەرهاویشتنی کێمی لینجی سەوزی زەردباو لە لووتەوە.
* دەرهاویشتنی کێم لە چاوەوە.
* هەبوونی برین و گرێچکە لە ناو ڕێڕەوی لووتدا.
* برینگەلێکی قەتماغەداری شێوەئەستێرەیی.

٢- نیشانەکانی مقاوی سی

مقاوی سی شێوەیەکی ئەوپەڕی باوی مقاوە و دەرکەوتنی نیشانەکانی، لەچاو مقاوی لووتدا، کاتێکی درێژتری پێ دەچێت. ئەم شێوە مقاوە، وەک مقاوی لووت، سروشتێکی توندی هەیە. نیشانە سەرجێییەکانی مقاوی سی:

* کۆکینی وشک
* تەنگەنەفەسی
* هەبوونی گەلێک گرێچکە یان دوومەڵ (کوان) لە ناو سییەکاندا.
* دەشێت هەوکردنی سییەکانیش هەبێت.
* هەوکردنی بەشی سەرەوەی بۆریی هەناسەدان.

٣- نیشانەکانی مقاوی پێست

مقاوی پێست کردارێکی درێژخایەنە -بە پێچەوانەی مقاوی لووت و سی- تووشبوونێکی درێژخایەنی لێ دەکەوێتەوە، کە بە نیشانەی سووک تا نەبینراو دەست پێ دەکات و دەبێتە هۆی حاڵەتێکی هێزلێبڕانی تووشبووەکە. بە زۆری ئەم نیشانانەی لێ دەردەکەون:

* زۆر حاڵەتی لێپیسبوون ڕوو دەدات
* کۆکە
* تالێهاتن
* پەیدابوونی وردەگرێ لە سەر پێست و دڕانی ئەم گرێیانە و کێمکردنیان
* کێمدەردان لە وردەگرێیەکانەوە
* بە هێواشی چاکبوونەوەی وردەگرێیەکان
* گەورەبوونی گرێ لیمفییەکان
* ئاوسانی جومگە.[1]

## پاراستنی ئاژەڵ و مرۆڤ

لە زۆربەی وڵاتان، نەخۆشیی مقاو بە سەرکەوتوویی بنەبڕ کراوە، ئەوەیش بە سەربڕینی ئەو ئاژەڵانەی کە لە پشکنینی مالیین (mallein test)دا ئەنجامەکەی ئەرێنی بێت، واتە نەخۆشیی مقاوی هەبێت. کەرەنتینەکردنی ئەو ئاژەڵانەی دەستیان بەرنەکەوتبێت و پشکنینی ئەسپ پێش بەکارهێنانی، بە ڕێکارگەلێکی پێویست بۆ کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکە دادەنرێن. ڕێسا و یاسای جۆراوجۆری بەرفراوان، لەسەر ئاستی وڵاتان و نێودەوڵەتی هەن، بۆ ئاگادارکردنی ڕێکخراوی

---

[1] a.https://www.aphis.usda.gov/animal_health/emergency_management/downloads/sop/sop_glanders_e-e.pdf
b. Sellon, Debra ,C., and Long, Maureen, T., Equine Infectious Disease, 2nd.edition, printed in China by Saunders, an imprint of Elsevier inc., 2014, pp. 334-535.

جیهانی بۆ تەندروستیی ئاژەڵ و چەندین وڵات لە هەبوونی نەخۆشیی مقاو. هیچ ڤاکسینێک نییە بۆ پاراستنی ئاژەڵان لە نەخۆشیی مقاو. توێژینەوەکانی ئێستا چاویان خستووەتە سەر پەرەپێدانی ڤاکسینێک بۆ مرۆڤ، بۆ بەکارهێنانی لەو حاڵەتەی کە بەکتریای مقاو بکرێت بە چەکێکی بایۆلۆجی و بۆ هێرشکردن یان بۆ کاری تیرۆریستی بەکار بهێنرێت.[1]

### چارەسەرکردن

لەبەر ئەوەی حاڵەتەکانی تووشبوونی مرۆڤ بە مقاو دەگمەنن، زانیاریی سنووردار دەربارەی چارەسەرکردنی مرۆڤ بە دژەزیندە هەیە. سەرنج دراوە کە دەرمانی سەلفادایەزین (Sulfadaiazine) دەرمانێکی کاریگەرە بۆ ئەو ئاژەڵانەی تاقیکردنەوەیان لەسەر کراوە و هەروەها بۆ چارەسەرکردنی مرۆڤی تووشبووش. وێڕای ئەمەش، ئەم دەرمانانەی خوارەوە کار لە بەکتریای 'بورکۆلدیریا مالای'ی نەخۆشیی مقاو دەکەن:[2]

| | |
|---|---|
| تێتراسایکلین | Tetracycline |
| سیپرۆفلۆکساسین | Ciprofloxacin |
| ستریپتۆمایسین | Streptomycin |
| نۆڤۆبایۆسین | Novobiocin |
| جێنتامایسین | Gentamicin |
| ئیمیپینیم | Imipenem |
| سیفترازیدیم | Ceftrazidime |
| سەلفۆنامیدەکان | Sulfonamides |

1 Sellon, Debra ,C., and Long, Maureen, T., Equine Infectious Disease, 2nd.edition, printed in China by Saunders, an imprint of Elsevier inc., 2014, pp. 336.
2 https://www.cdc.gov/glanders/treatment/index.html

## ئاوڵە – Smallpox

زۆر لە شارستانییە کۆنەکان گەلێک تۆماری نووسراویان لە دوای خۆیان بەجێ هێشتووە و هەندێک لەو تۆمارانە باسی نەخۆشییەکانی ئەو سەردەمانەیان کردووە، بەڵام ئەو باسکردنانەی لە تۆمارە کۆنترەکاندا هەن، کەمتر جێگەی متمانەن. سەرچاوەی ئاوڵە نەزانراوە، بەڵام بڕوا وایە کە ئاوڵە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی میسری، نزیکەی سەدەی سێیەمی پێش زایین، ئەوەیش لەسەر ئەو بنچینەیەی کە ئەو لیرانەی لە سەر پێستی سێ مۆمیا دۆزراونەتەوە، لە لیری ئاوڵە دەچن. یەکەم باسکردنی نەخۆشییەک بە نووسراو، کە بە ڕوونی لە نەخۆشیی ئاوڵە بچێت، لە سەدەی چوارەمی زایینی لە چین دەرکەوتووە. هەروەها نووسراوی کۆن کە باسی ئاوڵە بکات، لە سەدەی حەوتەمی زایینی لە هیندستان و لە سەدەی دەیەمی زایینی لە ئاسیای بچووک دەرکەوتوون. هەروەها ئەو نووسراوانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئاوڵە لەو سەردەمانەدا نەخۆشییەکی باو بووە.[1]

### مێژووی ئاوڵە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ

* ساڵی ١١٥٧ی پێش زایین، ڕەمسیسی پێنجەم کە چوارەم فیرعەونی بیستەم خێزانی دەسەڵاتداری فیرعەونەکان بووە، بە ئاوڵە مردووە.

---

[1] a. https://www.cdc.gov/smallpox/history/history.html
b. https://biotech.law.lsu.edu/blaw/bt/smallpox/who/red-book/9241561106_chp5.pdf

* ساڵی ۹۱۰ی زایینی، بۆ یەکەم جار ڕازی، کە پزیشکێکی فارس بووە، ئاوڵەی وەک نەخۆشییەکی بینگەیی (clinical) باس کردووە.
* لە ساڵانی ۱۰۹٦–۱۲۹۱دا، خاچپەرستەکان گواستنەوەی ئاوڵەیان بۆ ئەورووپا خێراتر کردووە.
* لە ساڵانی ۱۵۰۷–۱۵۳۰دا، ئیمپراتۆرییەتەکانی ئازتیک (Aztec) و مایا (Maya) و ئینکا (Inca) بە هۆی ئاوڵەوە لەناو چوون.
* لە ساڵانی ۱٤۰۰–۱۸۰۰ی زایینیدا، ژمارەی مردوان بە ئاوڵە لە ئەورووپا، زیاتر لە پێنجسەد ملیۆن کەس بووە لە سەدەیەکدا.
* ساڵی ۱۷٦۳، ئاوڵە بە مەبەست وەک چەکێکی بایۆلۆجی دژی هاووڵاتیانی ڕەسەنی ئەمەریکا بەکار هێنراوە. (هەندێک سەرچاوە دەڵێن ئەوەی بەکار هێنراوە، تاعوون بووە).
* ساڵی ۱۷۹۸، ئیدوارد جینەر ڤاکسینی ئاوڵەی دۆزیوەتەوە.
* ساڵی ۱۹٦۵، ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی دەستی بە بەرنامەیەکی چڕی بنەبڕکردنی ئاوڵە لە جیهاندا کرد.
* ساڵی ۱۹۷۸، دوایین حاڵەتی تووشبوونی مرۆڤ بە ئاوڵە لە سۆماڵ ڕووی دا.
* ساڵی ۱۹۸۰، ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی گەواهیی بنەبڕکردنی ئاوڵەی لەسەر ئاستی جیهان دا.
* ساڵی ۱۹۸۳، هەموو گەنجینە زانراوەکانی هەڵگرتنی ڤایرۆسی ئاوڵە گوێزرانەوە بۆ دوو سەنتەری هاوکاریکەر و دەسەڵاتپێدراوی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ڕووسیا بوون.
* ساڵی ۱۹۹۳، ڕیزبەندی پێکهاتەی جینۆم (genome sequence)ی ئاوڵە بڵاو کرایەوە.
* ساڵی ۱۹۹۹، ئەنجوومەنی تەندروستیی جیهانی ڕاسپاردەیەک سەبارەت بە دواخستنی لەناوبردنی ئاوڵە دەردەکات، بۆ ئەوەی توێژینەوەی زیاتر لەسەر ڤایرۆسی زیندووی ئاوڵە بکرێت.

* ساڵی ١٩٩٩، ڕێکخراوی کۆچی نێودەوڵەتی ڕاپۆرتێک لەسەر پێداویستییەکانی توێژینەوە لەسەر ڤایرۆسی زیندووی ئاوڵە بڵاو دەکاتەوە.

* ساڵی ١٩٩٩، کەنات ئەلیبیکۆڤ کە پزیشک و مایکرۆبایۆلۆجیست و پسپۆڕێکی چەکی بایۆلۆجیی ڕووسی بووە و ساڵی ١٩٩٢ ڕای کردووە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ڕاپۆرتێکی لەسەر مەترسیی چەکە بایۆلۆجییەکان بۆ سەر مرۆڤ و ژینگە بڵاو کردەوە.

* ساڵی ٢٠٠١، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دواخستنی لەناوبردنی ڤایرۆسی ئاوڵە ڕادەگەیەنێت.

* ساڵی ٢٠٠٩، ڕێکخراوی کۆچی نێودەوڵەتی دووەم ڕاپۆرت لەسەر پێداویستییەکانی توێژینەوە لەسەر ڤایرۆسی زیندووی ئاوڵە بڵاو دەکاتەوە.

* ساڵی ٢٠١١، ئەنجوومەنی تەندروستیی جیهانی، دەنگ لەسەر لەناوبردنی هەموو ئەو گەنجینانەی کە ڤایرۆسی زیندووی ئاوڵەیان تێدا هەڵگیراوە و ڕاگەیەنراون، دەدات.[1]

## کوشندەیی ئاوڵە لە مێژوودا

ئاوڵە بووەتە هۆی لە ناوچوونی چەندین شارستانییەت و کوشتنی دەسەڵاتداران و ملیۆنان کەس، وەک لەم ژمارانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

* لە ماوەی سەدەی هەژدەیەمدا، وا خەملێنراوە کە ئاوڵە ساڵانە چوارسەد هەزار ئەورووپیی کوشتبێت، لەوانە، پێنج پاشای فەرمانڕەوا. هەروەها سێیەکی کوێربوون بە هۆی ئاوڵەوە بووە. لە ٢٠٪ بۆ ٦٠٪ی ئەوانەی تووشی نەخۆشیی ئاوڵە بوون، بەم نەخۆشییە مردوون.

---

[1] PLoS Pathogens, January 2010 , Volume 6 , Issue 1 , e1000727

* لە ماوەی سەدەی بیستەمدا، خەمڵاندنەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئاوڵە بووەتە هۆی کوشتنی سێسەد بۆ چوارسەد ملیۆن کەس.

* لە سەرەتای سالانی ١٩٥٠کاندا ئەوە خەمڵێنراوە کە هەموو ساڵێک پەنجا ملیۆن حاڵەتی تووشبوون بە نەخۆشیی ئاوڵە لە جیهاندا ڕوویان داوە.

* بڕوا وایە کە پەتای ئاوڵەی ژاپۆنی، لە نێوان سالانی ٧٣٥-٧٣٧ی زایینی، سێیەکی دانیشتوانی ژاپۆنی کوشتبێت.

* لە سەرەتای سالانی ١٥٠٠ی زایینی، ئیسپانییەکان بە سەرکردایەتیی هێرناندۆ کۆرتێس گەیشتوونەتە کەناراوی یوکاتان و دوایی بەرەو تینۆچتیتلان ڕۆیشتوون. ئەم ئیسپانییانە کۆیلەیەکی تووشبوو بە ئاوڵەیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتووە. ساڵێک دوای ئەوە، ئاوڵە لە ئەمەریکای ناوەڕاست بڵاو بووەتەوە و بووە بە هۆی کوشتنی ٧٠٪ یان زیاتری دانیشتوانە ئەمەریکییە ڕەسەنەکانی ئەم ناوچەیە.

* لە سالانی ١٥٠٧-١٥٣٠دا، ئیمپراتۆرییەتەکانی ئەزتیک (Azetc) لە مەکسیک و مایا (Maya) لە ئەمەریکای ناوەڕاست و ئینکا (Inca) لە ئەمەریکای باشوور بە هۆی ئاوڵەوە لەناو چوون.

* ساڵی ١٨٤٩ی زایینی، نزیکەی ١٣٪ی مردن لە کەلکەتا، کە شارێکی هیندستانە، بە هۆی ئاوڵەوە بووە.

* لە نێوان سالانی ١٨٦٨-١٩٠٧دا، نزیکەی ٤,٧ ملیۆن مردن لە هیندستان بە هۆی ئاوڵەوە بووە. لە نێوان سالانی ١٩٢٦-١٩٣٠دا، ٩٧٩٧٣٨ حاڵەتی تووشبوون بە نەخۆشیی ئاوڵە هەبووە و ٤٢,٣٪ی تووشبوان، کە دەکاتە ٤١٤٤٢٩، کەس بە ئاوڵە مردوون.

* زۆربەی خەڵک لە ماوەی ژیانیاندا تووشی ئاوڵە دەبن و ٣٠٪ی تووشبوان دەمرن.[1]

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/History_of_smallpox

## ئاولە وەک چەکێکی بایۆلۆجی

* لە سەرەتای سەدەی چواردەیەمدا، هێزە تاتارییەکان لاشەی سەربازە مردووەکان بە نەخۆشیی ئاولەیان هەڵداوەتە ناو ئەو شارانەی گەمارۆیان داون، ئەوەش بۆ لاوازکردن و تێکشکاندنی بەرگریکەرانی ئەو شارە گەمارۆدراوانە. دەشێت ئەمە یەکەم نموونەی جەنگی بایۆلۆجی بووبێت کە هۆکاری بایۆلۆجیی تێدا بەکار هێنرابێت بۆ کوشتن یان بریندارکردنی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان.

* هەروەها ئاولە وەک چەکێکی بایۆلۆجی، لە جەنگەکانی نێوان و فەرەنسییەکان و هیندییەکانی ئەمەریکا (١٧٥٤–١٧٦٧ی زایینی) لە لایەن فەرماندە فۆرت پیت (Fort Pitt)ـەوە بەکار هێنراوە. سەربازە فەرەنسییەکان، ئەو بەتانییانەی کە تووشبوانی نەخۆشیی ئاولە بەکاریان هێنابوون، بەسەر هیندییە ئەمەریکییەکاندا دابەشیان کردوون (هەندێک سەرچاوە دەڵێن کە ئەم بەتانییانە وەک دیاری دراون بە سەرۆکەکانی تیرە هیندییە ئەمەریکییەکان) بۆ ئەوەی نەخۆشیی ئاولە بە ناویاندا بڵاو ببێتەوە. لە ئەنجامدا، پەتای ئاولە بە ناو هیندییە ئەمەریکییە ڕەسەنەکاندا بڵاو بووەتەوە و زیاتر لە ٥٠٪ی هۆزەکانی هیندییە ئەمەریکییەکانی کوشتووە.[1]

## نەخۆشیی ئاولە چییە؟

ئاولە نەخۆشییەکە بە هۆی ڤایرۆسی ئاولەوە (variola virus) تووشی مرۆڤ دەبێت. ئاولە نەخۆشییەکی درمە، واتە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوێزرێتەوە. لە هەر ١٠ کەس کە تووشی نەخۆشیی ئاولە دەبن، سیانیان دەمرن. زۆرینەی ئەوانەی لە نەخۆشیی ئاولە

[1] a. https://www.ijidonline.com/article/S1201-9712(04)00130-4/fulltext#
b. Ken Alibek, Smallpox: a disease and a weapon, International Journal of Infectious Diseases (2004) 8S2, S3—S8

چاک دەبنەوە، جێی کۆنەبرین، بزماتە (scar)، بۆ هەمیشە لە سەر ڕووبەرێکی زۆرینەی جەستەیان بەجێ دەمێنێت، بە تایبەتی لە سەر دەموچاویان. هەندێک لەوانەی چاک دەبنەوە، کوێر دەبن. ئاوڵە لە ساڵی ١٩٧٧ـەوە، بە هۆی کوتانەوە، لەسەر ئاستی جیهان بنەبڕ کراوە.

پێش ئەوەی ئاوڵە بنەبڕ بکرێت، نەخۆشییەکە لە ڕێی پەیوەندی و ڕووبەڕوو و بەریەکەوتنی ڕاستەخۆی نێوان مرۆڤەکانەوە دەگوازرایەوە. ئەوانەی تووشی نەخۆشیی ئاوڵە دەبن، تەنها بە دەرکەوتنی برین لە ناو دەم و قورگیان، دەبن بە گوێزەرەوەی نەخۆشییەکە بۆ کەسانی تر (سەرەتای دەرکەوتنی لیر). کاتێک ئەو تووشبووانە دەکۆکن یان دەپژمن و پرژە لە دەم و لووتیان دێتە دەرەوە، ئەو پرژانە بە ناو خەڵکدا بڵاو دەبنەوە و تووشی نەخۆشییەکەیان دەکەن. ئەوانەی تووشی نەخۆشیی ئاوڵە دەبن، تاکو دوایین قەتماغە لە سەر برینەکانیان هەڵدەوەرێت، گوێزەرەوەی نەخۆشییەکە دەبن. ئەم قەتماغانە و ئەو شلانەی لە ناو برینەکانی نەخۆشەکانی ئاوڵەدان، ڤایرۆسی ئاوڵەیان تێدایە. ڤایرۆسی نەخۆشییەکە بە هۆی ئەم قەتماغە و شلانەوە یان ئەو شتانەی بەوانە پیس دەبن، وەک کەلوپەلی خەوتن و جلوبەرگ، بڵاو دەبێتەوە. نەخۆشیی ئاوڵە تەنها لە ڕێی مرۆڤەوە بڵاو دەبێتەوە، هیچ بەڵگەیەک نییە کە ئەم نەخۆشییە لە ڕێی مێروو و ئاژەڵەوە بڵاو ببێتەوە.

### نیشانەکانی نەخۆشیی ئاوڵە

ماوەی کڕکەوتن (incubation period): بریتییە لە ماوەی نێوان کەوتنەبەر نەخۆشخەرەکە و دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشییەکە لە نەخۆشەکەدا. لەم ماوەیەدا، تووشبووەکە هیچ نیشانەیەکی لێ دەرناکەوێت و دەشێت هەست بەوە بکات کە تەندروستیی باشە. لەم ماوەیەدا نەخۆشییەکە درم نییە.

ماوەی کڕکەوتن دەشێت لە ٧ بۆ ١٩ ڕۆژ بێت (هەرچەندە تێکڕای درێژیی ئەم ماوەیە ١٠ بۆ ١٤ ڕۆژە)، واتە دوای ٧ یان ١٩ ڕۆژ لە کەوتنەبەر ڤایرۆسی ئاوڵە، نیشانەکان لە تووشبووەکەدا دەردەکەون.

**نیشانە سەرەتاییەکان**

قۆناغی دەرکەوتنی نیشانە سەرەتاییەکان لە ٢ بۆ ٤ ڕۆژە.

نیشانە سەرەتاییەکان ئەمانەن:

تای توند، سەرئێشە و لەشئێشە، هەندێک جار ڕشانەوە. لەم قۆناغەدا تووشبووەکە ئەوەندە نەخۆش دەبێت کە نەتوانێت چالاکییە سروشتییەکانی بکات.

هەندێک جار لەم قۆناغەدا، نەخۆشییەکە درمە.

**سەرەتای لیردەرکردن**

ئەم قۆناغە نزیکەی ٤ ڕۆژ بەردەوام دەبێت.

لەم قۆناغەدا تووشبووەکە نەخۆشییەکە بۆ خەڵکی تر دەگوازێتەوە.

لیرەکان وەک خاڵی سوور لە سەر زمان و ناودەم دەردەکەون. ئەم خاڵە سوورانە، دەبن بە برین و دەکرێنەوە و بڕێکی زۆری ڤایرۆسەکە بە ناو دەم و قوڕگدا بڵاو دەکەنەوە. تووشبووەکە بەردەوام تای دەبێت. هەر کە برینەکانی دەکرێنەوە، لیر لە سەر دەموچاو دەردەکەون، ئینجا بۆ باسک و لاقەکان بڵاو دەبنەوە، پاشان بۆ دەست و قاچەکان. لە ماوەی ٢٤ کاژێردا، لیرەکان بە هەموو لەشدا بڵاو دەبنەوە. کاتێک لیرەکان دەردەکەون، تای تووشبووەکە دەست بە دابەزین دەکات و تووشبووەکەش هەست بەوە دەکات کە تەندروستیی چاکتر بووە.

لە چوارەم ڕۆژدا، برینەکانی سەر پێست پڕ دەبن لە شلەیەکی تەڵخ و بە زۆری لە ناوەڕاستی برینەکاندا قوپاوییەک دروست دەبێت. کاتێک برینەکان پڕ دەبن لە شلە، دەشێت دووبارە تای تووشبووەکە

بەرز ببێتەوە و تاکو قەتماغەی سەر بلۆقی برینەکان لادەچن، تایەکە هەر بە بەرزی بمێنێتەوە.

### خۆپاراستن

پێکـوتە (ڤاکسـین – vaccine) هەیە بـۆ پاراسـتنی مـرۆڤ لە تووشبوون بە نەخۆشیی ئاوڵە. وەک پێشتر باس کرا، ئێستا ئاوڵە لەسەر ئاستی جیهان بنەبڕ کراوە، ئەگەر بڵاو ببێتەوە، ئەوا پێکوتەی ئاوڵە هەیە بۆ پاراستنی مرۆڤ لە تووشبوون بەم نەخۆشییە.[1]

وێـڕای بەکارهێنـانی پێکـوتە، دەتوانرێـت لە ڕێـی دابڕینـی تەندروسـتییانەوە، کەرەنتینـە (quarantine)، ڕێ لە بڵاوبـوونەوەی ئاوڵە بگیرێت. چەند ساڵێک لەوەوپێش، کاتێک نەخۆشیی ئاوڵە لە هیندسـتان بـڵاو بـووەوە، دەسـەڵاتی تەندروسـتیی ویـلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یارمەتیی هیندستانی دا بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەم نەخۆشییە، ئەوەیش لە ڕێی سەپاندنی دابڕینی تەندروستییانەی توند (کەرەنتینەیەکی توند) بەسەر ناوچە تووشبووەکەدا. ڕێگە بە هیچ کەسێک نەدرا کە بچێتە ناو ناوچە تووشبووەکە یان لێی بێتە دەرەوە. لە ئەنجامدا نەخۆشییەکە لەو ناوچەیە دیار نەما.[2]

### ڕێگەکانی بڵاوکردنەوەی ئاوڵە

دەتوانرێت ئاوڵە بە چەند ڕێگەیەک بۆ هێرشی بایۆلۆجی یان کاری تیرۆریستی بەکار بهێنرێت و بڵاو بکرێتەوە:

* پیسکردنی کەلوپەل و خۆراکی جۆراوجۆر بە ڤایرۆسی ئاوڵە.

* بە ئەنقەست بەکارهێنانی تیرۆریستێکی تووشبوو بە ئاوڵە.

* بەکارهێنـانی ئـامێری میکـانیکی بـۆ دروسـتکردنی پـرژە کە ڤایرۆسەکەیان تێدا بێت و بڵاوکردنەوەی پرژەکان لە شوێنێکی کراوە یان داخراودا.

---

[1] https://www.cdc.gov/smallpox/about/index.html

[2] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, p. 32

* بەکارهێنانی ئامێری تەقەمەنیی وەک گوللەتۆپ و بۆمب و مووشەک.

* بەکارهێنانی جووڵەی سروشتیی هەوا لە ناو میترۆ و سایلۆ و بەرزکەرەوەکاندا، بۆ بەرهەمهێنانی پرژە لە هاڕاوەی ڤایرۆسەکە، یان هەڵماندنی گیراوەی شلی ڤایرۆسەکە.

**دەستکاریکردنی ڤایرۆسی ئاوڵە بە ڕێگەی ئەندازەی بۆماوەزانی**

بەرهەمهێنانی ڤایرۆسی دەستکاریکراو بە ڕێگەی ئەندازەی بۆماوەزانی لە ئێستادا بووەتە ڕێگەیەکی باو. ئامانجەکانی دەستکاریکردنی ڤایرۆس بە ڕێگەی ئەندازەی بۆماوەزانی، ئەمانەن:

* دەستکەوتنی زانیاریی جینی بە مەبەستی چارەسەرکردن یان بۆ گۆڕینی ڤایرۆسەکە، بۆ ئەوەی وەڵامدانەوەی بەرگریی خانەخوێی ڤایرۆسەکە (مەبەست ئەو کەسەیە تووشی ڤایرۆسەکە بووە)، گۆڕانی بەسەردا بێت.

* کورتکردنەوەی ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە، ئەوەیش بە چاککردنی پێوەنووسانی ڤایرۆسەکە بە خانەی خانەخوێ و خێراترکردنی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەکە لە ناو خانەکانی تووشبووەکەدا.

* کەمکردنەوەی ژەمی تووشبوون بە ڤایرۆسەکە و زیاترکردنی ڕێژەی کوشتنی تووشبووەکان.

* بەهێزکردنی ترسناکی ڤایرۆسەکە و زیادکردنی نیشانەکانی نوێی تووشبوون و زیادکردنی کوشندەیی ڤایرۆسەکە، ئەوەیش بە زیادکردنی ئەو شوێنانەی لەشی تووشبووەکە کە تووشی نەخۆشییەکە دەبن، وەک مێشک و ئەندامە پارانکیمییەکان.[1]

---

[1] Ken Alibek, Smallpox: a disease and a weapon, International Journal of Infectious Diseases (2004) 8S2, S3—S8

## زەردەتا – Yellow fever

زەردەتا یەکێکە لەو چەندین نەخۆشییانەی بە هۆی زیندەوەرە مایکرۆسکۆپییەکانەوە، کە پێیان دەڵێن ڤایرۆسەکان، تووشی مرۆڤ دەبێت، واتە زەردەتا نەخۆشییەکی ڤایرۆسییە. هۆکاری نەخۆشی زەردەتا، ڤایرۆسی زەردەتایە. ئەم ڤایرۆسە یەکێکە لەو کۆمەڵە ڤایرۆسانەی کە سەر بە ڤایرۆسی جۆری فلاڤی ڤایرۆسن (*Flavivirus*)، فلاڤی ڤایرۆسەکانیش سەر بە خێزانی (*Flaviviridae*)ن. ڤایرۆسی زەردەتا یەکێکە لە ڤایرۆسەکانی تای خوێنبەربوون، بە هۆی ئەوەی توانای بڵاوکردنەوەی نەخۆشی زەردەتا و کوشتنی تووشبوانی هەیە، بە هەڕەشەیەکی مەترسیدار دادەنرێت کە وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێت.[1]

### ڤایرۆس چییە؟

بە گشتی، ڤایرۆسەکان تەنۆکەگەلێکی درمن و تەنها لە ناو خانەکانی زیندەوەرانی تردا زۆر دەبن (بێگومان زۆربوونەکەیان بە هۆی لەبەرخۆگرتنەوەیە – replication). بە گشتی، ڤایرۆسەکان لەگەڵ زیندەوەرانی تر پۆلێن ناکرێن، چونکە پێکهاتەی خانەییان نییە و زۆرینەی ئەو تایبەتمەندییانەشیان نییە کە پەیوەستن بەوەی کە زیندوو بن. پێکهاتی ڤایرۆس وەک تەنۆکە (particle) پۆلێن دەکرێت، ئەوەش مانای ئەوەیە کە لە چەند پێکهێنەرێکی کیمیایی ( chemical component) پێک هاتبێت. ڤایرۆسەکان سەرچاوەی خانەخوێیەکانیان بۆ زۆربوون بەکار دەهێنن، ئەمەش دەبێتە هۆی

---

[1] https://www.centerforhealthsecurity.org/resources/fact-sheets

ئەوەی جۆرێک لە زیان بە خانەخوێیەکەی بگەیەنێت، کاتێک سووڕی ژیانی لە ناو خانەی خانەخوێیەکەی جێبەجێ دەکات. لەبەر ئەوەی ڤایرۆسەکان زیان بە خانەخوێیەکانیان دەگەیەنن، زیندەوەرزانان وەک نەخۆشخەرەکان یان مشەخۆرەکان پۆلێنیان دەکەن. سووڕی ژیانی ڤایرۆس بریتییە لە گواستنەوەی ڤایرۆسەکە لە خانەخوێیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە و زۆربوونی لە خانەخوێیەکاندا. بێگومان خانەخوێی ڤایرۆس دەشێت ئاژەڵێک، زیندەوەرێکی مایکرۆسکۆپی یان ڕووەکێک بێت. زۆرینەی ڤایرۆسەکان لە کۆمەڵێکی تایبەتی خانەخوێدا دەژین کە پێی دەوترێت زنجیرەی خانەخوێ. ڤایرۆسی زەردەتا تا ڕادەیەک زنجیرەیەکی خانەخوێی کەمی هەیە، وەک مرۆڤ، مەیموون و شیردەرە باڵاکان کە تووشی نەخۆشییان دەکات.[1]

**بەکارهێنانی هۆکاری زەردەتا وەک چەکێکی بایۆلۆجی**

دەمێکە هەوڵی ئەوە دراوە کە ڤایرۆسی زەردەتا بکرێت بە چەکێکی بایۆلۆجی و لە جەنگدا بەکار بهێنرێت.

* ساڵی ١٨٦٣، لە ماوەی جەنگی ناوخۆدا لە ئەمەریکا، کۆنفیدراڵیخوازەکان جلوبەرگی تووشبوان بە نەخۆشیی زەردەتا و ئاوڵەیان بە هێزە ئێتیحادییەکان دەفرۆشت، بۆ ئەوەی تووشی ئەم نەخۆشییانە ببن و بە ناویاندا بڵاو ببنەوە و توانای بەرگریکردنیان نەمێنێت.[2]

* هەندێک ڕاپۆرت باسی ئەوە دەکەن کە دەشێت کۆریای باکوور زەردەتای کردبێت بە چەکی بایۆلۆجی.

* بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی هێرشبەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، پێش ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٩دا کۆتایی پێ

---

[1] Shamaefsky, Brian R., Yellow Fever, Chelsea House, New York, 2010, pp.9–10

[2] Barras, V., Greub, G., History of biological warfare and bioterrorism, Clin Microbiol Infect 2014; 20: 497–502

بێت، زەردەتا و تای ڕیفت ڤاڵی (Rift valley fever)ی کردبوو بە چەکی بایۆلۆجی.[1]

* ترس و تۆقینەکانی جەنگی یەکەمی جیهان وای لە زۆرینەی وڵاتان کرد لە ساڵی ١٩٢٥دا واژۆ لەسەر پەیماننامەی جنێڤ بکەن، کە بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی و کیمیایی لە جەنگدا قەدەغە کردبوو. هەرچەندە ژاپۆن یەکێک بوو لەو وڵاتانەی واژۆی لەسەر پەیماننامەکە کردبوو، بەڵام بە نهێنی و لەسەر ئاستێکی بەرفراوان، توێژینەوە و پەرەپێدان و بەرهەمهێنان و تاقیکردنەوەی لەسەر چەکی بایۆلۆجی دەکرد، بۆ ئەوەی لە جەنگی بایۆلۆجیدا بەکاریان بهێنێت. هەروەها ژاپۆن پەیماننامەی جنێڤی ساڵی ١٩٢٥ی شکاند کاتێک چەکی بایۆلۆجیی دژی هاوپەیمانان لە چین، لە ساڵانی نێوان ١٩٣٧ و ١٩٤٥ بەکار هێنا. ژاپۆنییەکان هۆکارەکانی تاعوون، پیسەکوان، گرانەتا، ئاوڵە، زەردەتا، تولاریمیا و چەند هۆکارێکی تری نەخۆشییەکانیان لەسەر زیندانیان و دیلەکانی جەنگ، لەوانە، دیلەکانی هێزی هاوپەیمانان تاقی دەکردەوە، ئەمەش کوژرانی زیاتر لە ٣٠٠٠ زیندانی و دیلی جەنگی لێ کەوتەوە.[2]

## مێژووی زەردەتا

* ئەگەری ئەوە زۆرە، کە سەرچاوەی گەشەکردنی زەردەتا ئەفریقا بووبێت و لەوێشەوە بڵاو بووبێتەوە. شیکردنەوە بۆماوەزانییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە سەرچاوەی ڤایرۆسەکە لە ڕۆژهەڵات یان ناوەڕاستی ئەفریقا بووبێت و بە هۆی گواستنەوەی لە نێوان شیردەرە باڵاکان و مرۆڤدا، بۆ ڕۆژئاوای ئەفریقا بڵاو بووبێتەوە. دەشێت ڤایرۆسەکە و هەڵگرەکەی کە Aedes aegyptiیە

---

[1] Borio,L., and co–workers, Hemorrhagic Fever Viruses as Biological Weapons, JAMA, May 8, 2002—Vol 287, No. 18, 2391–2405
[2] https://www.britannica.com/technology/biological–weapon/Biological–terrorism

و جۆرێکە لە مێشوولە، لە ئەفریقاوە بۆ نیوە ڕۆژئاواکەی گۆی زەوی و کیشوەرەکانی ئەمەریکا هێنرابن، ئەوەیش بە هۆی کەشتییەکانی بازرگانیکردن بە کۆیلە، دوای یەکەم دۆزینەوەی کیشوەری ئەفریقا لە ساڵی ١٤٩٢دا لە لایەن ئەورووپییەکانەوە.[1]

* زەردەتا نەخۆشییەکی ڕۆژئاوای ئەفریقا بووە، بە هۆی ئەو کەشتییانەی کۆیلەکانیان گواستووەتەوە، گوازراوەتەوە بۆ جیهانی نوێ و ناوچەکانی تری جیهان. ئەو شیکردنەوە بۆماوەییانەی بەم دواییە بۆ ترشە ناوکییەکانی ١٣٣ نموونەی ڤایرۆسی زەردەتا، کە لە ماوەی ٧٦ ساڵی ڕابوردوودا لە ٢٢ وڵات وەرگیراون، کراون، ئەوە دەردەخەن کە لە ماوەی ٣٠٠ بۆ ٤٠٠ ساڵی ڕابوردوودا، ڤایرۆسەکە گەیشتووەتە ئەمەریکای باشوور، ئەگەری ئەوە زۆرە بە هۆی ئەو کەشتییانەی کۆیلەکانیان هەڵگرتووە، گەیشتبێتە ئەوێ.[2]

* حاڵەتە سەرەتاییەکانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، کە دەشێت زەردەتا بووبێت، لە دوورگەکانی وینوارد لە دەریای کاریبی ڕوویان داوە؛ لە دوورگەی باربادۆس لە ساڵی ١٦٤٧ و لە دوورگەی گوادەلوپ لە ساڵی ١٦٤٨.

* کۆلۆنیاڵە ئیسپانییەکان، لە ساڵی ١٦٤٨، بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکیان لە نیوەدوورگەی یوکاتان لە مەکسیک تۆمار کردووە، کە دەشێت زەردەتا بووبێت. لە شارستانیی مایادا، ئەم نەخۆشییە ناوی "ڕشانەوەی ڕەش"ی لێ نراوە.

* بە لایەنی کەمەوە، ٢٥ حاڵەتی بڵاوبوونەوەی گەورەی ئەم نەخۆشییە لە کیشوەری ئەمەریکای باکوور ڕووی داوە، وەک بڵاوبوونەوەکەی فیلادلفیا لە ساڵی ١٧٩٣، کە چەند هەزار کەسێک مردن، زیاتر لە ٩٪ی سەرجەمی دانیشتوان. فیلادلفیا لەو کاتەدا

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Yellow_fever

[2] Oldstone, Michael, A. B., Viruses, Plagues, and History, Oxford University Press, Oxford, 2010, p.103

پایەختی ئەمەریکا بووە و فەرمانبەرانی حکومەتی ئەمەریکا، بە جۆرج واشنتۆنیشەوە کە سەرۆکی ئەمەریکا بووە، لەو شارە هەڵاتوون.

* ساڵی ١٨٧٨، نزیکەی ٢٠٠٠٠ کەس بەو پەتایە مردن، کە بە شارەکانی سەر ڕووباری میسیسیپی و ئەو شارانەی دەکەوتنە سەر لقەکانی ئەو ڕووبارە، بڵاو بووبووەوە.

* دوایین گەورەترین بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ویلایەتی نیوئۆرلیانز بوو لە ساڵی ١٩٠٥دا.

* لە ساڵانی ١٨٠٣ و ١٨٢١ و ١٨٧٠ لە شاری بەرشەلۆنە لە ئیسپانیا بڵاو بووەتەوە. لە دوایین حاڵەتی بڵاوبوونەوەی لە بەرشەلۆنە، لە کۆی ١٢٠٠٠ حاڵەتی تووشبوون، ١٢٣٥ تووشبووی کوشتووە. هەروەها لە بەندەرەکانی ئەورووپاش ئەم نەخۆشییە بڵاو بووبووەوە، بە هۆی ئەو کەشتییانەی دەگەیشتنە ئەو بەندەرانە و مێشوولەی گوێزەرەوەی ڤایرۆسەکەیان هەڵگرتبوو.

* ناوهێنانی ئەم نەخۆشییە بە ناوی "زەردەتا"، یەکەم جار لە ساڵی ١٧٤٤دا بوو. زۆر لە کەسە بەناوبانگەکان، لە سەدەی هەژدەیەمەوە تاکو سەدەی بیستەم، تووشی نەخۆشیی زەردەتا بووبوون، پاشان یان چاک ببوونەوە یاخود مردبوون.[1]

* نەخۆشیی زەردەتا نەخۆشییەکی نیشتەجێیە لە ناوچەکانی ئەمەریکای باشوور و ناوەڕاست و ئەفریقا. لەسەر ئاستی جیهان، ڤایرۆسی ئەم نەخۆشییە ساڵانە نزیکەی ٢٠٠٠٠٠ کەس تووشی نەخۆشیی زەردەتا دەکات، لەو ٢٠٠٠٠٠ تووشبووە، نزیکەی ٣٠٠٠٠ تووشبوویان دەمرن.[2]

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Yellow_fever

[2] https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC4349381/

زاراوەی "زەردەتا" لە ساڵی ١٧٤٤دا بەکار هێنرا، کە تا ئێستاش ئەم زاراوەیە هەر بەکار دەهێنرێت. هۆی ناونانی نەخۆشییەکە بە زەردەتا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تووشبووەکە بە هۆی زیانگەیشتن بە جگەری، ڕەنگی پێست و چاوەکانی زەرد دەبن، ئەمەش لە ئەنجامی کۆبوونەوەی گەلێک مادەی ژەهراوی لە ناو خوێنی تووشبووەکەدا.[1]

## دۆزینەوەی پێکوتەی زەردەتا

ساڵی ١٩٣٧، ماکس تیلەر کە لەگەڵ هیو سمیث لە دامەزراوەی ڕۆکفیلەر کاریان لەسەر چاککردنی ئەو پێکوتەیەی زەردەتا دەکرد کە لە تیرەی ئاسیبی (Asibi)ی ڤایرۆسی زەردەتا بە دەستیان هێنابوو، بۆیان دەرکەوت لە ئەنجامی گۆڕانێکی گوازراوەیی کە بەسەر تیرەی ئاسیبیی ڤایرۆسی زەردەتاکەدا هاتووە، تیرەیەکی زۆر کاریگەرتر دروست بووە و ناویان لێ نا 17D. بێگومان 17D ڤاکسینەکەیە. پاشان، ئەم ڤاکسینە لە ساڵی ١٩٣٩دا، لەسەر زیاتر لە یەک ملیۆن کەس لە بەرازیل تاقی کرایەوە و هیچ نەخۆشی یان کاریگەرییەکی تەندروستیی لاوەکیی لێ نەکەوتەوە. ڤاکسینی 17D تاکو ئەمڕۆش بۆ کوتان دژی زەردەتا بەکار دەهێنرێت. ماکس تیلەر لە ساڵی ١٩٥١دا خەڵاتی نۆبڵی لە بواری فیسیۆلۆجی یان پزیشکی لەسەر دۆزینەوەی ئەم ڤاکسینە وەرگرت.[2]

## گواستنەوەی ڤایرۆسی زەردەتا

ڤایرۆسی زەردەتا، بە شێوەیەکی سەرەکی، بە هۆی گەستنی مێشوولەکانی جۆری Aedes یان Haemagogus کە تووشی ڤایرۆسەکە بوون، دەگوازرێتەوە. مێشوولەکان کاتێک لەسەر

---

[1] https://www.historyofvaccines.org/timeline/yellow–fever

[2] Norrby, E., Yellow fever and Max Theiler: the only Nobel Prize for a virus vaccine, JEM, Vol. 204, No. 12, November 26, 2007 2779–2784.

شیردەرە باڵا تووشبووەکان (شیردەرەکان مرۆڤ بن یان مرۆڤ نەبن) دەژین و خۆراکیان دەست دەکەوێت، ڤایرۆسەکە لەم شیرەدەرە باڵایانەوە بۆ ئەوانیش دەگوازرێتەوە، پاشان ئەم مێشوولانە ڤایرۆسەکە بۆ شیردەری باڵای تر (مرۆڤ بێت یان مرۆڤ نەبێت) دەگوازنەوە. ئەو کەسانەی تووسی ڤایرۆسی زەردەتا دەبن، پێش تالیهاتن و پاش ٥ ڕۆژ لە تالیهاتن، ڤایرۆسەکە بۆ ئەو مێشوولانە دەگوازنەوە کە گازیان لێ دەگرن.

ڤایرۆسی زەردەتا سێ سووڕی گواستنەوەی هەیە: سووڕی جەنگەڵ، سووڕی نێوانە و سووڕی شارستانی.

سووڕی جەنگەڵ: بریتییە لە گواستنەوەی ڤایرۆسەکە لە نێوان شیردەرە نامرۆڤە باڵاکان (وەکو مەیموون) و ئەو مێشوولانەی لە جەنگەڵدا دەژین. کاتێک مرۆڤ سەردانی جەنگەڵەکان دەکات یان لەو جەنگەڵانەدا کار دەکات، ڤایرۆسەکە بە هۆی مێشوولەکانەوە لە مەیموونەکانەوە بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە.

سووڕی نێوانە: لەم سووڕەدا ڤایرۆسەکە لە مێشوولەکانەوە بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە، کاتێک مرۆڤ لە ناوچەکانی لێواری جەنگەڵێک کار بکات یان نیشتەجێ بێت. لەم سووڕەدا، دەکرێت ڤایرۆسەکە لە مەیموونەوە بۆ مرۆڤ یان لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ لە ڕێی مێشوولەکانەوە بگوازرێتەوە.

سووڕی شارستانی: لە سووڕەیاندا، گواستنەوەی ڤایرۆسەکە لە نێوان مرۆڤ و مێشووولە لە شارەکاندا ڕوو دەدات، بە تایبەتی مێشوولەی جۆری Aedes aegypti. بە گشتی، ئەم ڤایرۆسە، لە لایەن ئەو کەسانەی کە لە جەنگەڵەکاندا تووشی نەخۆشییەکە بوون، دەهێنرێتە ناو شارەکانەوە.

## نیشانەکانی تووشبوون بە زەردەتا

* دەشێت زۆر کەسی تووشبوو نیشانەکانی نەخۆشییەکەیان لێ دەرنەکەوێت.

* هەندێک کەس کە تووشی نەخۆشیی زەردەتا دەبن، ئەم نیشانە سەرەتاییانەیان لێ دەردەکەوێت:

سەرهەڵدانی تایەکی لەناکاو، هەڵەرزین، سەرئێشەیەکی توند، ئازاری پشت، ئازارێکی گشتیی لەش، دڵتێکەڵهاتن، ڕشانەوە، هەستکردن بە ماندوێتی و لاوازی.

زۆر لەو کەسانەی ئەم نیشانە سەرەتاییانەیان لێ دەردەکەوێت، لە ماوەی هەفتەیەکدا چاک دەبنەوە.

هەندێک کەس کە لەم نەخۆشییە چاک دەبنەوە، دەشێت لاوازی و هەستکردن بە ماندوێتییان بۆ ماوەی چەند مانگێک بمێنێتەوە.

* ژمارەیەکی کەمتر لە خەڵک توندتر تووشی نەخۆشییەکە دەبن.

لە هەر حەوت تووشبوو یەکێکیان نیشانە سەرەتاییەکانی لێ دەردەکەوێت، ماوەیەک هەست بە چاکبوونەوە دەکات کە دەشێت تەنها چەند کاژێرێکی کەم یان ڕۆژێک بخایەنێت و دوای ئەمەش، نەخۆشییەکەی توندتر دەبێت.

* نیشانە توندەکانی نەخۆشییەکانی ئەوانەن:

تای توند، ڕەنگی زەرد دەبێت (وەکو ئەوەی تووشی زەردوویی بووبێت)، خوێنبەربوون، تووشبوون بە شۆک و پەککەوتنی ئەندام.

* دەشێت نەخۆشی زەردوویی توند کوشندە بێت. ئەگەر تووشبووەکە یەکێک لەم نیشانانەی لێ دەربکەوێت، دەبێت دەستبەجێ بچێتە نەخۆشخانە.

* ئەوانەی تووشی نەخۆشیی توندی زەردەتا دەبن، ٣٠ بۆ ٦٠٪یان دەمرن.

**چارەسەرکردن**

* دەرمانێـک بـۆ چارەسـەرکردن یـان چـاکبوونەوەی نەخۆشـیی زەردەتا نییە.

* پشـوودان، خـواردنەوەی شـلەمەنییەکان و وەرگرتنـی دەرمـانی سووککردنی ئازار و کەمکردنەوەی تا و سووککردنی سەرئێشە.

* دەبێت تووشبووەکە لە هەنـدێک دەرمـان دوور بکەوێتەوە، وەک حەبـی ئەسـپرین و دەرمانەکـانی دژەهەوکـردن وەک ئیبـوپرۆفین، کە مەترسیی خوێنبەربوون زیاد دەکەن.[1]

* دانی ئۆکسجین بە تووشبووەکە.

* پەستانی خوێنی بە سروشتی بهێڵرێتەوە.

* خوێنی تێ بکرێت.

* ئەگەر تووشـی پەککەوتنـی گـورچیلە بـوو، گورچیلەکـانی بـۆ بشۆررێت.

* ئەگەر تووشی هەوکردنی تر بوو، چارەسەر وەربگرێت.[2]

---

1 https://www.cdc.gov/yellowfever/symptoms/index.html

2 https://www.healthline.com/health/yellow-fever#treatments

## Foot– and– mouth disease (FMD) – **نەخۆشیی تەبەق**

نەخۆشـیی تەبەق نەخۆشـییەکی ڤایرۆسـیی زۆر درمە و تووشـی ئـاژەڵ دەبێت. یەکێکە لە مەترسـیدارترین نەخۆشـییەکانی ئاژەڵ. ئەم نەخۆشـییە تووشـی ئـاژەڵە دووسـمەکان (سـم قڵیشـاوەکان) دەبێـت، لەوانە، گـاوگۆل، گـامێش، وشـتر، مەڕ، بـزن، ئاسـک و بەراز. ئەم نەخۆشـییە لە چەنـدین نـاوچەی جیهـان هەیە و لە چەنـدین وڵات لە ئەفریقـا، ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت، ئاسـیا و ئەمەریکـای باشـوور نیشـتەجێیە. ئەم نەخۆشـییە زیـانێکی گەورە بە بەرهەمـی ئـاژەڵی دەگەیەنێـت، وێـڕای زیانگەیانـدنی بە بازرگـانیی مەڕومـاڵات و بەرهەمەکانیان.[1]

بە گشتی، نەخۆشیی تەبەق نەخۆشییەکی کوشندە نییە بۆ ئاژەڵی پێگەیشتوو، بەڵام بە شێوەیەکی ترسناک توانای ئاژەڵی تووشبوو بۆ خواردن و ڕۆیشتن لاواز دەکات. ئەم نەخۆشییە لە ناو ئاژەڵانی هەر وڵاتێکدا بڵاو ببێتەوە، لەدەستدانی بەرهەمهێنانی گۆشت و شیری لێ دەکەوێتەوە و کاریگەرییەکی ترسناکی لەسەر پیشەسازیی گۆشت و شیرەمەنی و ئابووریی ئەو وڵاتە دەبێت.[2]

تووشـبوونی ژمـارەیەکی زۆری ئـاژەڵ، کـاریگەرییەکی ئـابووریی زۆر گەورەی لەسـەر جیهـان دەبێـت. کـاریگەری یـاخود زیـانەکە دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١– زیانی ڕاستەوخۆ، بە هۆی کەمبوونەوەی بەرهەمی گۆشت و شیر و گۆڕان لە پێکهاتەی ئەو ڕەوە ئاژەڵەی بەخێو دەکرێت ڕوو دەدات، ئینجا ڕەوەکە گاگەل، بزنگەل، بەرازگەل یان جەڵەب بێت.

---

[1] https://www.agriculture.gov.au/pests–diseases–weeds/animal/fmd#what–species–are–affected

[2] https://www.acvp.org/page/Foot_Mouth_Disease

٢- زیانی ناڕاستەوخۆ، ئەمەش لە تێچوونی دارایی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکە و لاوازیی دەستگەیشتن بە بازاڕەکان و بەکارهێنانێکی سنووورداری تەکنۆلۆجیاکانی پێشخراوی بەرهەمهێناندا ڕەنگ دەداتەوە. مەزەندە دەکرێت، کە تەنها کاریگەریی ساڵانەی نەخۆشیی تەبەق، لە ڕووی زیانگەیاندن بە بەرهەمهێنان و تێچوونی کوتان لەو وڵاتانەی کە نەخۆشییەکەیان تێدا نیشتەجێیە، ٦,٥ ملیار بۆ ٢١ ملیار دۆلاری ئەمەریکی بێت. هەروەها، بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە، لەو ناوچە و وڵاتانەی کە پاکن و نەخۆشییەکەیان تێدا نییە، ساڵانە، ١,٥ ملیار دۆلاری ئەمەریکی زیانیان پێ دەگەیەنێت.[١]

### کورتەمێژوویەکی نەخۆشیی تەبەق

* کۆنترین پێناسەکردنی نەخۆشیی تەبەق، قەشەی ئیتالی Hieronymus Fracastorius لە ساڵی ١٥١٤، لە شاری ڤینیسیا کردوویەتی. ئەم قەشەیە باسی ئەوەی کردووە ئاژەڵە تووشبووەکانی شاری ڤیرۆنا ئالفەکەیان ڕەت کردووەتەوە، ناوپۆشەپەردەی ناو دەمیان سوور بووەتەوە و بلۆق لە ناو دەم و پێیەکانیان هاتوون.[٢]

* ساڵی ١٨٩٧، بۆ یەکەم جار دوو خوێندکاری ڕۆبەرت کوخ، فریدریش لۆفلەر و پۆل فرۆش، دەریان خست کە نەخۆشیی تەبەق بە هۆی ڤایرۆسەوە ڕوو دەدات و بە تاقیکردنەوەش ئەوەیان سەلماند.[٣]

* ساڵی ١٩٦٧، بڵاوبوونەوەی پەتای تەبەق لە شانشینی یەکگرتوو، زیانێکی زۆر گەورەی بە سامانی ئاژەڵی شانشینی یەکگرتوو گەیاند و لەناوچوونی ٤٥٠٠٠٠ سەر ئاژەڵی لێ کەوتەوە.[٤]

---

[1] Preventive Veterinary Medicine 112 (2013), pp. 161– 173.

[2] Jamal, Seyd M., and Belsham, Graham J., Foot–and–mouth disease: past, present and future, Veterinary Research, 2003,**44**: 116.

[3] Mahy, B. W. J., Foot– and– Mouth Virus Disease, Springer--Verlag Berlin Heidelberg, Germany, 2005, p.2

[4] Mair, Raina M., and Co–Authors, Environmental Microbiology, Academic, 2nd. Edition , Academic Press, Elsevier, , London, UK , 2009, p. 573.

* لە ساڵانی ١٨٧٠–١٩٢٩، ئەم نەخۆشییە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەبووە. لە ساڵی ١٨٧٠وە کە بۆ یەکەم جار نەخۆشیی تەبەق لەم وڵاتە ناسرا، تاکو ساڵی ١٩٢٩، پێنج جار ئەم نەخۆشییە لەم وڵاتەدا بڵاو بووەتەوە. ئەو بڵاوبوونەوەیەی کە لە هەموویان لەناوبەرتر بووە، بڵاوبوونەوەکەی ساڵی ١٩١٤ بوو لە ویلایەتی میشیگان. لەم ساڵەدا، نزیکەی ٣٥٠٠ ڕەوە (مێگەل)ی مەڕوماڵات لە سەرتاپای ئەمەریکا تووشی نەخۆشیی تەبەق بووبوون، ئەمەش دەیکردە ١٧٠٠٠٠ سەر لە گاوگۆل و مەڕ و بەراز. تێچوونی بنەبڕکردنی ئەم نەخۆشییە، لە ساڵی ١٩١٤دا، ٤,٥ ملیۆن دۆلار بوو؛ ئەو کاتە ئەو بڕە پارەیە بە بڕێکی یەکجار زۆر دادەنرا.

* ساڵی ١٩٢٤، نەخۆشیی تەبەق لە ویلایەتی کالیفۆرنیا بڵاو بووەوە، سەربڕین و لەناوبردنی ١٠٩٠٠٠ سەر ئاژەڵی کێڵگە و ٢٢٠٠٠ ئاسکی لێ کەوتەوە.[1]

* دوایین بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە لە ئەمەریکا، لە ساڵی ١٩٢٩دا بوو لە مۆنتیبیلۆ لە کالیفۆرنیا، کە سەربڕین و لەناوبردنی زیاتر لە ٣٦٠٠ سەر بەرازی ماڵیی لێ کەوتەوە و لە ماوەی کەمتر لە مانگێکدا نەخۆشییەکە کۆنترۆڵ کرا.

* ساڵی ١٩٨٣، ئیتالیا تووشی بڵاوبوونەوەیەکی کەمی نەخۆشیی تەبەق بوو. ئەم نەخۆشییە لە ناوخۆی ئیتالیادا بوو بە هۆی لەناوچوونی ٨٠٠٠ سەر مەڕوماڵات، کە بایی ١١ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی بوو. هەروەها ئیتالیا، لەسەر ئاستی بازرگانیی ناردنەدەرەوەی مەڕوماڵات یان بەرهەم و گۆشتەکەیان، زیاتر ١٢٠ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی زیانی پێ گەیشت.[2]

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Foot–and–mouth_disease#History

[2] Peterson, Michael E. Agroterrorism and Foot–and–Mouth Disease: Is the United States Prepared?, Counterproliferation Paper No. 13, USAF Counterproliferation Center, 2002, p.14
https://media.defense.gov/2019/Apr/11/2002115479/–1/–1/0/13AGROTERRORISM.PDF

* ساڵی ١٩٩٧، نەخۆشیی تەبەق لە تایوان بڵاو بووەوە. بێگومان تایوان یەکێکە لە ١٥ وڵاتە بەهەمهێنەرە گەورەکانی گۆشتی بەراز لە جیهاندا. لە ماوەی بڵاوبوونەوەی پەتای تەبەقدا، زیاتر لە ٣,٩ ملیۆن سەر بەراز لەناو بران کە بایی ٦,٩ ملیار دۆلاری ئەمەریکی بوو. لە ئەنجامدا، پیشەسازیی گۆشتی بەراز و بازاڕی ناردنی بۆ دەرەوە، لە تایوان وێران بوو.[1]

* ساڵی ٢٠٠٢، دووەم بڵاوبوونەوەی پەتای تەبەق لە شانشینی یەککرتوو ڕووی دا و لەدەستدانی ٤ ملیۆن ئاژەڵی لێ کەوتەوە. ئەم ٤ ملیۆن ئاژەڵە تووشبووە لە ٢٠٠٠ کێڵگەی بەخێوکردنی ئاژەڵ سەربڕان و فڕێ دران، مەزەندە کراوە ئەو ٤ ملیۆن ئاژەڵە بایی ٥,٦ ملیار دۆلاری ئەمەریکی بووە.[2]

* ساڵی ٢٠٠٧، جارێکی تر، نەخۆشیی تەبەق لە شانشینی یەککرتوو بڵاو بووەتەوە، بەڵام وەک بڵاوبوونەوەکانی ساڵانی ١٩٦٧ و ٢٠٠٢ نەبوو و زیانێکی زۆری لێ نەکەوتەوە.

* ساڵی ٢٠١١، نەخۆشیی تەبەق لە کۆریای باشوور بڵاو بووەوە. کۆریای باشوور ڕای گەیاند کە ١٢٪ یان نزیکەی ٣ ملیۆن لە سەرجەم بەرازە ماڵییەکانی، لەگەڵ ١٠٧٠٠٠ سەر لە ٣ ملیۆن لە گاوگۆلەکانی لەناو بردوون بۆ ڕاگرتنی بڵاوبوونەوەی پەتای تەبەق.[3]

* ئەم نەخۆشییە نزیکەی ١٥٠ ساڵە، لە وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ناسراوە و بڵاوبوونەوە سەرەتاییەکانی لە ئەندۆنیسیا و مالیزیا و فیلیپین تۆمار کراون. لە زۆر وڵاتی باشووری

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Foot–and–mouth_disease#History

[2] Mair, Raina M., and Co–Authors, Environmental Microbiology, Academic, 2nd. Edition , Academic Press, Elsevier, , London, UK , 2009, p. 573.

[3] https://en.wikipedia.org/wiki/Foot–and–mouth_disease#History

ڕۆژهەڵاتی ئاسیا نەخۆشییەکی نیشتەجێیە، لەوانە، کەمبۆدیا، کۆماری گەلی دیموکراتی لاوس، میانمار، تایلەند و ڤێتنام.[1]

### ڤایرۆسی نەخۆشیی تەبەق وەک چەکێکی بایۆلۆجی

چەکی بایۆلۆجی نەک تەنها هەر مرۆڤ، بەڵکو ئاژەڵیش دەکاتە ئامانج. ساڵی ٢٠٠٢، تیمەکانی هێزی دەریایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە پەناگەکانی خۆشاردنەوەی ئەندامانی ئەلقاعیدە لە ئەشکەوتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستان، چەندین بەڵگەنامەی ئەلقاعیدەیان دۆزییەوە کە باسی کشتوکاڵی ئەمەریکا و ڕاهێنانی ئەندامانی ئەلقاعیدەیان تێدا بوو بۆ هێرشکردنەسەر کشتوکاڵی ئەمەریکا. ئەم بەڵگەنامانە چەندین پلانیان بۆ هێرشکردن بە چەکی بایۆلۆجی بۆ سەر ئەمەریکا تێدا بوو، لەوانە، شەش هێرش بە نەخۆشخەر (pathogen)ی مرۆڤ بۆ سەر دانیشتوانی ئەمەریکا، چوار هێرش بۆ سەر ئاژەڵە کێڵگەییەکان و پەلەوەر، چوار هێرش بۆ سەر بەروبوومە کشتوکاڵییەکان.[2]

نەخۆشیی تەبەق بووەتە مایەی نیگەرانییەکی زۆر کە وەک چەکی بایۆلۆجی دژی ئاژەڵە کێڵگەییەکانی وڵاتان بەکار بهێنرێت، چونکە ڕێژەی تووشبوونی زۆرە، زۆر درمە و زۆر بە خێرایی بڵاو دەبێتەوە، زیانێکی زۆریش بە سامانی ئاژەڵی دەگەیەنێت.[3]

---

[1] Blacksell, Syuart D., and co– authors , A history of FMD research and control programmes in Southeast Asia: lessons from the past informing the future, Epidemiol Infect. 2019; 147: e171.
https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC6499730/

[2] Pfluke, Anne C., An Eamination of the Potential Threat of a state–sponsored Biological Attack Against the United States: A Study of Policy Implications, A Master's Thesis , Graduate College of Missouri State University, USA, 2019, p.3.

[3] Mair, Raina M., and Co–Authors, Environmental Microbiology, Academic, 2nd. Edition , Academic Press, Elsevier, , London, UK , 2009, p. 574.

**نەخۆشیی تەبەق**

نەخۆشـــیی تەبەق بە هــۆی نەخۆشـــخەرێک ڕوو دەدات کە پێـــی دەوترێــت ڤایرۆســـی پێکۆرنـــا (picornavirus). ڤایرۆســـی پیکۆرنـــا ئەنـــدامێکی بنچینەیـــی ڕەگەزی ڤایرۆســـی Aphthovirusــــە. ئەم نەخۆشییە دەبێتە هۆی بلۆقکردن لە ناو دەم و پێیەکانی ڕەشـەوڵاخ، بەراز، مەڕ، بزن و ئاژەڵە دووسمەکانی تردا. نەخۆشـییەکی درمە و بە پەتـایەکی سـەرەکی لە بەخێوکردنی ئاژەڵـدا دادەنرێت. ڤایرۆسـی پیکۆرنـا تەنـۆکەیەکی قەبـارە ٢٥ – ٣٠ نـانۆمەترییە (ئەگەر مەترێـک بکەیت بە هەزار ملیۆن بەش، ئەوا یەک بەش لەو هەزار ملیۆن بەشە پێـــی دەوترێـــت یەک نـــانۆمەتر) و لە قەپێلکێکـــی بیســــتڕوویی (icosaheral) لە پـرۆتین دروســتکراو پێـک هـاتووە، بەرگـی نیـیە و جینۆمێکی یەک تاڵی (strand) لە ناوکەترشی ڕایبی (RNA) تیدایە.[1]

ڤایرۆســـی نەخۆشـــیی تەبەق حەوت زەرداوەجـــۆر (serotype)ی سەرەکیی هەیە کە ئەمـانەن: O, A, C, SAT–1, SAT–2, SAT–3, Asia–1. نـــاوی ئەم زەرداوەجـــۆرانە لە نـــاوی نموونەکــــانی ڤایرۆسـەکانەوە هـاتوون. بێگومـان نموونەکـانی ڤایرۆسـەکانیش لە چ نـاوچەیەک وەرگیـرابن، نـاوی ئەو ناوچەیـان لـێ نـراوە. هەروەهـا نموونەکـان لە کـاتی بڵاوبـوونەوەی نەخۆشـییەکەدا، لەو ناوچـانە وەرگیراون.

زەرداوەجـۆری O، نـاوەکەی لە نـاوی نـاوچەی Oiseی فەڕەنسـا وەرگیراوە.

زەرداوەجـــۆری A، نـاوەکەی لە نـاوی نـاوچەی Allemagneی ئەڵمانیا وەرگیراوە.

زەرداوەجۆرەکـانی SAT–1, SAT–2, SAT–3، ناوەکانیـان لە ناوی باشووری ئەفریقا وەرگیراون.

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Foot–and–mouth_disease_virus

زەرداوەجـۆری Asia–1، نـاوەکەی لە نـاوی نمـوونەیەک کە لە پاکستان (ئاسیا) وەرگیراوە، هاتووە.

زەرداوەجۆری O لە هەموو جۆرەکانی تر باوترە.[١]

## چۆنیتیی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی نەخۆشیی تەبەق

١– بەریەککەوتنی ڕاستەوخۆ بە ئاژەڵی تووشبوو.

٢– هەڵمژینـی پـرژەی ڤایرۆسـاوی لە هەوادا لە ڕێـی کۆئەنـدامی هەناسەوە.

٣– خواردنی خۆراکی پیسبوو بە ڤایرۆسی تەبەق.

٤– گواسـتنەوەی ڕاسـتەقینەی ڤایرۆسـەکە بە هەوادا بـۆ سـەدان کیلۆمەتر.

٥– گواسـتنەوەی ناڕاسـتەوخۆی ڤایرۆسـەکە لە ڕێـی کەوتـنەبەر کەلوپەلی ڤایرۆساویی گوێزەرەوە، وەک جزمە، ئۆتۆمبیل، ئـامێر یـان ئاڵف.[٢]

## نیشانەکانی تووشبوونی ئاژەڵ بە نەخۆشیی ڤایرۆسی تەبەق

نیشـــــانەکانی ئەم نەخۆشـــــییە لە مـــــاوەی ٢ – ٣ ڕۆژ دوای تووشـبوون بە ڤایرۆسـەکە، یـان دەشـێت دەرکەوتنـی نیشـانەکان ٧ – ١٠ بخایەنێت و نیشانەکانیش ئەوانەی خوارەوەن:

* تالێهاتن

* دروستبوونی بلۆق لە ناو دەم و لە سەر پێیەکان.

* کەمبوونەوەی شیر.

* دابەزینی کێش.

---

[1] Mahy, B. W. J., Foot– and– Mouth Virus Disease, Springer–Verlag Berlin Heidelberg, Germany, 2005, pp.3– 4.

[2] Mair, Raina M., and Co–Authors, Environmental Microbiology, Academic, 2nd. Edition , Academic Press, Elsevier, , London, UK , 2009, p. 573.

* نەمانی ئیشتیهای ئالفخواردن.
* لەرزینی لێوەکان و کەفهاتن لە دەم.
* لە مانگادا، دروستبوونی بلۆق لە سەر گوانەکان ڕوو دەدات.
* شەلبوون.[١]

## چارەسەرکردن

بە گشتی، چارەسەر نادرێت بە ئاژەڵی تووشبوو بەو نەخۆشییە. ئاژەڵی تووشبوو چاک دەبێتەوە. لەبەر ئەوەی ئاژەڵە تووشبووەکان بەرهەمیان کەم دەبێتەوە و ئەم نەخۆشییەش نەخۆشییەکی درمە، ئاژەڵە تووشبووەکان دوور دەخرێنەوە و لەناو دەبرێن.

## کوتان

دەتوانرێت کوتان بۆ کەمکردنەوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە یاخود بۆ پاراستنی هەندێک ئاژەڵی تایبەت بەکار بهێنرێت. هەروەها دەتوانرێت ڤاکسینەکان لەو شوێنانەی کە نەخۆشییەکەیان تێدا بڵاو بووەتەوە، بۆ پاراستنی ئاژەڵەکان بەکار بهێنرێن.

دەبێت ئەو ڤاکسینانەی بۆ نەخۆشیی ڤایرۆسی تەبەق بەکار دەهێنرێن، زەرداوەجۆر (serotype) و تیرەکەیان وەک زەرداوەجۆر و تیرەی ڤایرۆسی نەخۆشییەکە بێت، ئەگەر نا، ڤاکسینەکە ئاژەڵەکە ناپارێزێت.

کوتانی ئاژەڵێک بە یەک جۆر زەرداوەجۆر، ئاژەڵەکە لە زەرداوەجۆرەکانی تری ڤایرۆسەکە ناپارێزێت، یان دەشێت بە تەواوی ئاژەڵەکە لە تیرەکانی تر نەپارێزێت یان بە هیچ جۆرێک لە تیرەکانی هەمان زەرداوەجۆر نەپارێزێت. لە ئێستادا، ڤاکسینێکی گشتگیر بۆ نەخۆشیی تەبەق نییە.[٢]

---

[1] https://www.thecattlesite.com/diseaseinfo/243/footandmouth/
[2] https://www.thecattlesite.com/diseaseinfo/243/footandmouth

### Rinderpest – تاعوونی مانگا

تـــاعوونی مانگـــا، کە بە 'تـــاعوونی ڕەشــــەوڵاخ'یش ناســــراوە، نەخۆشییەکی زۆر درمی ڤایرۆسییە، تووشی ئاژەڵە سم دووفاقەکانی وەک گـاوگۆل و گامێشـی مـاڵی و چەنـدین جۆری تـری ئـاژەڵی سـم دووفـاقی دەبێـت، لەوانە، گـامێش، گـاکێوی، ئاسـک، زەڕافە، گـاکێویی ئەفریقایی و بەرازی کێویی ئەفریقایی. ئەم نەخۆشییە دەبێتە هۆی تا و داخورانی دەم و سـکچوون و داوەشـانی لیمفی و ڕێژەیەکی زۆری مردنـی لـێ دەکەوێتـەوە. ڕێـژەی مـردن، لە مـاوەی بڵاوبوونەوەیـدا، ڕێژەیەکـی زۆر بەرزە لەو ئـاژەڵانەی کە بەرگرییـان کەمە و دەگـاتە ١٠٠٪. نەخۆشـیی تـاعوونی مانگـا بە شـێوەکی سـەرەکی لە ڕێـی بەرکەوتنـی ڕاستەخۆ یـان خـواردنەوەی ئـاوی پیسـبوو بە ڤـایرۆسـی نەخۆشـییەکە تووشـی ئـاژەڵ دەبێـت، هەرچەنـدە لە ڕێـی هەواوەش دەگوازرێتەوە. دوای هەڵمەتێکی جیهانی بۆ بنـەبڕکردنی نەخۆشـییەکە، کە لە ناوەڕاسـتی سـەدەی بیسـتەمەوە دەسـتی پـێ کردبـوو، دوایـین حـاڵەتی یەکلاییکـراوەی نەخۆشـیی تـاعوونی مانگـا لە سـاڵی ٢٠٠١دا دەستنیشـان کرا. مرۆڤ تووشی ئەم نەخۆشییە نابێت.

### کورتەمێژوویەکی نەخۆشیی تاعوونی مانگا

* بڕوا وایە تاعوونی مانگا لە کیشوەری ئاسیا سەری هەڵدابێت و دواتر بە هۆی گواستنەوەی گاوگۆلەوە بڵاو بووبێتەوە. هەروەها بڕوا وایە تـاعوونی مانگـا یەکێک لەو ١٠ تاعوونـانەی میسـر بووبێـت کە لە کتێبی پیرۆزی عیبرییەکاندا باس کراوە.[1]

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Rinderpest

* لە دەوروبەری ۳۰۰۰ ساڵ پێش لەدایکبوونی عیسا، تاعوونی مانگا گەیشتووەتە میسر، دواتر بە هەموو بەشەکانی کیشوەری ئەفریقادا بڵاو بووەتەوە.[1]

* بە هۆی سێ هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر ئەورووپای ڕۆژئاوا و داگیرکردنی، سێ جار پەتای تاعوونی مانگایان لە ئەورووپای ڕۆژئاوا بڵاو کردووەتەوە، یەکەمیان لە ساڵی ۱۲۲۲، دووەمیان لە ساڵی ۱۲۳۳ و سێیەمیشیان لە ساڵی ۱۲۳۸.

* لە ماوەی ساڵانی ۱۹۳۸ تاکو ۱۹٤۸، زیاتر لە ملیۆنێک سەر لە گاوگۆل لە ڕۆژئاوای چین مردار بوونەوە. هەروەها لە ساڵی ۱۹٤۸ تاکو ۱۹٤۹، جارێکی تر ئەم تاعوونە بە شێوەیەکی بەرفراوان لەم وڵاتە بڵاو بووەوە.

* ساڵی ۱۹۱۰، بۆ یەکەم جار بە فەرمی بوونی تاعوونی مانگا لە مەنگۆلیا تۆمار کرا. لەو کاتەدا، زیانی ساڵانەی تاعوونەکە ۱۲۰۰۰۰ سەر گاوگۆل و گای تیبتی بووە.

* لە ساڵانی ۱٦۳۷-۱٦٤۲دا، یەکەم حاڵەتی تۆمارکراوی بڵاوبوونەوەی تاعوونی مانگا بووە لە ناوچەی ناگاتۆ لە ژاپۆن، کە بوو بە هۆی مرداربوونەوەی زیاتر لە ۵۰۰۰۰۰ سەر گاوگۆل. هەروەها لە نێوان ساڵانی ۱٦۷۲-۱٦۷۳، تاعوونی مانگا لە هەمان ناوچە، جارێکی تر بڵاو بووەتەوە.

* لە ساڵانی ۱۹٦۹-۱۹۷۳دا، پەتای تاعوونی مانگا لە ڕۆژهەڵاتی نزیک بڵاو بووەوە، لە ئەفغانستانەوە بۆ ئێران، لە ئێرانەوە بۆ کەناری دەریای سپیی ناوەڕاست و لەوێشەوە بۆ نیوەدوورگەی عەرەب.

* ساڵی ۱۹۸۵، شەپۆلێکی پەتای تاعوونی مانگا عێراقی گرتەوە، بە هۆی ئەوەی عێراق ٦۰۰ سەر گامێشی هیندیی تووشبوو بە تاعوونی مانگای لە ڕێی بەندەری بەسراوە هاوردە کردبوو. گامێشە تووشبووەکان بەسەر هەموو ناوچەکانی عێراقدا دابەش کرابوون،

---
[1] https://www.nytimes.com/2010/10/16/science/16pest.html

ئەمەش بڵاوبـوونەوەی پەتـای تـاعوونی مانگـای لـێ کەوتەوە و بە لایەنی کەمەوە، ٣٠٠٠٠ سەر گامێشی کوشت.

* سـاڵی ١٨٤١، تـاعوونی مانگـا بـۆ یەکەم جـار هێنـرایە نـاو کیشوەری ئەفریقا کاتێک گاوگۆلی میسر، بە هۆی ئەو گاوگۆلەی لە ڕۆمانیاوە هاوردە کرابوون، تووشی تاعوونی مانگا بوون، ئەمەش بوو بە هۆی یەکەم سەرهەڵدانی گەورەی پەتای تاعوونی مانگا لە ئەفریقا کە ٧٥٪ی گاوگۆل و گامێشی میسری لەناو برد.

* سـاڵی ١٨٨٤، بـۆ یەکەم جـار تـاعوونی مانگـا لە ئەسـیوپیا دەرکەوت، ئەو کـاتە بە هـۆی هـاوردەکردنی گـاوگۆلی تووشـبووەوە بوو بە تاعوونەکە لە هیندستان، کە لەوێ سەری هەڵدابوو. لە ساڵانی ١٨٨٨-١٨٨٩دا، تـاعوونەکە بەرەو باشـوور بـڵاو بـووەوە، نـزیکەی هەموو ئەسیوپیا و وڵاتانی هاوسێی ئەسیوپیا، سۆماڵیلاند و کینیا و ئۆگەندا و سودانی گرتەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٨٩٢دا مەزەندە کرابوو کە ٩٠٪ی گاوگۆلی ئەسیوپیا بەم پەتایە لەناو چووبێت (لەوانە ئاژەڵە کێوییەکان)، هەروەها لە ئۆگەندا مەزەندە کرابوو کە ٩٠٪ی سەرجەم گاوگۆلەکانی، کە ژمارەیان ٤٠٠٠٠٠ بوو، مردار بووبێتنەوە.

* ساڵی ١٨٨٦ تاکو ساڵی ١٩٦٠، بڵاوبوونەوەکانی تاعوونی مانگا هەڕەشەیەکی بەردەوام بوو لە ڕۆژئاوای ئەفریقا.

* سـاڵی ١٩٢٠، تەنهـا یەک بڵاوبـوونەوەی تـاعوونی مانگـا لە هەردوو کیشـوەرەکانی ئەمەریکـا ڕووی دابـوو، ئەویـش لە بەرازیـل بوو.

* سـاڵی ١٩٢٣، تەنهـا یەک بڵاوبـوونەوەی تـاعوونی مانگـا لە کیشوەری ئوستراليا ڕووی داوە.

* لە سـاڵانی ١٩٨٠ تـاکو ١٩٨٤، لە نایجیریـا، ٨٤٤٤٧٤٣ سـەر گـاوگۆلی ئەم وڵاتە تووشـی پەتـای تـاعوونی مانگـا بـوون و نەخۆشکەوتنی ١٩٥١٢٠٨ سەر گاوگۆل و مردارەوەبوونی ٤٥١٢٧٩ی لێ کەوتووەتەوە.

* لە سالانی نێوان ١٩٨٢ و ١٩٨٤، تاعوونی مانگا لە زۆرینەی ناوچەکانی کیشوەری ئەفریقا بڵاو بووەوە و بە لایەنی کەمەوە، زیانی ٤٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکیی بە وڵاتانی ناوچەکە گەیاند.[١]

## تاعوونی مانگا وەک چەکێکی بایۆلۆجی

* تاعوونی مانگا دەبێتە مایەی نیگەرانییەکی زۆر ئەگەر وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێت، ئەوەیش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- ڕێژەیەکی زۆر گاوگۆل تووشی نەخۆشییەکە دەکات و ڕێژەیەکی زۆریش دەکوژێت.

٢- تاعوونی مانگا، زۆر درمە و بە خێراییەکی زۆر بە ناو ئەو ڕەوە گاوگۆلانەی کە بەرگریان نییە، بڵاو دەبێتەوە.

٣- ئەو گاوگۆلانەی کە دژی تاعوونی مانگا نەکوتراون، ئەوا ئەگەری تووشبوونیان بە تاعوونەکە زۆرترە.[٢]

* تاعوونی مانگا یەکێک بووە لە زیاتر لەو دە هۆکارە بایۆلۆجییەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا توێژینەوەی لەسەر کردوون، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکاری بهێنێت، پێش ئەوەی کۆتایی بە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکەی بهێنێت.[٣]

---

[1] Tounkara,_K., Nwankpa, N., and Bodjo, S.C., Rinderpest Experience, *Rev. Sci. Tech. Off. Int. Epiz.*, 2017, 36 (2), 569–578.

[2] https://en.wikipedia.org/wiki/Rinderpest#Use_as_a_biological_weapon

[3] "Chemical and Biological Weapons: Possession and Programs Past and Present" (PDF). James Martin Center for Nonproliferation Studies, Middlebury College. April 9, 2002. Retrieved November 14, 2008.

* له ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، تاعوونی مانگا له بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی شانشینی یەکگرتوودا بە چەکێکی بایۆلۆجی دانراوە.[1]

* له ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، ئەڵمانیای نازی دەستی بە کارێکی بەرفراوانی چڕوپڕ کردبوو له بواری بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی، وەک بەکارهێنانی تاعوونی مانگا و تەبەق دژی ڕەشەوڵاخ، وێڕای کۆمەڵێک نەخۆشخەر و ئافات دژی دانەوێڵە.[2]

* له ساڵانی ١٩٨٠کان، وەزارەتی کشتوکاڵی سۆڤییەت بەرنامەیەکی سەرەکیی بە ناوی (Ecology) دەست پێ کردبوو. لەم بەرنامەیەدا توانرا بە سەرکەوتوویی پەرە بە چەند جۆرێکی جیاواز له نەخۆشی بدەن، لەوانە، نەخۆشیی تەبەق، تاعوونی مانگا، تای بەرازی ئەفریقایی و نەخۆشیی دەردەتووتی دژی مریشک.[3]

### ڤایرۆسی نەخۆشیی تاعوونی مانگا

نەخۆشیی تاعوونی مانگا، کە تووشی ئاژەڵە سم دووفاقەکانی وەک گاوگۆل و گامێش دەبێت، هۆکارەکەی ڤایرۆسێکە پێی دەڵێن ڤایرۆسی نەخۆشیی مانگا.

ڤایرۆسی نەخۆشیی مانگا، سەر بە ڤایرۆسەکانی ڕەگەزی (*Morbillivirus*)ە له خێزانی (*Paramyxoviridae*). هەرچەندە یەک جۆر له زەرداوەجۆری (serotype) ڤایرۆسی تاعوونی مانگا هەیە، بەڵام تیرەکانیان له ڕادەی نەخۆشخستندا زۆر جیاوازن. هەندێک تیرەیان دەبنە هۆی ١٠٠٪ مردن، هەندێکی تریشیان ئاژەڵ تووشی

[1] Bowcott, Owen; Evans, Rob (16 May 2010). "British secret biological warfare testing". *The Guardian*. London.
[2] www.ecronicon.com › agriculture-ECAG-01-000021
[3] https://egrowfoundation.org/site/assets/files/1369/b_senthil_b_a.pdf

نەخۆشییەکی وا سووک دەکەن، کە نیشانەکانی نەخۆشییەکەیان لێ دەرناکەوێت.[1]

ئەم ڤایرۆسە لە قەپێلکێکی (capsid) نیمچەگۆیی فرەشێوە پێک هاتووە و بە بەرگێک لە چەوری کە پێی دەڵێن host–derived lipids، دەور دراوە. تیرەی قەپێلکە بە بەرگ دەوردراوەکان لە نێوان ١٥٠ بۆ ٢٥٠ نانۆمەترە. جینۆمی ئەم ڤایرۆسە لە گەردێکی یەک تاڵی پارچەنەکراو، ناوکە ترشی ڕایبی (RNA) پێک هاتووە.[2]

**بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی تاعوونی مانگا**

بەم ڕێگەیانەی خوارەوە بڵاو دەبێتەوە:

* بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی ئاژەڵێکی تووشبوو بە ئاژەڵانی ساغ.

* ڤایرۆسی نەخۆشییەکە دەشێت بە هۆی دەردراوەکانی چاو، لووت یان دەم، بە هۆی پیسایی، میز، خوێن، شیر یان دەردراوەکانی ئەندامی زاوزێی ئاژەڵێکی تووشبوو بڵاو ببێتەوە.

* بە هۆی گوێزەرەوەی وەک دەستکێش، جزمە و جلوبەرگی پیسبوو بە ڤایرۆسەکە، ئاخوڕی ئالیک یان حەوزی ئاوخواردنەوە بڵاو ببێتەوە.

* دەشێت بە هۆی پرژەی ناو هەوا بڵاو ببێتەوە، بەڵام بڵاوبوونەوەی پرژەکان، بۆ مەودایەکی زۆر کەم کاریگەرن.[3]

* بە مەبەستی نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە، دەبێت ئاژەڵی گومانلێکراو بە هەڵگری ڤایرۆسەکە کەرەنتینە بکرێت.

---

[1] Nanda, Sambit K,. and Baron ,Michael D., Rinderpest Virus Blocks Type I and Type II Interferon Action: Role of Structural and Nonstructural Proteins, Journal of Virology, Aug. 2006, pp. 7555–7568

[2] https://microbewiki.kenyon.edu/index.php/Rinderpest#:~:text=Barrett%3B1999).–,Virion

[3] http://www.cfsph.iastate.edu/FastFacts/pdfs/rinderpest_F.pdf

## نیشانەکانی تووشبوون بە نەخۆشیی تاعوونی مانگا-

* نیشـــــانەکانی ئەم نەخۆشـــــییە دوای ٣ – ٥ ڕۆژ لە ئـــــاژەڵە تووشبووەکاندا دەردەکەون و ڕێژەی مردن لە ئاژەڵە تووشبووەکاندا دەشێت بگاتە ١٠٠٪.

* دەرکەوتنی بلۆقی دەنکۆڵەیی لە ناو کونەلووت و لێو و ناو دەم، کە بە زۆری دەبن بە برین.

* دەردانی شلەیەکی لینج لە کونەلووت و چاودا، هەندێک جار خوێنی لەگەڵدایە.

* هەناسەدانی خێرا.

* کەمبوونەوەی بەرهەمی شیر لە مانگادا.

* نەمانی ئیشتیهای ئالیکخواردن.

* تالێهاتن

* دەشـــێت ئـــاژەڵە تووشـــبووەکان، لە قۆنـــاغە ســـەرەتاییەکانی نەخۆشییەکەدا تووشی قەبزی ببن.

* لە کۆتا قۆناغەکانی نەخۆشییەکەدا، تووشبوون بە سکچوون لە نـاو ئاژەڵانـدا بـاوە، پیسـایی ئـاژەڵەکە بـۆگەنی لـێ دێـت و بە زۆری خوێنیشی پێوەیە.

* ئەم جـۆرە تـاعوونە بە خێرایـی لە نـاو ڕەوەکـانی گـاوگۆل و گامێشدا بڵاو دەبێتەوە، بە گشتی، ئاژەڵە تووشبووەکە، دوای ٦ بۆ ١٠ ڕۆژ لە دەرکەوتنی نیشانەکان، مردار دەبێتەوە.[١]

## چارەسەرکردن

نەخۆشـــیی تـــاعوونی مانگـــا نەخۆشـــییەکی ڤایرۆســـییە و هـــیچ چارەسەرێکی دیاریکراوی نییە. دەشێت چارەسەرکردنی سکچوون و

---

[1] https://www.gov.scot/publications/rinderpest/

پێـدانی دژەزینـدە و هەروەهـا شـلەکردنەناو لەشـی ئـاژەڵەکە بـۆ شوێنگرتنەوەی ئەو شلەیەی ونی کردووە، بەسوود بێت بۆ نەهێشتنی مردنـی ئـاژەڵەکە، یـان یـارمەتیی چـاکبوونەوەی ئـاژەڵی تـاکی گرنـگ بدات. بە کردار، ژمارەیەکی کەم لە ئاژەڵ چارەسەر دەکرێن.[1]

[1] https://en.wikivet.net/Rinderpest#Clinical_Signs

## Ebola - ئیبۆلا

ڤایرۆسی ئیبۆلا دەبێتە هۆی نەخۆشییەکی درم کە پێی دەوترێت "نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا" و مردنێکی زۆری لێ دەکەوێتەوە. ناوی ڤایرۆسی ئیبۆلا، لە ناوی ڕووباری ئیبۆلا (Ebola River) وەرگیراوە. ئەم ڕووبارە دەکەوێتە کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ و بۆ یەکەم جار ئەم نەخۆشییە لە ساڵی ١٩٧٦دا لە گوندێکی نزیک ئەم ڕووبارە دۆزراوەتەوە.

تای خوێنبەربوونی ڤایرۆسی ئیبۆلا تووشی هەزاران کەس دەبێت لەسەر ئاستی جیهان و مردنێکی زۆریشی لێ دەکەوێتەوە. یەکەم بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە، لە کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ بوو لە ساڵی ١٩٧٦دا. لەو کاتەوە چەندین بڵاوبوونەوەی توندی ئەم نەخۆشییە لە بەشەکانی تری جیهاندا ڕووی دا، وەک سودان، ناوەڕاست و ڕۆژئاوای ئەفریقا.

بڵاوبوونەوەی ئەم دواییەی نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا یەکەم جار بوو لە ناوچەیەکی چڕی دانیشتوان ڕوو بدات، ژمارەیەکی زۆر خەڵک تووشی نەخۆشییەکە بوون، نەخۆشییەکە ماوەیەکی ئەوپەڕی درێژی خایاند کە زۆرترین ڕێژەی گیانلەدەستدانی لەگەڵدا بوو، هاوکات لە سێ وڵات بڵاو بووەوە، کە غینیا و لایبیریا و سیرالیۆن بوون.

ڕێژەی زۆری مردن بە نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا، ئاماژەیەکە بۆ ئەگەری بەکارهێنانی ڤایرۆسەکە وەک چەکێکی بایۆلۆجی، هەرچەندە چەندین پێشکەوتن لە بواری پەرەپێدانی ڤاکسینی دژی ئیبۆلا بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسییەکانی بەدی هێنراون.[1]

---

[1] Gera, Prachi, and co–workers, Recent advances in vaccine development against Ebola threat as bioweapon, VirusDisease, Sept. 2017.

## ڤایرۆسی ئیبۆلا

ڤایرۆسی ئیبۆلا ڤایرۆسێکە لە خێزانی ڤایرۆسە دەزوولەییەکانە (filoviridae). ئەم خێزانە لە چوار ڕەگەز (genus) پێک دێت و یەکێک لەم چوار ڕەگەزە، ڕەگەزی ڤایرۆسی ئیبۆلایە. ڕەگەزی ڤایرۆسی ئیبۆلا شەش جۆر ڤایرۆسی ئیبۆلا لە خۆ دەگرێت و هەر جۆرێکیش بە ناوی ئەو شوێنەی لێی دۆزراوەتەوە، ناو نراوە، بۆ نموونە، ڤایرۆسی سودان لە سودان دۆزراوەتەوە، ڤایرۆسی تای فۆرێست لە پارکی نیشتیمانی تای، لە ساحل العاج (Ivory Coast) دۆزراوەتەوە.[1]

هەندێک سەرچاوە، جۆرەکانی ڤایرۆسی ئیبۆلای، لە ڕەگەزی ڤایرۆسەکە، بە پێنج جۆر داناوە.

ڤایرۆسی ئیبۆلا، لە ڕووی پێکهاتەوە، لە دەزوویەکی درێژ دەچێت، بە گشتی، بە شێوەی دەزوولەیەکی درێژ (وێنەی ٤–١)، یان بە شێوەی پیتی Uی ئینگلیزی دەردەکەوێت، یان دەشێت بە شێوەی گۆچانی شوان یاخود تەنانەت بە شێوەی بازنەیش بێت.[2]



*وێنەی (٤–١): پێکهات و جینۆم (genome)ی ڤایرۆسی ئیبۆلا*

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Filoviridae

[2] Smith, Tara, C., Ebola: Deadly Diseases and Epidemics, USA , Chelsea House Publishers, 2006, p.35.

## کورتەمێژوویەکی نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا ( Ebola Virus Disease)

* یەکەم جار ئەم نەخۆشییە لە ساڵی ١٩٧٦دا دۆزرایەوە و دەستنیشان کرا، کە هاوکات لە دوو شوێن بڵاوبووەوە، یەکێکیان لە شاری نزارە لە باشووری سودان، کە لە کۆی ٢٨٤ تووشبوو، ١٥٠یان مردن. ئەوی تریان لە گوندی یامبوکو، کە نزیک ڕووباری ئیبۆلا بوو، لە کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ، لە کۆی ٣١٨ تووشبوو، ١٨٠یان مردن.

* ساڵی ١٩٩٥، نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا، لە ناو کرێکارانی خەڵوون، نزیک دارستانەکانی شاری کیکویت، لە کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ بڵاو بووەوە، لە ٣١٥ تووشبوو، ٢٥٠یان مردن.

* ساڵی ٢٠٠٠، ئەم نەخۆشییە لە ئۆگەندە بڵاو بووەوە و لە ٤٢٥ تووشبوو، ٢٢٤ کەس مردن.

* ساڵی ٢٠٠٢، ئەم نەخۆشییە، لە ناوچەی ڕۆژئاوای کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ بڵاو بووەوە، لەو ١٤٣ کەسەی تووشی نەخۆشییەکە بووبوون، ١٢٨ کەسیان مردن.

* ساڵی ٢٠٠٧، نەخۆشیی ئیبۆلا لە ناوچەی بوندیبیگیۆ لە ئۆگەندە بڵاو بووەوە. لە ماوەی ئەم بڵاوبوونەوەیەدا ١٣١ کەس تووش بوون و ٤٢ کەسیان مردن.

* لە ساڵانی ٢٠١٤ تاکو ٢٠١٦، لە ڕۆژئاوای ئەفریقا، لە ئۆگەندە و لایبیریا و سیرالیۆن بڵاو بووەوە. ئەمەش زۆرترین بڵاوبوونەوە بوو لەوەتەی ڤایرۆسەکە دۆزرابووەوە. لە کۆتایی ماوەی ئەم پەتایەدا، ١٥٢٦١ حاڵەتی تووشبوون بە نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا هەبوو، لەو ژمارەیە، ١١٣٢٥ تووشبوو مردن.

* ساڵی ٢٠١٨ تاکو ٢٠١٩، دووبارە نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا لە کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ بڵاو بووەوە، لە کۆی ٢٥٠٠ تووشبوو، ١٥٠٠ کەسیان مردن.

نزیکەی ١٣٠٠٠ کەسی کوشتووە.[1]

## ئیبۆلا وەک چەکێکی بایۆلۆجی

* بە هۆی ئەوەی ڕێژەی مردنی ئەوانەی بە هۆی ڤایرۆسی ئیبۆلاوە تووشی تای خوێنبەربوونی ئیبۆلا دەبن، لە نێوان ٢٥ – ٩٠٪دایە و نەخۆشییەکە بە ئاسانی لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوازرێتەوە، ئەم ڤایرۆسە بۆ ئەوە دەشێت وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێت.

سەنتەرەکانی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی و پاراستن لە ئەمەریکا (CDC)، لەبەر دوو هۆ، ڤایرۆسی ئیبۆلایان لە گرووپی A و بە هەڕەشەیەکی بایۆتیرۆریزم و بە چەکی بایۆلۆجی داناوە:

١– ڤایرۆسە دەزوولەییەکان، لەوانە ئیبۆلا، ئەوپەڕی کوشندەن و دەبنە هۆی نەخۆشییەکی توندی تای خوێنبەربوون لە مرۆڤ و مەیمووندا و ڕێژەی مردن بەم نەخۆشییە دەگاتە ٩٠٪.

٢– وێڕای ئەوەی ڤایرۆسە دەزوولەییەکان ئەوپەڕی نەخۆشخەرن، وەک دڵۆپەی زۆر بچووکی پرژە (aerosol droplets) ئەوپەڕی درمن.

لەگەڵ ئەوەشدا، تاکو ئێستا، هیچ ڕاپۆرتێکی ڕووداوی بایۆتیرۆریزم نییە کە ڤایرۆسی ئیبۆلای تێدا بەکار هێنرابێت، چونکە هەندێک کۆسپ هەن وا دەکەن نەتوانرێت ڤایرۆسەکە بە شێوەیەکی کاریگەرانە بەکار بهێنرێت. ئامادەکردنی ڤایرۆسەکە قورسە و ئەگەر بەر هەوا بکەوێت، کاریگەریی نامێنێت. تەنها ئەو پسپۆڕانەی کە شارەزاییان لە ڤایرۆسەکەدا هەیە، دەتوانن تیرەیەکی دروستی ڤایرۆسەکە ئامادە بکەن و تیرەکان وا پەرەوەردە بکەن کە هەندێک

---

[1] https://www.mercycorps.org/blog/ebola-outbreaks-africa-guide/chapter-2

خەسڵەتی خواستراویان هەبێت، بتوانرێت هەڵبگیرێن و بە شێوەیەکی کاریگەرانە بڵاو بکرێنەوە.

ڤایرۆسی ئیبۆلا، بۆ ئەوەی بۆ کاری بایۆتیرۆریزم بەکار بهێنرێت، دەبێت بە شێوەیەکی سروشتی یان پیشەسازی، بە دەست بهێنرێت و بکرێت بە چەکی بایۆلۆجی. تاکو ساڵی ۲۰۰۱، هەشت حاڵەت هەیە کە تیرۆریستان هەوڵیان داوە ئەم ڤایرۆسە بە دەست بهێنن، حاڵەتەکانیش بەم شێوەیە بوون: لە سەرچاوەیەکی یاسایی بە دەست هێنراوە و دزراوە، تیرۆریستان خۆیان دروستیان کردووە، دوو حاڵەتیش لە سەرچاوە سروشتییەکان بە دەست هێنراون و سێ حاڵەتیش سەرچاوەکانیان دیار نییە.[1]

* لە ماوەی جەنگی سارددا، یەکێتیی سۆڤییەت بڕێکی زۆری لە میکرۆبەکان پەروەردە دەکرد بۆ ئەوەی لە داهاتوودا وەک چەکی بایۆلۆجی بەکاریان بهێنێت. بێگومان ئەم زانیارییانە، بە هۆی سەرچاوەی هەواڵگرییەوە زانراون. سۆڤییەتییەکان هەوڵی چاندنی ئاوڵە، پیسەکوان، تولاریمیا، بۆتولیزم و تاکانی خوێنبەربوونیان دا، لەوانە، ئیبۆلا. لە کۆتاییدا، سۆڤییەتییەکان وازیان لەو پرۆژەیە هێنا.

* تاقمی ئایینیی ئۆم شینریکیۆی ژاپۆنی ئیبۆلایان وەک چەکی بایۆلۆجی بۆ داهاتوو دەبینی. ئەم تاقمە لە ساڵی ۱۹۹۲دا گرووپێکی پزیشکیی ٤٠ کەسییان بۆ کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ نارد. بە ڕواڵەت، ئەم گرووپە بۆ پێشکەشکردنی یارمەتیی پزیشکی بوو بۆ ئەنگۆلا کە نەخۆشیی ئیبۆلای تێدا بڵاو بووبووەوە. مەبەستی ڕاستەقینەی ئۆم شینریکیۆ، کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی هەندێک ڤایرۆسی ئیبۆلا بوو، بەڵام هیچیان دەست نەکەوت.[2]

[1] Gera, Prachi, and co–workers, Recent advances in vaccine development against Ebola threat as bioweapon, VirusDisease, Sept. 2017.

[2] / https://www.scientificamerican.com/article/weaponized–ebola–is–it–really–a–bioterror–threat

## بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی ئیبۆلا

مرۆڤ، لە سەرەتادا، بە هۆی بەریەککەوتنی لەگەڵ ئاژەڵێکی تووشبوو بە ڤایرۆسەکە، وەک شەمشەمەکوێرەی میوە یان شیردەری نامرۆڤی، تووشی نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا دەبێت. دوای ئەوە، نەخۆشییەکە، لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوازرێتەوە و ژمارەیەکی زۆر خەڵک تووش دەبن.

نەخۆشییەکە، لە ڕێی بەریەککەوتنی ڕاستەوخۆی (برین، ناوپۆشەپەردەی ناو چاو، لووت یان دەم)ی کەسێکی ساغ بەمانەی خوارەوە، بۆی دەگوێزرێتەوە:

* خوێن یان شلەی لەش (وەک میز، لیک، ئارەق، پیسایی، ڕشانەوە، شیری مەمک یان تۆو)ی کەسێکی تووشبوو بە ڤایرۆسەکە یان بە ڤایرۆسەکە مردبێت.

* شتومەکی (وەک جلوبەرگ، نوێن، دەرزی و کەلوپەلی پزیشکی)ی پیسبوو بە شلەی لەشی کەسێکی تووشبوو بە ڤایرۆسەکە یان بە ڤایرۆسەکە مردبێت.

* شەمشەمەکوێرەی میوە یان شیردەری نامرۆڤی تووشبوو بە ڤایرۆسەکە (وەک مەیموونی بێکلک و کلکدار).

* تۆوی پیاوێک کە تازە لە نەخۆشییەکە چاک بووبێتەوە و سێکس لە ڕێی دەم، زێ یان کۆمەوە لەگەڵ کەسێک بکات، تووشی نەخۆشییەکەی دەکات. هیچ بەڵگەیەک نییە کە نەخۆشیی ئیبۆلا، لە ڕێی سێکسکردن یان بەرکەوتنی شلەکانی زێی ژنێک کە نەخۆشیی ئیبۆلای هەبووبێت، بڵاو ببێتەوە.

کەسێک کە تووشی ئیبۆلا دەبێت، تەنها دوای ئەوەی نیشانەکانی نەخۆشییەکەی لێ دەردەکەوێت، نەخۆشییەکە بۆ کەسانی تر دەگوازێتەوە.

نەزانراوە کە نەخۆشیی ئیبۆلا لە ڕێی خۆراکەوە بگوازرێتەوە. هەرچەندە، لە هەندێک ناوچەکانی جیهان، دەشێت بە هۆی دەستلێدان

یان خواردنی گۆشتی ئاژەڵی کێویی تووشبوو بە ئیبۆلا، نەخۆشییەکە بڵاو ببێتەوە.[1]

**نیشانەکانی تووشبوون بە نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا**

بە گشتی، نیشانەکان لە ماوەی ٥ بۆ ١٠ ڕۆژ لە تووشبوون بە ڤایرۆسی ئیبۆلا، بە شێوەیەکی لەناکاو دەست پێ دەکەن و ئەمانەن:

تالێهاتن

سەرئێشەی توند

ئازاری ماسوولکە و جومگە

هەڵلەرزین

لاوازی

بە تێپەڕینی کات، وردەوردە توندتر دەبن دەشێت و ئەمانە بن:

هێڵنجهاتنەوە و ڕشانەوە

سووربوونەوەی چاوەکان

سکچوون (دەشێت خویناوی بێت)

لیرلێهاتن

ئازاری سنگ و کۆکە

هەوکردنی قوڕگ

ئازاری گەدە

دابەزینی توندی کێش

خوێنبەربوون، خوێنهاتن لە چاو، کاتێک تووشبووەکە لە مردن نزیک دەبێتەوە، دەشێت خوێنبەربوون لە گوێ و لووت و ڕاستەڕیخۆڵەی ڕوو بدات.

خوێنەبەربوونی ناوەکی.[2]

---

[1]https://www.cdc.gov/vhf/ebola/transmission/index.html#:~:text=Ebola
[2]https://www.mayoclinic.org/diseases–conditions/ebola–virus/symptoms–causes/syc–20356258

## چارەسەرکردن

نیشانەکانی نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا، یەکسەر دوای دەرکەوتنیان دەبێت چارەسەر بکرێن. ئەگەر ئەم نیشانانە زوو چارەسەر بکرێن، ئەوا چانسی مانەوەی تووشبووەکە بە زیندوویی زیاتر دەبێت. چارەسەرەکانیش ئەمانەن:

* شلەمەنی و ئەلیکترۆلایت (ئاوەگیراوەی خوێ) لە ڕێگەی دەمارەوە دەدرێت بە نەخۆشەکە.

* چارەسەری ئۆکسجینی بۆ دەکرێت، بۆ پاراستنی دۆخی ئۆکسجینی تووشبووەکە.

* بەکارهێنانی دەرمان، بۆ پاڵپشتیکردنی پەستانی خوێن و کەمکردنەوەی ڕشانەوە و سکچوون و دابەزاندنی تا و کەمکردنەوەی ئازار.

* ئەگەر هەوکردنی تر ڕوویان دا، دەبێت چارەسەر بکرێن.

## دەرمانی دژەڤایرۆسی ئیبۆلا

* لە ئێستادا دەرمانێکی دژەڤایرۆسی ئیبۆلا نییە کە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی خۆراک و دەرمانی (FDA)، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بۆ چارەسەرکردنی تووشبوانی ئیبۆلا، مۆڵەتی پێ درابێت.

* لە ماوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی ئیبۆلا لە ساڵی ٢٠١٨، لە کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ، لە سەرەتادا چوار چارەسەری توێژینەوەیی بەردەست بوون بۆ ئەو نەخۆشانەی بە دڵنیاییەوە نەخۆشیی ئیبۆلایان هەبوو، دوان لەو چوار چارەسەرە، کە پێیان دەوترا، mAb114 و regeneron (REGN–EB3)، تێکڕای مانەوەی نەخۆشەکەیان بە زیندوویی، لە ئاستێکی زۆر بەرزدا دەهێشتەوە. ئێستا، ئەم دوو دەرمانە دژەڤایرۆسانە، بۆ چارەسەرکردنی ئەوانەی بە دڵنیاییەوە نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلایان هەیە، بەکار دەهێنرێن.

* ئەو دەرمانانەی کە پەرەیان پێ دراوە، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیی ڤایرۆسی ئیبۆلا، کارەکەیان ئەوەیە کە نەیەڵن ڤایرۆسی ئیبۆلاکە خۆی کۆپی بکاتەوە (replicate) و لە ناو لەشی نەخۆشەکەدا زۆر ببێت.[1]

[1] https://www.cdc.gov/vhf/ebola/treatment/index.html

## تای ڕیفت ڤالی - Rift Valley Fever (RVF)

تـای ڕیفـت ڤـاڵی (RVF) نەخۆشـییەکی ڤایرۆسـیی سـەرچاوە ئـاژەڵییە، بە شـێوەیەکی سـەرەکی تووشـی ئـاژەڵ دەبێـت و توانـای تووشـکردنی مرۆڤیشـی هەیە. تووشـبوون بەم تـایە دەبێـتە هـۆی نەخۆشییەکی توند لە هەریەکە لە ئاژەڵ و لە مرۆڤدا. ئەم نەخۆشییە زیـانێکی ئـابووریی گەورەی لـێ دەکەوێـتەوە، بە هـۆی مـردن و بەرهاویشـتن لە نـاو ئـاژەڵی تووشـبووی ئاوسـدا. Rift Valley بە مانـای دۆڵی قڵیشـاو دێت، ئەم دۆڵە لە وڵاتـی کینیـایە و نـاوی Rift Great Valleyیە. تـای ئەم نەخۆشـییە یەکەم جـار لە سـاڵی ١٩١٠دا لەم دۆڵە دۆزراوەتەوە و بە نـــاوی ئەم دۆڵەوە نـــاو نـــراوە، ئـــێمە ناوەکەیمان بە ڕێنووسی کوردی بە "ڕیفت ڤاڵی" نووسیوە.[1]

### کورتەمێژوویەکی بڵاوبوونەوەی تای ڕیفت ڤالی

* ڤایرۆسـی تـای ڕیفـت ڤـاڵی (RVFV) بـۆ یەکەم جـار لە سـاڵی ١٩٣٠دا لە لایەن پسـپۆڕانەوە ناسـینەوەی (identifiication) بـۆ کـرا، ئەوەیش کاتێک لێکۆڵینەوە لە نەخۆشیی "هەوکردنی جگەری ئاژەڵ"، لە کێڵگەیەکی نزیـک دەریـاچەی نیڤاشـا لە ڕیفت ڤاڵی، لە وڵاتی کینیـا دەکـرا. ئەم نەخۆشـییەی هەوکردنـی جـگەری ئـاژەڵ، پەیوەنـدیی بە ڕێژەیەکـی بەرزی بەرهاویشـتنی کـاوڕی ئـاوس و مردنێکـی زۆری بەرخـی تـازەلەدایکبووەوە هەبـوو. لە ٥٠ سـاڵی ڕابـوردوودا، ئەم نەخۆشـییە لە زیـاتر لە ٣٠ وڵاتـی کیشـوەری ئەفریقـا بـڵاو بـووەوە، وێڕای وڵاتانی نیوەدوورگەی عەرەبییش.

---

[1] https://bestpractice.bmj.com/topics/en-gb/1602#referencePop2

* لە ساڵانی ١٩٥٠–١٩٥١دا، پەتای تای ڕیفت ڤاڵی لە باشووری ئەفریقا بڵاو بووەوە. ئەم پەتایە بوو بە هۆی نزیکەی ٥٠٠٠٠٠ حاڵەتی بەرهاویشتن و مردنی ١٠٠٠٠٠ سەر مەڕ.

* لە ساڵانی ١٩٧٧–١٩٧٨، بۆ یەکەم جار ئەم نەخۆشییە لە وڵاتی میسر دەرکەوت، تووشبوونی نزیکەی ٢٠٠٠٠٠ کەس و ١٨٠٠٠ حاڵەتی نەخۆشکەوتنی لێ کەوتەوە، لەوانە، بە لایەنی کەمەوە، ٥٩٨ حاڵەتی مردن، بە هۆی هەوکردنی مێشک و/ یان تای خوێنبەربوونەوە ڕووی دا.[1]

* ساڵی ١٩٧٨، لە زیمبابۆی بڵاو بووەتەوە و ٧٠٠٠٠ سەر ئاژەڵ تووش بوون و لەوانەش ١٠٠٠٠یان مردن.

* لە ساڵانی ١٩٩٧–١٩٩٨دا، لە کینیا و سۆماڵ و تانزانیا بڵاو بووەتەوە. لە کینیا تووشبوونی ٨٩٠٠٠ سەر ئاژەڵی لێ کەوتووەتەوە و لەوانە ٤٧٨ سەریان مردن. هەروەها ١٦٠٠٠٠ کەس تووش بوون و ٤٥٠ کەسیان مردن. لە سۆماڵ ٢٨٠٠٠ کەس تووش بوون و ١٧٠ کەسیان مردن. هەروەها لە تانزانیا، ٨٩٠٠٠ کەس تووش بوون و ٤٧٨ کەسیان مردن.

* ساڵی ٢٠٠٠، لە عەرەبستانی سعودیە زیاتر لە ١٠٠٠٠ سەر ئاژەڵ تووش بوون و ١٠٠٠یان لێ مردار بووەوە، ٨٨٣ کەس تووش بوون و ٢٤٥یان مردن.

* لە ساڵانی ٢٠٠٠–٢٠٠١، لە یەمەن، ٢٢٠٠٠ تووشبوونی ئاژەڵ هەبووە، کە ٦٠٠٠یان مردار بوونەوە. هەروەها ١٢٢٨ کەس تووش بوون و ١٦٦ کەسیان مردن.

* لە ساڵانی ٢٠٠٧–٢٠٠٨، لە سودان، ٧٥٠٠٠ کەس تووش بوون و ٢٢٢ کەسیان مردن.

---

[1] Johnson, Nicholas, The Role of Animals in Emerging Viral Diseases, Elsevier, London, UK, 2014, p.169

* له سالآنی ٢٠٠٨–٢٠٠٩، له مەدەغەشقەر ١٠٠٠٠ کەس تووش بوون و ٢٦ کەسیان مردن.

* له سالآنی ٢٠٠٦–٢٠٠٧، له ولاتانی سۆماڵ و تانزانیا و کینیا بڵاو بووەتەوە. له سۆماڵ ٣٥٠٠٠ کەس تووش بوون و ٥١ کەس مردن. له تانزانیا ٣٢٠٠٠ سەر ئاژەڵ تووش بوون و ٤٢٠٠ سەریان مردار بوونەوە، ٤٠٠٠٠ کەسیش تووش بوون و ١٠٩ کەسیان مردن. له کینیا ٧٥٠٠٠ کەس تووش بوون و ١٥٨ کەسیان مردن.

* له سالآنی ٢٠١٠–٢٠١١، له باشووری ئەفریقا، ١٤٣٤٢ سەر ئاژەڵ تووش بوون و ٨٨٧٧ سەریان مردار بوونەوە. هەروەها ٢٤٢ کەسیش تووش بوون و ٢٦ کەسیان مردن.[١]

* ساڵی ٢٠١٢، له مۆریتانیا، ٣٤ کەس تووش بوون و ١٧ کەسیان مردن.

* له سالآنی ٢٠١٣–٢٠١٤دا، له مۆریتانیا و سینیگال، چەند حاڵەتێکی کەمی تووشبوونی مرۆڤ له سینیگال و تووشبوونی وشتر له مۆریتانیا هەبوو.

* ساڵی ٢٠١٥، له مۆریتانیا، ٣١ کەس تووش بوون و ٨ کەسیان مردن.

* ساڵی ٢٠١٦، له نایجریا، ٣٤٨ کەس تووش بوون و ٣٣ کەسیان مردن.

* ساڵی ٢٠١٨، له کینیا ٢٦ کەس تووش بوون و ٦ کەسیان مردن، هەروەها ژمارەیەکی زۆر له حاڵەتی مردن و بەرهاویشتن له ناو ئاژەڵە کێڵگەییەکان، لەوانە، له ناو وشتر و بزندا ڕوویان دا.[٢]

[1] Nanyingi, Mark O, and co–workers, A systematic review of Rift Valley Fever epidemiology 1931–2014, Infection Ecology and Epidemiology 2015, 5: 28024.
[2] https://www.cdc.gov/vhf/rvf/outbreaks/summaries.html

## ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی وەک چەکێکی بایۆلۆجی

ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی، لە لایەن بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی هێرشبەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە، بە سەرکەوتوویی پەرەی پێ درا، پێش ئەوەی بەرنامەکە لە ساڵی ١٩٦٩دا بوەستێنرێت و لاببرێت. هەروەها، ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی وەک ڤایرۆسێکی زۆر مەترسیدار ناسێنراوە، ئەوەیش بە هۆی ئەوەی کە چەندین تایبەتمەندیی هەیە و بەکارهێنانی بۆ جەنگی بایۆلۆجی ئاسان دەکەن.

ساڵی ٢٠٠٤، وەزارەتی کشتوکاڵی ئەمەریکی لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر کاریگەرییەکان و سەختیی ڕووداوێکی بەکارهێنانی ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی وەک چەکێکی بایۆلۆجی کرد، مەزەندەی ئەوەی کرد کە زیانە ئابوورییەکانی بەکارهێنانی یەک لیتر لە ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی زیاتر لە پەنجا ملیار دۆلار دەبێت.[1]

* کاتێک جەنگی سارد لە لوتکەدا بوو، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کەنەدا، ژاپۆن و یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو، لەوانەیە وڵاتانی تریش، لە بەرنامەکانی چەکە بایۆلۆجییە هێرشبەرەکانیاندا، توێژینەوەیان لەسەر ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی کردبوو. باسکردنی ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دانانی بەرنامە هێرشبەرەکەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٤١دا، کە دامەزراندنی لیژنەیەکی بەکتریاناسیی جەنگیشی لەگەڵدا بوو. هەرچەندە زانیاریی زۆر سەبارەت بە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان تا ئێستا هەر بە نهێنی ماوەتەوە، بەڵام بەڵگە تۆمارکراوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە توێژینەوەی لەسەر نەخۆشیی تای ڕیفت ڤاڵی لە چوارچێوەی ئۆپەراسیۆنی Whitecoatدا کردووە. ئەم ئۆپەراسیۆنە بەرنامەیەکی سەرەکیی توێژینەوەی بەرگریی بایۆلۆجیی پزیشکیی ویلایەتە یەکگرتووەکان

---

[1] Rolin, Alicia I, and co-workers, The risk of Rift Valley fever virus introduction and establishment in the United States and European Union, Emerging Microbes and Infections (2013) 2.

بوو، لە نێوان ساڵانی ١٩٥٤–١٩٧٣، بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٦٩دا ئەم بەرنامەیەی ڕاگرت.[1]

### ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤالی

ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤالی نەخۆشخەرێکە، زیندەوەرە پێی جومگەدارەکان دەیگوازنەوە و خێرا بڵاو دەبێتەوە و مردنێکی زۆری لە مرۆڤ و ئاژەڵە کێڵگەییەکاندا لێ دەکەوێتەوە.[2]

ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤالی ڤایرۆسێکە لە ڕەگەزی ڤایرۆسی (Phlebovirus)ـە و لە خێزانی (Bunyaviridae)یە. ئەم ڤایرۆسە وەک هەموو (bunyaviruses)ـەکان، جینۆمێکی (genome) ڕایبەناوکەترشی (RNA) یەک تاڵی سێ پارچەی هەیە، کە جەمسەرگرییەکی سالب، یان موجەب و سالبی هەیە. تیرەی تەنۆکەی ڤایرۆسەکە ٩٠ – ١١٠ نانۆمەترە و لە بەرگێک و قەپیلکێکی پرۆتینی کە جینۆمەکەی تێدایە، پێک هاتووە، وێنەی (٤–٢).[3]




وێنەی (٤–٢):

[1] Amy, Hartman, Rift Valley Fever, Clin Lab Med. 2017 Jun; 37(2): 285–301.
[2] https://www.tandfonline.com/doi/pdf/10.4161/hv.6.7.11761
[3] Johnson, Nicholas, The Role of Animals in Emerging Viral Diseases, Elsevier, London, UK , 2014, pp. 171–172.

A– وێنەیەکی هێڵکاریی تەنۆکەیەکی ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی

B– جینۆمی ڤایرۆسەکە کە لە RNAیەکی سێ پارچەیی، L و M و S پێک هاتووە، L و M سالبن و S سەرێکی موجەبە و سەرێکیشی سالبە.

## بڵاوبوونەوەی تای ڕیفت ڤاڵی

بە گشتی، مرۆڤ لە ڕێی بەرکەوتنی بە خوێن، بە شلەکانی لەش یان بە شانەکانی ئاژەڵی تووشبووی وەک گاوگۆل، مەڕ، بزن، گامێش و وشتر، تووشی نەخۆشییەکە دەبێت. بەرکەوتنی ڕاستەوخۆش دەشێت ڕوو بدات؛ لە کاتی سەربڕین و پارچەپارچەکردن، لە کاتی چاودێریکردنی ئاژەڵی نەخۆش، لە کاتی ڕێکارەکانی ڤێترنەری وەک یارمەتیدانی ئاژەڵێک لە کاتی زاییندا یان کاتێک بەرهەمە نەکوڵاو یان تەواو نەکوڵاوەکانی ئاژەڵ بەکار دەهێنرێن.

هەروەها، مرۆڤ بە هۆی گەستنی مێشوولەی تووشبوو بە نەخۆشییەکە یان بە دەگمەن بە هۆی گەستنی مێرووەکانەوە، تووشی تای ڕیفت ڤاڵی دەبێت. لە تاقیگەکانیش، تووشبوون بەم نەخۆشییە ڕووی داوە کاتێک کارمەندانی ناو تاقیگەکە، لە ڕێی هەناسەدانەوە، ڤایرۆسەکەیان هەڵمژیوە کە لە هەوای تاقیگەکەدا هەبووە. ئەم جۆرە بڵاوبوونەوەیە پێی دەڵێن بڵاوبوونەوە بە ڕێگەی پرژە. بەڵگەی تۆمارکراو نییە دەربارەی ئەوەی کە ئەم نەخۆشییە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بگوازرێتەوە.

چەندین مێشوولە دەتوانن ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی بگوازنەوە، ئەوانەی زۆر باون بۆ گواستنەوەکە، مێشوولەکانی جۆری Aedes و Culexن. دۆخەکانی ژینگەش، بە تایبەتی بارانبارین، هۆکارێکی مەترسیداری گرنگن بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لە ناو مرۆڤ و ئاژەڵدا. بە زۆری بڵاوبوونەوەکانی نەخۆشییەکە پەیوەستە بە

بارانبــارینی زۆر و لافــاوەوە، چــونکە بــارانی زۆر دەبێــتە هــۆی ترووکانی هێلکەکانی مێشوولەکان.[1]

### نیشانەکانی تووشبوون بە نەخۆشیی تای ڕیفت ڤالی

• نیشانەکانی شێوە سووکەکەی نەخۆشیی ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤالی لە مرۆڤدا:

• مــاوەی نێــوان تووشــبوون بە نەخۆشــییەکە و دەرکەوتنــی نیشانەکانی، لە ٢ ڕۆژ بۆ ٦ ڕۆژە و دەگۆڕێت.

• ئەوانەی تــووش بــوون، تووشــی هــیچ نیشــانەیەک نــابن کە بدۆزرێتەوە، یاخود تووشی شێوەیەکی سووکی نەخۆشییەکە دەبن کە خەســڵەتەکانی بە نیشــانەی تــا ناســراوە، لەگەڵ دەســتپێکردنی لەناکــاوی تــایەکی وەک تــای ئەنفلــونزا، ئــازاری ماســوولکە، ئــازاری جــومگە و سەرئێشــە. هەنــدێک نەخــۆش تووشــی ڕەقبــوونی مــل، هەســتیاربوون بە ڕوونــاکی، نەمــانی ئیشــتیا و ڕشــانەوە دەبــن؛ لەم نەخۆشــانەدا، کاتێــک نەخۆشــییەکە لە قۆنــاغە ســەرەتاییەکانیدایە، دەشێت بە هەڵە بە هەوکردنی پەردەی مێشکی تێ بگەن.

• نیشــانەکانی نەخۆشــییەکە، بــۆ مــاوەی ٤. تــا ٧ ڕۆژ دەمێنــنەوە، دوای ئەوە، وەڵامــــدانەوەی بەرگریــــی لەش لەگەڵ دەرکەوتنــــی دژەتەنەکان (antibodies) هەستپێکراو دەبن و ڤایرۆسەکە لە خوێندا دیار نامینێت.

• نیشانەکانی شێوە توندەکەی نەخۆشیی ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤالی لە مرۆڤدا:

لە کاتێکــــدا زۆربەی حاڵەتەکــــانی تووشــــبوونی مــــرۆڤ بە نەخۆشییەکە تــا ڕادەیەک حــاڵەتی ســووکن، بەڵام ڕێژەیەکــی ســەدیی کەمی نەخۆشەکان تووشی شێوەیەکی توندتری نەخۆشییەکە دەبن.

---

[1] https://www.cdc.gov/vhf/rvf/index.html

شێوەی توندی نەخۆشییەکە بە شێوەی نیشانەیەک یان ٣ نیشانەی ڕوون و ئاشکرا دەردەکەون کە بریتین لە: نەخۆشیی چاو (٠,٥ – ٢٪ی نەخۆشەکان)، هەوکردنی مێشک و پەردەکانی (کەمتر لە ١٪ی نەخۆشەکان) یان تای خوێنبەربوون (کەمتر لە ١٪ی نەخۆشەکان).

نیشانەکانیش ئەوانەن:

• شێوەی نەخۆشیی چاو: لەم شێوەیەی نەخۆشییەکەدا نیشانەکانی پەیوەست بە شێوە سووکەکەی نەخۆشییەکە زامی تۆڕی چاوی لەگەڵدا دەبێت. زامەکان لە ناو چاودا، لە هەفتەیەک بۆ ٣ هەفتەی دوای دەرکەوتنی نیشانە سەرەتاییەکان دەست پێ دەکەن. نەخۆشەکە شتەکان بە لێڵی دەبینێ یان بینینی لاواز دەبێت. دەشێت نەخۆشییەکە، هەر لە خۆیەوە، لە ماوەی ١٠ بۆ ١٢دا هەفتە نەمێنێت و هیچ کاریگەرییەکیش دوای خۆی بەجێ نەهێڵێت. بەڵام کاتێک پەڵەی ناو چاو (macula) بریندار دەبێت، ٥٠٪ی نەخۆشەکان بینایی لە دەست دەدەن. مردنی ئەو نەخۆشانەی تەنها تووشی شێوەی نەخۆشیی چاو دەبن، کەمە.

• شێوەی هەوکردنی مێشک و پەردەکانی: دەستپێکردنی شێوەی هەوکردنی مێشک و پەردەکانی، بە شێوەیەکی ئاسایی، لە هەفتەیەک بۆ ٤ هەفتەی دوای دەرکەوتنی نیشانە سەرەتاییەکان دەست پێ دەکات. نیشانە سەرجێییەکان ئەمانەن: سەرئێشەیەکی توند، لەبیرچوونەوە، هەستشێوان، شپرزەیی، سەرلێشێوان، گێژی، کرژبوونی ماسوولکە، لەشداهێزران و بوورانەوە. دەشێت دواتر (دوای زیاتر لە ٦٠ ڕۆژ) هەندێک نەخۆشیی دەماریی لاوەکی لە نەخۆشەکەدا دەربکەون. ڕێژەی مردن لەو نەخۆشانەی تەنها تووشی ئەم شێوەیەی نەخۆشییەکە دەبن، کەمە، هەرچەندە ناتەواوی دەماریی ماوەیی دوای نەخۆشییەکە، کە دەشێت توند بێت، شتێکی باوە.

• شێوەی تای خوێنبەربوون: نیشانەکانی، ئەم شێوە نەخۆشییە دوای ٢ – ٤ ڕۆژ لە سەرەتای دەستپێکردنی نەخۆشییەکە

دەردەکەون، بە پەککەوتنی توندی جگەر، وەک زەردوویی، دەست پێ دەکەن. دوای ئەوە، نیشانەکانی خوێنبەربوون دەردەکەون، وەک خوێنهێنانەوە، هەبوونی خوێن لە پیسایدا، خوێنتێزانی پێست و خوێنهاتن لە لووت و پووک، زۆربی خوێنی بێنوێژی، خوێنهاتن لەو شوێنانەی کە خوێنیان بۆ پشکنین لێ دەرهێنراوە. ڕێژەی مردن بەو شێوە نەخۆشییەی تای خوێنبەربوون بەرزە و نزیکەی لە سەدا پەنجایە. بە گشتی، مردن دوای ٣ بۆ ٦ ڕۆژ لە دەرکەوتنی نیشانەکان ڕوو دەدات. دەشێت ڤایرۆسەکە، لە خوێنی ئەو نەخۆشانەی کە تووشی شێوە زەردوویییە خوێنبەربوونەکەی تای ڕیفت ڤاڵی بوون، تاکو ١٠ ڕۆژیش بدۆزرێتەوە.

ڕێژەی حاڵەتەکانی مردن بەگوێرەی شێوەی نەخۆشییەکە دەگۆڕێت، بەڵام لەو حاڵەتانەی تۆمار کراون، لە ١٪ کەمترە. زۆرینەی مردنەکان بە هۆی تووشبوون بە شێوە زەردوویییە خوێنبەربوونەکەی تای ڕیفت ڤاڵییە.[1]

تای ڕیفت ڤاڵی لە ئاژەڵدا دەبێتە هۆی نەخۆشییەکی توند تیایاندا و ئەم خەسڵەتانەی هەیە: تالێهاتن، لاوازبوون، بەرهاویشتن، ڕێژەیەکی زۆر توندی نەخۆشییەکە و مردن، بە تایبەتی لە ناو بێچووی ئاژەڵە تووشبووەکاندا. تووشبوون بە ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی دەبێتە هۆی بەرهاویشتن لە نزیکەی ١٠٠٪ی ئاژەڵە کێڵگەییە ئاوسەکاندا، زۆرینەی ئەو بێچووە ئاژەڵە تازەلەدایکبوانەی تووشی نەخۆشییەکە دەبن، دەمرن، لە کاتێکدا مردن لە ناو ئاژەڵە پێگەیشتووە تووشبووەکاندا زۆر کەمە.[2]

---

[1] https://www.who.int/news-room/fact-sheets/detail/rift-valley-fever#:~:text=RVF%20virus

[2] https://www.cdc.gov/vhf/rvf/symptoms/index.html

## چارەسەرکردن

لەبەر ئەوەی زۆرینەی حاڵەتەکانی تووشبوونی مرۆڤ بە نەخۆشیی تای ڕیفت ڤالی تا ڕادەیەک سووکن و کورتخایەنن، نەخۆشەکان پێویستیان بە چارەسەرێکی دیارکراو نییە. بۆ حاڵەتە زۆر توندەکانی نەخۆشییەکە، چارەسەری باو ئەوەیە نەخۆشەکە ببرێتە نەخۆشخانە و چارەسەرێکی گشتیی پاڵپشتیکەرانەی پیشکەش بکرێت. ڤاکسینێکی چالاکنەکراو بۆ بەکارهێنانی لە مرۆڤدا دروست کراوە؛ لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم ڤاکسینە مۆڵەتی پێ نەدراوە و لە ڕووی بازرگانییشەوە بەردەست نییە. ئەم ڤاکسینە، بە شێوەیەکی ئەزموونی، بۆ پاراستنی تاقمی کارمەندانی ڤێترنەری و تاقیگە لە مەترسی تووشبوون بە تای ڕیفت ڤالی بەکار هێنراوە. ڤاکسینە پێشنیازکراوکانی تریش لەژێر توێژینەوەدان.[1]

## خۆپاراستن

* دوورکەوتنەوە لە بەرکەوتنی خوێن، شلەکانی لەش یان شانەکانی ئاژەڵی تووشبوو. ئەوانەی مامەڵە لەگەڵ ئاژەڵی ئەو ناوچەیە دەکەن کە تای ڕیفت ڤاڵیی لێ بڵاو بووەتەوە، دەبێت هەندێک کەلوپەلی پاراستنی گونجاو لە بەر بکەن (وەک دەستکێش، جزمە، باڵاپۆشی درێژ و ڕووپاریز)، بۆ ئەوەی دوور بن لە هەر بەرکەوتنێکی خوێن یان شانەکانی هەر ئاژەڵێک کە دەشێت تووشی نەخۆشییەکە بووبێت.

* لە بەرهەمە ئاژەڵییە مەترسیدارەکان دوور بکەرەوە. بەرهەمە ئاژەڵییەکانی وەک (گۆشت، شیر و خوێن) دەبێت پێش خواردن یان خواردنەوەیان، زۆر بە باشی کوڵێنرابن.

[1] https://www.who.int/news-room/fact-sheets/detail/rift-valley-fever#:~:text=RVF%20virus

* خۆت لە مێشوولە و مێرووە خوێنمژەکانی تر بپارێزە. دەرمانی مێرووە دەرکەرەکان و پەردەتۆڕی قوماش لە ژووری نوستندا بەکار بهێنە. کراسی قۆڵدرێژ و پانتۆڵی درێژ بەکار بهێنە بۆ داپۆشینی سەرتاپای لەش.[1]

[1] https://www.cdc.gov/vhf/rvf/prevention/index.html

## تا خوێنبەربوونە ڤایرۆسییەکان – Viral hemorrhagic Fevers (VHFs)

تا خوێنبەربوونە ڤایرۆسییەکان کۆمەڵێک نەخۆشی دەگرنەوە کە بە هۆی چەند خێزانێکی جیاوازی ڤایرۆسەکانەوە ڕوو دەدەن. ئەم ڤایرۆسانە مەیلیان لەوەیە کە سەرچاوەکانیان ئاژەڵی بن، یان لە ئاژەڵێکدا نیشتەجێ ببن کە ئاژەڵەکە وەک خانەخوێ بێت، یاخود لە پێ جومگەییەکی گوێزەرەوەدا نیشتەجێ ببن. ئەم ڤایرۆسانە، بۆ مانەوەیان، بە تەواوی پشت بە خانەخوێیەکانیان دەبەستن. کرتێنەرەکان و پێ جومگەییەکان گەنجینە سەرەکییەکانی ئەو ڤایرۆسانەن کە دەبنە هۆی تای خوێنبەربوون، هەرچەندە خانەخوێیەکانی هەندێک لەو ڤایرۆسانە (وەکو ڤایرۆسی ماربورگ و ئیبۆلا) تا ئێستا نەزانراون. ڤایرۆسەکانی تا خوێنبەربوونە ڤایرۆسییەکان سەر بە چوار ڕەگەزی ڤایرۆسی جیاوازن، ڕەگەزەکانیش، ئەوانەن: flaviviruses، bunyavirsues، arenaviruses و filoviruses.[1]

بۆ نموونە، ڤایرۆسی زەردەتا، ڤایرۆسی تای دێنگەی (Dengue) و ڤایرۆسی زیکا... سەر بە ڕەگەزی *flaviviruses*ن.

ڤایرۆسی تای ڕیفت ڤاڵی، ڤایرۆسی تای خوێنبەربوونی کریمیەن و کۆنگۆ، ڤایرۆسی کۆنیشانەی هانتای سی... سەر بە ڕەگەزی *bunyaviruses*ن.

ڤایرۆسی تای لاسا، ڤایرۆسی تای خوێنبەربوونی لوجۆ، ڤایرۆسی تای خوێنبەربوونی ڤەنزویلایی... سەر بە ڕەگەزی *arenaviruses*ن.

---

[1] Cobo, Fernando, Imported Infectious Diseases, Woodhead Publishing is an imprint of Elsevier, London, UK, 2014, p. 243

ڤایرۆســی نەخۆشــیی ئیبــۆلا و ڤایرۆســی تــای خوێنبەربــوونی ماربورگ سەر بە ڕەگەزی[1] *filoviruses*ن.

ئەم ڤایرۆسانە چەندین خەسڵەتی هاوبەشیان لەگەڵ یەکدا هەیە:

* هەموویان ڤایرۆسی جۆری RNAین و بە بەرگێک داپۆشراون، وێنەی (٤-٣).

* لە ڕووی جــوگرافییەوە، بەو شــوێنانە ســنووردار کــراون کە جۆری خانەخوێیەکانیانی تێدا دەژی.

* مرۆڤ، گەنجینەی سروشتی، هیچ لەو ڤایرۆسانەی نییە.

* بڵاوبوونەوەی تا خوێنبەربوونە ڤایرۆسییەکان، بە شێوەیەکی نارێکوپێک و پچڕپچڕ ڕوو دەدەن.

* بە چەند هەڵاوێردنێکی کەمەوە، هیچ چارەسەرێکی تایبەت بۆ ئەم نەخۆشییە ڤایرۆسییانە لە بەردەستدا نییە.




[1] https://www.cdc.gov/vhf/virus–families/flaviviridae.html







*وێــــنەی (٤–٢)[1]: وێـــنەی تەنـــۆکە ڤایرۆســـی چـــوار ڤـــایرۆس (A) Arenavirus، (B) Bunyavirus، (C) Filovirus، (D) Flavivirus.*

[1] Martin, Aileen M, and co–workers, Viral Hemorrhagic Fevers, Clin Lab Med, 26, (2006), 345–386

ڤایرۆسەکانی تای خوێنبەربوون، لە ڕێی بەرکەوتن بە شلەکانی کرتێنەری هەڵگر، وەک پیسایی، لیکاو و میز، بۆ مرۆڤ دەگوێزرێنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ڤایرۆسانەی پەیوەستن بە پێ جومگەییە گوێزەرەوەکان، بە هۆی گەستنی ئەو پێ جومگەییانەوە بۆ مرۆڤ دەگوازرێنەوە. هەندێک لەو ڤایرۆسانە (وەک ڤایرۆسەکانی ئیبۆلا، ماربورگ، لاسا و کیریمیەن – کۆنگۆ Crimean–Congo)، دەشێت بە هۆی بەریەککەوتنی مرۆڤە تووشبووەکان، لە ڕێی شلەکانی لەشیان، یان لە ڕێی بەرکەوتن بەو شتانەی ڤایرساوی بوون، بگوازرێنەوە.

ئەم ڤایرۆسانە، بەگوێرەی ئەو شوێنەی کە خانەخوێیەکانیانی تێدا دەژین، دابەش بوون. هەندێک لەو خانەخوێیانە لە هەندێک ناوچەی جوگرافیی سنوورداردا دەژین، لەبەر ئەوە، مەترسیی تووشبوون بەو ڤایرۆسانە پەیوەستە بەو شوێنانەوە. هەندێک لە خانەخوێیەکانی ئەم ڤایرۆسانە نزیکەی بە هەموو شوێنێکی جیهاندا دابەش بوون، لەبەر ئەوە، ئەو خانەخوێیانە لە هەر کوێیەک هەبن، نەخۆشییەکە بۆ ئەو شوێنە دەگوازنەوە و مرۆڤ لەو شوێنانە تووش دەکەن. هەندێک جار ڤایرۆسەکان لە هەندێک شوێنی سنووردارن، بەڵام بە هۆی ڕۆیشتنی خەڵک بۆ ئەم شوێنانە، دواتر ڕۆیشتنیان بۆ شوێنانی تر، ڤایرۆسەکە بۆ ئەو شوێنە تازانە دەگوازنەوە، دەشێت ڤایرۆسەکە بە هۆی بەریەککەوتنی کەسەکانیش بگوازرێتەوە. بە هۆی ئەوەی لە ئێستادا گەشتکردن لەسەر ئاستی جیهان ئەوپەڕی بەرفراوانە، دەشێت ئەم نەخۆشییانە لە هەموو شوێنێکی جیهاندا بڵاو ببنەوە و دەبێت ئەوانەی خزمەتگوزاریی تەندروستی دابین دەکەن، ئەم ڕاستییە بزانن.[١]

[1] Cobo, Fernando, Imported Infectious Diseases, Woodhead Publishing is an imprint of Elsevier, London, UK, 2014, p. 244.

یەکێک لە هۆیەکانی بەکارهێنانی تۆکسینە بایۆلۆجییەکان بۆ چەکی بایۆلۆجی، ئەوەیە کە تۆکسینە بایۆلۆجییەکان زۆر لەو تۆکسینانەی کە مرۆڤ دروستیان دەکات، ژەهراویترن. بۆ ئەوەی تۆکسینێک بکرێتە چەکی بایۆلۆجی، دەبێت چەند خەسڵەتێکی لەبەرچاو بگیرێن و یەکێک لەو خەسڵەتانە ئەوەیە ژەهراوێتییەکەی زۆر بێت، واتە زۆر کوشندە بێت. ئەم خشتەیەی خوارەوە ژەهراوێتیی هەندێک لە تۆکسینە بایۆلۆجییەکان نیشان دەدات و ژەهراوێتییەکەیان بە سیانیدی پۆتاسیۆم بەراورد کراوە و ژەهراوێتیی سیانیدی پۆتاسیۆمیان بە یەک داناوە. بۆ ئەوەی بزانین ژەهراوێتیی سیاندی پۆتاسیۆم چەندە، ئەم نموونەیە دێنینەوە: کەوچکێکی چا لە سیاندی پۆتاسیۆم کە ٧,٢ گرام لە سیاندی پۆتاسیۆم دەگرێت و بدرێت بە ١٣ کەس کە هەریەکەیان کێشی ٧٣ کیلۆگرام بێت، ئەوا ١٢ کەس لەو ١٣ کەسە دەکوژێت.

خشتەی بەراوردکردنی ژەهراوێتیی هەندێک تۆکسینی بایۆلۆجی بە ژەهراوێتیی سیانیدی پۆتاسیۆم کە ژەهراوێتییەکەی بە ١ دانراوە.

| تۆکسینی بایۆلۆجی | ژەهراوێتی لەچاو ژەهراوێتیی سیانیدی پۆتاسیۆم (KCN) |
|---|---|
| دەمارەتۆکسینی ماری دەریا - Sea snake neurotoxin | ١٠٠ |
| تیترۆدۆتۆکسینی ماسی فوگو - Fugu fish Tetrodotoxin | ١٠٠٠ |
| پالیتۆکسینی مەرجان - Palytoxin from coral | ٢٩٤١ |
| تۆکسینە بۆتولینومی ئەی - Botulinum toxin A | ٩٠٩٠٩٠٠ |
| تۆکسینە بۆتولینومی دی - Botulinum toxin D | ٣١٢٥٠٠٠٠ |

*لەم خشتەیەدا دەردەکەوێت کە تۆکسینە بۆتولینومی D ژەهراویترین تۆکیسنی بایۆلۆجییە لە جیهاندا. تاقمی ئوم شینریکیو (Aum Shinrikyo) کە تاقمێکی ئایینیی توندڕەو بوون لە ژاپۆن، بە بڕوای خۆیان ئەم ژەهرەیان دروست کردبوو، بۆ ئەوەی دژی خەڵکی مەدەنی لە ژاپۆن بەکاری بهێنن، بەڵام خۆشبەختانە، ئەو جۆرە بۆتولینومەی ئەوان دروستیان کردبوو، ناچالاک بوو، لە ئەنجامدا شکستیان هێنا لەوەی خەڵکی مەدەنیی پێ بکوژن.*

## گۆڕینی تۆکسینەکان و تۆکسینە دروستکراوەکان

تۆکسین دەتوانرێت لە ڕووی پێکهاتی کیمیاییەوە دەستکاری بکرێت، بۆ ئەوەی ژەهراویتییەکەی و بەرهەڵستییەکەی بەرامبەر بە دەرمان و پێکوتەکان زیاتر بکرێت. هەروەها دەتوانرێت وردەزیندەوەرەکان لە ڕێی ئەندازەی بۆماوەییەوە بگۆڕرێن و دەستکاری بکرێن بۆ ئەوەی تۆکسینی ژەهراویتر بەرهەم بهێنن. بە هۆی پێشکەوتنی ئەندازەی بۆماوەزانییەوە، دەتوانرێت بە تەواوی تۆکسینی نوێ دروست بکرێن و پەرەیان پێ بدرێت کە لە ڕابوردوودا هەرگیز بوونیان نەبووبێت. بێگومان ئەمەش شۆکێکی ئەوپەڕی گەورە دەبێت بۆ ئایندەی بەرگریکردن لە دژی بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی لە لایەن تیرۆریستانەوە، یان بەرگریکردن لە کاریگەرییە بایۆلۆجییەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان. لە ڕابوردوودا، بڕی تۆکسینە بایۆلۆجییەکان بۆ دروستکردنی چەکە تۆکسینییەکان زۆر گرنگ بوو. بەڵام ئێستا وا نەماوە. تەنها بە زانینی زنجیرەی بەدوادابەیەکداهاتنی ترشە ئەمینییەکان لە پرۆتینی تۆکسینێکدا، دەتوانرێت تەواوکەرێکی DNA (complementary DNA)ی تۆکسینەکە دروست بکرێت، دواتر لەم تەواوکەرە DNAیە، بڕێکی زۆر لەو تۆکسینە دروست بکرێت.[1]

[1] Tu,A., Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, pp. 25–31.

**دەمارەتۆکسینەکانی ژەهری مار - Venom Neurotoxins**

ژەهـری مـار تـێکەڵەیەکە لە چەنـدین پرۆتینـی جیـاواز کە کـاری جیاوازیـان هەیە. لە گۆشـەنیگای دەرمـانزانییەوە، ژەهـری مـار ئەم تۆکسـینانەی تێـدایە: دەمارەتۆکسـین، خوێنبەربـوونە تۆکسـین، ماسـوولکە تۆکسـین و ئەنزیمـی هیالۆرینـدەیز (hyaluronidase) و خوێنشـیکەرەوە تۆکسـین و چەنـدین چالاکەتۆکسـینی ئەنزیمـی و هۆکارەکـانی گەشـەکردنی دەمـار و تۆکسـینە دڵییەکـان و تۆکسـینە گورچیلەییەکـان. لە نێـو ئەم تۆکسـینانەدا، ڕووسـیا دەمارەتۆکسـینی جۆری پشت پێکبەند (postsynapse)ی وەک چەکێکی تۆکسینی پەرە پێ دابوو. ساڵی ١٩٨٣، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆی دەرکەوت کە یەکێتیـی سـۆڤییەت لە ڕێـی بەکارهێنـانی دەمارەتۆکسـینەکانی ژەهری ماری ناجا ئۆکسیانە (Naja oxiana)ی ئۆزبەکستانەوە پەرەی بە چەندین چەکی تۆکسینی داوە. هەروەهـا دەمارەتۆکسینی کلۆنکراو (cloned)ی ڕووسی لە نۆڤۆسیبیرسک لە سیبریا بۆ ئەمەریکا ئاشکرا بـوو. ئەم هەواڵە حکـومەتی ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی تووشـی شـۆک کـرد و فەرمـانی بـۆ سـوپای ئەمەریکـا دەرکـرد کە دژێـک بـۆ ئەم تۆکسـینە بـدۆزنەوە. لەو کـاتەوە سـوپای ئەمەریکـا بەرپرسـیارێتیی پەرەپێدانی هەموو جۆرەکانی تۆکسینە سروشتییەکانی خرایە ئەستۆ، لەوانە، تۆکسینە دەریاییەکان. سوپای ئەمەریکا، لە ماوەیەکی کورتدا، چەنـدین دامەزراوە و تاقیگەیـان دروسـت کـرد بـۆ تـوێژینەوە و پەرەپێدانی تۆکسینە سروشتییەکان.

## دەمارەتۆکسینی ژەهری مار چۆن ماسوولکەکان تووشی ئیفلیجی دەکەن؟

لە حاڵەتی گواستنەوەی ئاساییترپە دەمارییەکان، ئەسیتیل کۆلین لە کۆتایی دەمارەخانەوە دەردەپەڕێت و بە کەلێنی پێکبەندیدا (synaptic gap) دەڕوات بۆ ئەوەی بگاتە وەرگری ئەسیتیل کۆلین (acetylcholine receptor) لە دەمارەخانەیەکی تر. ئەسیتیل کۆلین پرۆتینێکی پەردەییە و لە پێنج یەکەی بچووک پێک دێت: دوو یەکەی ئەلفا (α) و یەکەکانی بیتا و گاما و دەلتا (β و γ و δ). کاتێک گەردی (molecule) ئەسیتیل کۆلین بە وەرگرەکەوە دەنووسێت، کەناڵ (جۆگە)ی دەمارەخانەکە دەکرێتەوە و ڕێگە بە ڕۆیشتنی ئایۆنەکانی سۆدیۆم دەدات و ترپە دەمارییەکان دەگوازرێنەوە، ئەمەش میکانیزمی گواستنەوەی دەمارییە لە ماسوولکەدا وەک لە وێنەی (٥-١)دا دەردەکەوێت.




*وێنەی (٥-١): نووسانی ئەسیتیل کۆلین بە یەکە بچووکەکانی وەرگری ئەسیتیل کۆلینەوە*

دەمارەتۆکسینی ژەهری مار بە هەمان شوێنەکانی ئەلفا وەرگرەکانی دەمارەخانەوە دەنووسێت، بەڵام ناتوانێت کەناڵی ڕۆیشتنی ئایۆنەکانی سۆدیۆم بکاتەوە، بە نەکرانەوەی کەناڵی ڕۆیشتنی ئایۆنەکانی سۆدیۆم، ئایۆنەکانی سۆدیۆم ناگوازرێنەوە و لە

ئەنجامـــدا تـــرپە دەمارییەکـــان لە دەمارەکـــانی ماسـّــوولکەکاندا ناگوازرێنەوە و ماسوولکەکان تووشی ئیفلیجی دەبن، وەک لە وێنەی (٥-٢) پیشان دراوە.




وێنەی (٥-٢): دەمارەتۆکسینی ژەهری مار بە هەمان شوێنەکانی ئەلفا وەرگرەکەوە دەنووسێت، بەڵام ناتوانێت کەناڵەکانی ڕۆیشتنی ئایۆنەکانی سۆدیۆم ($Na^+$) بکاتەوە.

دەشـێت لە داهـاتوودا، تۆکسـینەکانی جاڵجـاڵۆکە و دووپشـک و مێروولەکان بەسوود بن بۆ ئەوەی بکرێن بە چەکی بایۆلۆجی.[١]

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism, CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, pp.40–42.

## Marine Toxins – تۆکسینە دەریاییەکان

تۆکسینە دەریاییەکان، چەندین خەسڵەتی بێوێنە و گەلێک پێکهاتی کیمیاییــان هەیە کە لە تۆکیســـنەکانی وشــکانیدا نــین. ســاڵی ١٩٩٦، ســوپای ڕزگــاریخوازی گەلــی چــین کتێبێکــی ٥٣٥ لاپەڕەییــان بــڵاو کردەوە بە ناوی مارین بایۆتۆکسیکۆلۆجی (Marine Biotoxicology). لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا، بە سەردێڕی (تۆکسینە دەریاییەکـان و گرنگیــی ســەربازییان)، باســی ئەوە کــراوە کە "زۆر گــرنگە، بــۆ نەوە نوێیەکــانی چەکە کیمیاییەکــان، هۆکارەکانیــان زۆر ژەهراویتــر بــن و کاریگەرییــان لەســەر قوربــانییەکە خێراتــر بێــت، کــاری دەرمــانزانیی تایبەتیان پێویست بێت، بە قورسی بەرگرییان لێ بکرێت، بە زەحمەت قوربانییەکانیان چاک ببنەوە، بە ئاســانی دروست بکرێن، دۆزینەوە و هەســـتپێکردنیان ئاســـان نەبێــت. هەنــدێک تۆکســینی دەریــایی ئەم مەرجانەیــان تێدایە." چەنــدین جــۆر لە تۆکســینی دەریــایی هەیە، بەڵام ئەســتەمە، لێــرەدا هەمــوو ئەم جــۆرانە بــاس بکــرێن. لەبەر ئەوە، ئەو تۆکسینە دەرياييانە باس دەکەین کە بۆ مەبەستە سەربازییەکان بەکار دەهێنرێن.

## tetrodotoxin (TTX) – تێترۆدۆتۆکسین

تێترۆدۆتۆکســـــین تۆکســـــینێکە لە خڕەماســـــی (fish puffer) دەردەهێنرێ و زۆر لە وڵاتــان تــوێژینەوەی لەســەر دەکەن، بــۆ ئەوەی لە داهــاتوودا وەک چەکێکــی بــایۆلۆجی بەکــاری بهێــنن. ئەم تۆکســینە توێژینەوەی زۆر باشی لەسەر کراوە. پێکهاتە کیمیاییەکەی لە وێنەی (٥-٣)دا پیشـــــان دراوە. وەک لە وێـــــنەکەدا دیـــــارە، جـــــگە لە

تیترۆدۆتۆکسین، هەشت جۆر لە لێوەرگیراوی (derivative) تیترۆدۆتۆکسین هەیە، ئەو لێوەرگیراوانەش، بە گۆڕینی کۆمەڵەکانی $R_1$ و $R_2$ یان $R_3$ و $R_4$ لە تیتردۆتۆکسینەکە دروست دەبن، بۆ نموونە، ئەگەر $R_1$ و $R_2$ی تیترۆدۆتۆکسینەکە بگۆڕینەوە، واتە $R_1$ بکەین بە $CH_2OH$ و $R_2$ بکەین بە OH وەک لە وێنەکەدا دیارە، ئەوا تیترۆدۆتۆکسینەکە دەگۆڕێت بۆ ئاویتەیەکی تر و پێی دەڵێن 6-epiTTX. دوو تۆکسینی تری دەریایی هەن، ئەوانیش، ساکسیتۆکسین (Saxitoxin) و گۆنیاوتۆکسین (Gonyautoxin)ن. کاریگەریی ژەهراوییان لەسەر لەشی گیانەوەران وەک کاریگەریی تیترۆدۆتۆکسین وایە و لە پێکهاتی کیمیاییشدا لەو دەچن.







| | $R_1$ | $R_2$ |
|---|---|---|
| 1 TTX | OH | $^{11}CH_2OH$ |
| 2 6-*epi*TTX | $^{11}CH_2OH$ | OH |
| 3 11-*deoxy*TTX | OH | Me |
| 4 11-*oxo*TTX | OH | CHO |
| 5 11-*nor*TTX-6R-ol | H | OH |
| 6 11-*nor*TTX-6S-ol | OH | H |
| 7 Chiriquitoxin | OH | $\overset{R}{C}H(OH)\overset{S}{C}H(NH_2)COOH$ |

| | $R_3$ | $R_4$ |
|---|---|---|
| 8 1-hydroxy-5,11-deoxyTTX | OH | OH |
| 9 5,6,11-trideoxyTTX | H | H |

*وێنەی (٥-٣): پێکهاتی کیمیایی تیترۆدۆتۆکسین*

پێکهاتە کیمیاییەکانی ساکسیتۆکسین و گۆنیاوتۆکسین لە وێنەی (٥ـ٤)دا نیشان دراون. ئەم تۆکسینانەش ژەهرەدەمارن و کار لە کەنالی سۆدیۆم لە تەوەرە دەمارەخانە (axon)دا دەکەن. تێترۆدۆتۆکسین تۆکسینێکی چێوەدەمارە و کار لە ناوەندە کۆئەندامەدەمار ناکات.

لە ڕابوردوودا، سوپای ئەمەریکا بڕێکی زۆری ساکسیتۆکسینی دروست کرد بۆ ئەوەی وەک چەکی بایۆلۆجی بەکاری بهێنێت، بەڵام ساڵی ١٩٦٩، سەرۆکی ئەو کاتەی ئەمەریکا، ڕیچارد نیکسۆن، ڕای گەیاند کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چیتر چەکی بایۆلۆجی بەکار ناهێنێت و هەموو بەرنامەکانی چەکە بایۆلۆجییەکانی ڕاگرتووە.










*وێنەی (٥ـ٤) پێکهاتی کیمیایی ساکسیتۆکسین و گۆنیاوتۆکسین (II) و گۆنیاوتۆکسین (III)*

تیترۆدۆتۆکسین و ساکسیتۆکسین و گۆنیاوتۆکسین، ئەوانە هەموویان جووڵەی ئایۆنی سۆدیۆم لە دەرمارەخانەکاندا ڕادەگرن، ئەوەیش بە داخستنی سەری کەناڵی ڕۆیشتنی ئایۆنی سۆدیۆم لەو دەمارەخانانەدا، وەک لە وێنەی (٥–٥)دا دەردەکەوێت.[1]




وێنەی (٥–٥): ئەم وێنەیە، ئەوە پیشان دەدات کە چۆن تیترۆدۆتۆکسین (TTX) سەری کەناڵی ڕۆیشتنی سۆدیۆم لە دەمارەخانەدا دادەخات.

تیترۆدۆتۆکسین یەکێکە لە دەمارەتۆکسینە ئەوپەڕی بەهێزە ناسراوەکان و ژەهراوێتییەکەی بۆ مرۆڤ نزیکەی ١٢٠٠ جار لە ژەهراوێتیی سیانید زیاترە و دژەژەهریشی (antidote) نییە.[2]

کوشندەژەمی تیترۆدۆتۆکسین بۆ مرۆڤ نزیکەی ١ بۆ ٢ میللیگرامە و کەمترین ژەم (dose)ی پێویستیش بۆ دەرکەوتنی نیشانەکانی ژەهراویبوون، ٠,٢ میللیگرامە. نیشانەکانی ژەهراویبوون

---

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism, CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, pp.42–45.

[2] Lago, Jorge, and co–workers, Tetrodotoxin, an Extremely Potent Marine Neurotoxin: Distribution, Toxicity, Origin and Therapeutical Uses, Mar. Drugs 2015, 13, 6384–6406.

به تیرۆدۆتۆکسین، له ۱۰ بۆ ٤٥ خولەک دوای خواردنی دەردەکەون، بەڵام دەشێت نیشانەکان ۳ کاژێر یان زیاتر دوا بکەون.[1]

کوشندەژەمی مامناوەندی (LD50)ی ساکسیتۆکسین بۆ مرۆڤ ٥,٧ مایکرۆگرام\ کیلۆگرامە، کەواتە ٥,٧ میللیگرام لە ساکسیتۆکسین، ئەگەر کەسێک لە ڕێی دەمەوە بیخوات، ئەوا پێی دەمرێت. کوشندەژەمی ساکسیتۆکسین، ئەگەر بە دەرزی لە کەسێک بدرێت، یەک لەسەر دەی ئەو بڕەیە لە ڕێی دەمەوە دەخورێت، واتە ۰,٥٧ مایکرۆگرام\ کیلۆگرام. کوشندەژەمی مامناوەندیی ساکسیتۆکسین، ئەگەر بە شێوەی پرژە بێت لە ناو هەوادا، کەسێک لە ڕێی هەناسەدانەوە هەڵی بمژێت، بە ٥ میللیگرام.خولەک\ مەترسێجا مەزەندە دەکرێت. دەشێت ساکسیتۆکسین لە ڕێی برینی کراوەوە بچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە، کوشندەژەمی ساکسیتۆکسین بەم ڕێگەیە، بە ٥٠ مایکرۆگرام\ کەس پێشبینی کراوە.[2]

### تۆکسینی کۆنەس – Conus Toxin

کۆنەس (Conus) یان قووچەکە هێلکەشایتانۆکە، لە ڕەگەزی ئاژەڵی دەریاییە، لە ڕێی تێکردنی ژەهر بە ددانە باریکە درێژبووەکانیەوە، نێچیرەکەی دەگرێت. ژەهری کۆنەس چەندین جۆر تۆکسینی تێدایە. تۆکسینی کۆنەس وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار دەهێنرێت، چونکە بە ئاسانی دەست دەکەوێت و چەندین جۆری جیاوازی لە فرەپێتید (polypeptide) تێدایە کە لە ڕووی دەرمانزانییەوە گەلێک چالاکیی جیاوازیان هەیە. قەبارەی فرەپێتیدەکانی تۆکسینی کۆنەس تا ڕادەیەک بچووکن و بە ئاسانی دەتوانرێت دروست بکرێن. هەروەها دەتوانرێت جۆرە جیاوازەکانی

---

[1] https://www.cfs.gov.hk/english/multimedia/multimedia_pub/multimedia_pub_fsf_09_01.html

[2] https://en.wikipedia.org/wiki/Saxitoxin#Toxicology

تۆکسینەکانی کۆنەس، بە ڕێگەکانی ئەندازەی بۆماوەیی، بە ئاسانی دروست بکرێن. تۆکسینی میو-کۆنۆتۆکسین (μ–conotoxin)، وەک تێترۆدۆتۆکسین، سەری کەناڵی چوونەژوورەوەی ئایۆنی سۆدیۆم دادەخات. بە هەمان شێوە، تۆکسینی ئۆمیگا-کۆنۆتۆکسین (ω–conotoxin)یش سەری کەناڵی چوونەژوورەوەی ئایۆنی کالیسیۆم دادەخات.

ژەهری قووچەکەشەیتانۆکە چەندین جۆری جیاواز لە تۆکسینی تێدایە. هەر پێپتیدێکی ئەو تۆکسینانە کاریگەرییەکی جیاوازی لە پێپتیدەکانی تر هەیە. سوپای ڕزگاریخوازی گەلی چین چەندین پێپتیدی ئەم تۆکسینانەیان بە ڕێگەی کیمیای ئەندامی دروست کردووە.

## پالیتۆکسین – Palytoxin (PLTX)

گرووپی چەکە کیمیاییە چینییەکان، پێش ئەوەی توێژینەوە لەسەر کۆنۆتۆکسین بکەن، توێژینەوەیان لەسەر پالیتۆکسین (palytoxin) کرد. پالیتۆکسین تۆکسینێکە لە شیلانی پالیثۆوا تۆکسیکا ( Palythoa toxicca) دەردەهێنرێت کە لە دوورگەی هاوای هەیە. گرووپی چەکە کیمیاییە چینییەکان، بەکارهێنانی ئەم تۆکسینەیان ڕاگرت، چونکە بە زەحمەت بڕێکی تەواوی ئەم تۆکسینەیان دەست دەکەوت و هەروەها دروستکردنەکەشی بە ڕێگەی کیمیایی قورس بوو، چونکە پێکهاتە کیمیاییەکەی ئاڵۆز بوو. Y. Hirata و D. Uemuraی ژاپۆنی پێکهاتی کیمیایی پالیتۆکسینیان دیاری کرد. هەروەها، ریچارد ئی. موور، Richard E. Moore کە مامۆستا بوو لە زانکۆی هاوای، بەبێ ئەوەی ئاگای لەو دوو پسپۆڕە ژاپۆنییە بێت، پێکهاتی کیمیایی پالیۆکسینی دیاری کرد.[1]

---

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism, CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, pp. 45–48.

پالیتۆکسین یەکێکە لەو تۆکسینە هەرە بەهێزانەی کە تا ئێستا مرۆڤایەتی پێی زانیبێت و مەترسییەکی زۆر گەورە بۆ سەر مرۆڤ دروست دەکات، کاتێک لە ڕێی خواردن، هەڵمژین یان پێستەوە دەچێتە ناو لەشیەوە. پالیتۆکسین زۆر ژەهرە، دەتوانێت کار لە چەند ئەندامێکی لەش بکات و نیشانەکانی ژەهراویبوونەکەی زۆر توندن، لەوانە، مردنیشی لێ دەکەوێتەوە.[١]

---

[1] Thakur, Lokendra K, and . Jha, Kunal K, Palytoxin–induced acute respiratory failure, Respir Med Case Rep. 2017; 20: 4–6.

**ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی**

**Staphylococcal enterotoxin B (SEB) –**

یەکێک لە تۆکسینە مەترسیدارە هەرە گرنگەکان بۆ جەنگ یان بەکارهێنانی وەک چەکێکی بایۆلۆجی بۆ تیرۆریزم، ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەییە (SEB)، کە تۆکسینێکی پەکخەرە. ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی، بایەخی پێ دراوە و وەک چەکێکی بایۆلۆجی بۆ هێرشبردن بەرهەم هێنراوە. ئەم تۆکسینە بووەتە هۆی زۆر ڕووداوی خۆراکە ژەهراویبوونی بەکۆمەڵ. بەکتریای ستافیلۆکۆکەس ئۆریەس (Staphylococcus aureus) ئەم تۆکسینە دروست دەکات و تەنها تۆکسینی ئەم بەکتریایەیە کە وەک هۆکارێکی زیندە–تیرۆر (bio–terror agent) پۆلێن بکرێت. ئەم بەکتریایە، بە گشتی، بە ژمارەیەکی ئەوپەڕی زۆر لەسەر ناوپۆشەپەردەکان و پێستی مرۆڤ و گیانەوەرە خوێنگەرمەکاندا هەیە و بەکتریایەکە سپۆر دروست ناکات، ناجووڵێت، دەتوانێت لەو بارودۆخانەدا بژی کە ئۆکسجینیان تێدا بێت یاخود تێدا نەبێت.

ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی دەبێتە هۆکارێکی زیندەتیرۆریزم لە داهاتوودا، چونکە بە ئاسانی بەرهەم دەهێنرێت و بڵاو دەکرێتەوە، دەرکەوتنی نیشانەکانی تووشبوونی دوا دەکەون. ئەم تۆکسینە توانای ئەوەی هەیە ژمارەیەکی زۆر کەس تووشی ژەهراویبوون بکات و ژەهراویبوون بەم تۆکسینە لەگەڵ ژەهراویبوونی سروشتی بە زەحمەت لێک جیا دەکرێنەوە.

لە ساڵانی ١٩٦٠ەکاندا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرنامەیەکی چەکی بایۆلۆجیی پەلاماردەرانەی هەبوو،

ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی یەکێک لەو هۆکارانە بوو کە وەک چەکێکی بایۆلۆجی تویژینەوەی لەسەر کردبوو، بۆ ئەوەی لە مەیدانی جەنگدا بۆ پەککخستنی سەربازانی دوژمن بەکار بهێنرێت. ئەم تۆکسینە هۆکارێکی سەرنجڕاکێش بوو، چونکە بڕێکی کەمی پێویست بوو بۆ پەککخستنی ئامانجی مەبەست، کاتێک لەگەڵ ئەو هۆکارە کیمیاییانەی کە لە تاقیگە ئامادە دەکران، بەراورد دەکرا. دوای هێرشی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەستی بەوە کرد کە زیندەتیرۆریستان (bioterrorists – ئەو تیرۆریستانەی هۆکاری بایۆلۆجی بەکار دەهێنن)، دەتوانن هەموو چەکێک بۆ ئەنجامدانی هەڕەشەکانیان بەکار بهێنن.

به تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە کەوتنەبەر پرژەی ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی لە هەوادا، ژەمەکاریگەرییە مامناوەندییەکەی (ED50)، ٠,٠٠٠٤ مایکرۆگرام\ کیلۆگرامە. هەروەها ژەمەکوشندەی مامناوەندییەکەی (LD50)، ٠,٠٢ مایکرۆگرام\ کیلۆگرامە.

ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی دەشێت بە کردار چەکێکی زیندەتیرۆریستی بێت، چونکە دەتوانرێت بە شێوەیەکی زۆر خاوێن، لە سەراوکەوتەی چێنراوی بەکتریای ستافیلۆکۆکەسی ئۆریەس جیا بکرێتەوە و دەربهێنرێت.[1]

## چۆنێتیی ژەهراوییبوون بە ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی

ژەهراوییبوون بە ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی، بە شێوەیەکی سەرەکی بە هۆی بەکارهێنانی خۆراک یان ئاوی پیسبوو بەم تۆکسینە ڕوو دەدات. هەروەها بە هەڕەشەیەکی زیندەتیرۆر

[1] Ahanotu, Ejem, and co–workers, Staphylococcal Enterotoxin B as a Biological Weapon:
Recognition, Management, and Surveillance of Staphylococcal Enterotoxin, Applied Biosafety, 11(3) pp. 120–126 © ABSA 2006

دادەنرێت، بە هۆی ئەگەری بەکارهێنانی لە ژەهراویکردنی خۆراکدا. ڕێگەکانی دیکەی چوونەناو لەشی مرۆڤ، کۆئەندامی هەناسە، ئەندامی زێی مێینە و چاوە. ئەم تۆکسینە، لە ڕێی هەوا یان بەرکەوتنەوە، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر ناگوازرێتەوە.

ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی، وەک هۆکارێکی جەنگی بایۆلۆجی، چەندین خەسڵەتی هەیە، لەوانە، توانەوەی لە ئاودا، تا ڕادەیەک زۆر بەرگەی گەرمی دەگرێت، بەرگەی ئاستە ترشەکانی پەیتی ئایۆنی هایدرۆجینی (pH) دەگرێت و بە ئاسانی بڵاو دەکرێتەوە.

## نیشانەکانی ژەهراوییوون بە ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی

نیشانەکانی ژەهراوییوونەکە دەکەوێتە سەر ڕێگەی تووشبوون بە تۆکسینەکە.

ئەم تۆکسینە ئەوپەڕی مەترسیدارە، کاتێک لە ڕێی هەناسەدانەوە هەڵدەمژرێت، لە ماوەی ٣ – ١٢ کاژێر لە هەڵمژینی، دەبێتە هۆی تایەکی قورس، وێڕای کۆکە، لەرزین، سەرئێشە و ئازاری ماسوولکە. هەڵمژینی بڕێکی زۆر لەم تۆکسینە، دەشێت ببێت بە هۆی تەنگەنەفەسییەکی توند، ئازاری سنگ، هەوکردنی سییەکان، تووشبوونی شۆک و پەککەوتنی چەندین ئەندامێکی لەش.

لە دوای قووتدانی ڕیخۆڵەتۆکسینی بیی ستافیلۆکۆکەیی، لە ماوەی ١ – ٨ کاژێردا دەبێتە هۆی هەوکردنی ڕیخۆڵە، دڵتێکەڵهاتن، ڕشانەوە، سکچوون و ژانەسک، بەبێ ئەوەی تووشبووەکە تووشی تا بێت، یان نیشانەکانی تووشبوونی کۆئەندامی هەناسەدانی هەبێت. بە گشتی، نیشانەکان لە ماوەی ٢٤ – ٤٨ کاژێردا نامێنن.[1]

---

[1] Berger, Tamar, and co–workers, Toxins as biological weapons for terror characteristics, Disaster and Military Medicine challenges and medical countermeasures: a mini–review, 2:7, 2016

کاتێـک ڕیخۆڵەتۆکسـینی بیـی سـتافیلۆکۆکەیی هەڵـدەمژرێت و دەچێتە نـاو سـووڕی خـوێنەوە، هەوکردنـی بۆرییەکـانی خـوێن ڕوو دەدات کە شـۆکێکی ژەهراویـی لـێ دەکەوێـتەوە. دوای دوو کـاژێر لە ژەهراوییبوون، تووشـبووەکە تووشـی لێڵبینـی، سـەرئێشـە، ئـازاری زگ، سکچوون، ڕشانەوە و لاوازیی گشتیی لەش دەبێت.

ئەگەر ڕیخۆڵەتۆکسـینی بیـی سـتافیلۆکۆکەیی لە ڕێـی پێسـتەوە بمژرێت، دەبێتە هۆی هەوکردن و هەستیارییەکی زۆری پێست. ئەگەر چاو ئەم تۆکسینەی بەرکەوت، ئەوا تووشی هەوکردن دەبێت.[١]

**چارەسەرکردن**

چارەسـەرکردنی ژەهراوییبـوون بە ڕیخۆڵەتۆکسـینی بیـی سـتافیلۆکۆکەیی، بە شـێوەیەکی سـەرەکی ورەبەرزکـردنەوە، سۆزدەربڕین بۆ تووشبووەکە، یارمەتیدانی پزیشکی و ئەگەر شلەی لەشـی بە هـۆی سـکچوونەوە کەم بـووەوە، ئەوا لە ڕێـی دەمـارەوە شـلەی تـێ دەکرێـت. تـاکو سـاڵی ٢٠١٦، دژەژەهـر (antidote) یـان ڤاکسـین بەردەسـت نەبـووە بـۆ چارەسـەری ژەهراوییبـوونەکە. چەنـد هەوڵێکی بەردەوام هەیە بۆ دروستکردنی ڤاکسینێک، بەڵام لە قۆنـاغی سەرەتاییدان.[٢]

---

[1] Ahanotu, Ejem, and co–workers, Staphylococcal Enterotoxin B as a Biological Weapon:
Recognition, Management, and Surveillance of Staphylococcal Enterotoxin, Applied Biosafety, 11(3) pp. 120–126 © ABSA 2006

[2] Berger, Tamar, and co–workers, Toxins as biological weapons for terror characteristics, Disaster and Military Medicine challenges and medical countermeasures: a mini–review, 2:7, 2016

## تۆكسینی ڕایسین – Ricin Toxin

ڕایسین، پرۆتینێکە لە دەنکی ڕووەکی گەرچەکدایە و ساڵی ١٨٩٠ پیتەر هێرمان ستیلمارک لە زانکۆی تاتو (Tatu)ی وڵاتی ئێستۆنیا جیای کردووەتەوە و ناساندوویەتی. حاڵەتەکانی تووشبوون بە ڕایسین دەگمەنن، چونکە بەری ڕووەکی گەرچەک بەوە ناسراوە کە ژەهرە.[١]

دەشێت ڕایسین بە شێوەی هاڕاوە، پرژە یان حەبێکی بچووک بێت. ڕایسین لە ئاو یان ترشێکی لاوازدا دەتوێتەوە. لە بارودۆخی ئاساییدا جێگیرە، بەڵام ئەگەر تا سەروو ٨٠ پلەی سەدی گەرم بکرێت، ناچالاک دەبێت. ئەگەر یەکێک دەنکەکانی گەرچەک بخوات، ئەوا تووشی ژەهراویبوون دەبێت. ئەگەر ڕایسین لە دەنکەکانی گەرچەک دەربهێنرێت و پاک بکرێتەوە، دەتوانرێت وەک هۆکارێکی بایۆلۆجی یان تیرۆریستی بەکار بهێنرێت و دەتوانرێت لە ڕێی پرژە لە ناو هەوا، لە ناو خۆراک یان لە ناو ئاودا خەڵکی پێ ژەهراوی بکرێت.

ئەگەر یەکێک تووشی ژەهراویبوون بە ڕایسین بوو، ئەوا ژەهراویبوونەکە بۆ کەسی تر ناگوازرێتەوە، بەڵام ئەگەر کەسێک ڕایسین بە لەشی یان جلەکانیەوە بێت و کەسێکی تر بەر لەشی یان جلەکانی بکەوێت، ئەوا ڕایسینەکە بۆ ئەو کەسەش دەگوازرێتەوە و تووشی ژەهراویبوونی دەکات.[٢]

---

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, p.38.

[2] https://emergency.cdc.gov/agent/ricin/facts.asp

## ڕایسین وەک چەکێکی بایۆلۆجی بۆ کوشتن و جەنگی بایۆلۆجی

* جۆرجی مارکۆڤی بولگاری، تەمەن ٤٩ ساڵ، ڕۆماننووس و شانۆنووس بوو. مارکۆڤ لە ساڵانی ١٩٧٠دا، دوای ئەوەی شانۆییەکی پڕ مشتومڕی لە بولگاریا پێشکەش کرد، ناچار بوو وڵاتەکە بەجێ بهێڵێت و لە لەندەن نیشتەجێ ببێت. لە ٧ی سێپتەمبەری ١٩٧٨، کاتێک مارکۆڤ لە وێستگەیەکی پاس چاوەڕوانی پاسی دەکرد، هەستی بەوە کرد کە شتێکی ئازاربەخش بەر ڕانی ڕاستی کەوتووە و کاتێک ئاوڕی دایەوە، پیاوێکی بینی کە چەترێکی هەڵگرتبوو. دوای چوار ڕۆژ مارکۆڤ مرد.

* ڤلادیمیر کۆستۆڤ دوورخراوەیەکی بولگاری بوو و لە پاریس دەژیا. لە ٢٦ی ئابی ١٩٧٨، دوو هەفتە دوای کوشتنی مارکۆڤ، کاتێک کۆستۆڤ لە وێستگەی میترۆ لە پاریس وەستابوو، هەستی بەوە کرد شتێک بەر پشتی کەوتووە. هەروەها گوێی لە دەنگێک بوو کە وەک دەنگی تەقاندنی دەمانچە بوو. کۆستۆڤ هەستی بە تالێهاتن کرد و بۆ ماوەی ١٢ ڕۆژ لە نەخۆشخانە مایەوە و چاک بووەوە. کەپسوولێکی زۆر بچووکیان لە پشتی دەرهێنا، وەک ئەوەی لە ڕانی مارکۆڤ دەرهێنرابوو، وابوو. کوستۆڤ، جلی ئەستووری لە بەردا بوو، کەپسوولەکە زۆر بە قووڵی نەچووبوو بە ناو گۆشتی پشتیدا، بۆ ئەوەی ئەو مۆمەی کە کەپسوولەکەی پێ داپۆشرابوو بتوێتەوە و ژەهرەکە بە ناو لەشیدا بڵاو ببێتەوە، هەر ئەوەش هۆی نەمردنی کۆستۆڤ بوو. دوایی دەرکەوت کە ئەم دوو هەوڵی کوشتنە بە ڕایسین، لە لایەن حکومەتی بولگاریاوە ئەنجام دراوە. ڕایسینەکەش لە لایەن یەکێتیی سۆڤییەتەوە بەرهەم هێنرابوو و نێررابوو بۆ بولگاریا.[1]

[1] Fong. I.W., and Alibek, Ken, Bioterrorism and Infectious Agents: A New Dilemma for the 21st Century, Springer, London , 2009, pp.206–207.

ئامێری کوشتنەکەش، وێنەی (٥–٦)، دەزگای هەواڵگریی یەکێتیی سۆڤییەتی (KGB) بۆ حکومەتی کۆمۆنیستی بولگاریای ئامادە کردبوو.




وێنەی (٥– ٦): ئەو ئامێری کوشتنەی کە دەزگای هەواڵگریی سۆڤییەتی (KGB) بۆ حکومەتی بولگاریای ئامادە کردبوو.

ئامێری کوشتنەکە لە شێوەی چەتردایە و دەرزییەکی تێدایە کە ناوەوەی هەڵکۆڵراوە و کەپسوولی پڕ لە ڕایسین لە ناو هەڵکۆڵراوەکان دانراون. کەپسوولەکانیش بە مۆم داپۆشراون. کاتێک دەرزییەکان وەک گوللە دەهاوێژرێن و بەر ئامانجەکە دەکەون، دەچنە ناو لەشی ئامانجەکەوە، لەوێدا مۆمەکە دەتوێتەوە و ڕایسینەکە بە ناو لەشی قوربانییەکەدا بڵاو دەبێتەوە و دەیکوژێت.[1]

* بۆ یەکەم جار تۆکسینی ڕایسین وەک چەکێک لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا و شانشینی یەکگرتوو، لە هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهان و ماوەی نێوان دوو جەنگەکەدا پەرەی پێ درا. سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناوی لە ڕایسین نابوو کۆمپاوندی دەبلیو "Compound W". سەدان کیلۆگرامی لە تۆکسینی ڕایسین بەرهەم هێنابوو و کردبووی بە بۆمب، بەڵام ئەو بۆمبانە هەرگیز بەکار نەهێنران. بەرهەمهێنانی تۆکسینی ڕایسین و توێژینەوە لەسەری بە مەبەستی بەکارهێنانی بۆ

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, p.38

هێرشبردن، بەگوێرەی پەیماننامەی قەدەغەکردنی چەکە بایۆلۆجی و تۆکسینەکان، لە ساڵی ١٩٧٢ـەوە قەدەغە کراوە.

* تۆکسینی ڕایسین بەشێک بوو لە بەرنامەی چەکە کۆکوژەکانی عێراق لە نێوان ساڵانی ١٩٨٥ و ١٩٩١دا. عێراق نزیکەی ١٠ لیتر لە ڕایسینی خەستی بەرهەم هێنابوو، هەندێک گوللەتۆپی لە ڕایسین پڕ کردبوو، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی مەیدانی تاقییان بکاتەوە.

* لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥ و ١٩٩٧دا چەند کەسێک لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستگیر کران، لەبەر ئەوەی تۆکسینی ڕایسینیان پێ بوو، ڕایسینەکەشیان بە هۆی ئامێری خۆجێیی ماڵەوەیانەوە ئامادە کردبوو. وێڕای ئەوەش، لە ویلایەتی مینیسوتا گرووپێکی توندڕەو ئاشکرا بوون و دەستگیر کران، چونکەی پلانی کوشتنی مارشاڵێکی ئەمەریکییان دانابوو، کە بە تێکەڵێکی تۆکسینی ڕایسین و دوانەمەثیل سەلفۆکساید بیکوژن.

* دوایین ڕووداوی تۆکسینی ڕایسین لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣دا بوو، کاتێک پۆلیسی بەریتانی توانیی تاقیگەیەکی خۆجێیی ئاشکرا بکات. ئەم تاقیگەیە توانیبووی بڕێکی کەمی تۆکسینی ڕایسین بەرهەم هێنێت بۆ ئەوەی وەک چەک بەکار بهێنرێت.[١]

## ژەهراوێتی ڕایسین

ژەهراوێتیی تۆکسینی ڕایسین بۆ مرۆڤ دەکەوێتە سەر ئەوەی بە چ ڕێگەیەک چووەتە ناو لەشی مرۆڤەوە و چەند چووەتە ناو لەشیەوە. ئایا لە ڕێی هەڵمژین، قووتدان یان بەرکەوتنی بە پێست چووەتە ناو لەشی مرۆڤەکەوە.

لێرەدا ژەمەکوشندەی مامناوەندیی ڕایسین بۆ مرۆڤ، بە مایکرۆگرام\ کیلۆگرام دراوە.

---

[1] Fong. I.W., and Alibek, Ken, Bioterrorism and Infectious Agents: A New Dilemma for the 21st Century, Springer, London , 2009, p. 206.

یەک مایکرۆگرام دەکاتە یەک بەش لە ملیۆنێک بەشی گرام، واتە یەک لەسەر ملیۆن کێشی گرامێک.

* ژەمەکوشندەی مامناوەندی (LD50)ی رایسین، لە رێی هەڵمژینی بە هەناسەدانەوە، دەکاتە ٣ مایکرۆگرام\ کیلۆگرام.

* ژەمەکوشندەی مامناوەندی (LD50)ی رایسین، لە رێی قووتدانیەوە، دەکاتە ٢٢ – ٢٥ مایکرۆگرام\ کیلۆگرام.

* ژەمەکوشندەی مامناوەندی (LD50)ی رایسین، ئەگەر بە دەرزی بکرێتە ژێر پێستەوە، دەکاتە ٥٠٠ مایکرۆگرام\ کیلۆگرام.

* ژەمەکوشندەی مامناوەندی (LD50) رایسین، ئەگەر بە دەرزیی دەمار لە کەسێک بدرێت، دەکاتە ٢ مایکرۆگرام\ کیلۆگرام.

تێبینی: بۆ حسابکردنی ژەمەکوشندەی مامناوەندیی رایسین بۆ کەسێک، کێشی کەسەکە چەند کیلۆگرام بێت، ئەوا ئەو ژمارانەی سەرەوە لێکدانی کێشی کەسەکە دەکەین. بۆ نموونە، ئەگەر کەسێک کێشی ٥٠ کیلۆگرام بێت، ئەوا ژەمەکوشندەی مامناوەندی (LD50)ی رایسین، لە رێی هەڵمژینی بە هەناسەدانەوە دەکاتە ١٥٠ مایکرۆگرام\ کیلۆگرام.[1]

### کاری رایسین لە ناو لەشی کەسی ژەهراوییبوودا

* رایسین کە دەچێتە ناو خانەکانی لەشی کەسی ژەهراوییبوو، نایەڵێت خانەکان ئەو پرۆتینانەی کە پێویستیان پێیە، دروستی بکەن. خانەکان بەبێ پرۆتین دەمرن، ئەمەش لە کۆتاییدا زیان بە لەش دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی مردن.

---

[1] Janik, Edyta, and co–workers, Biological Toxins as the Potential Tools for Bioterrorism, Int. J. Mol. Sci. 2019, 20, 1181.

* کاریگەریی ژەهراوییبوون بە ڕایسین دەکەوێتە سەر ئەوەی ئایا ڕایسینەکە لە ڕێی هەناسەوە هەڵمژراوە، قووت دراوە یان بە دەرزی لە کەسەکە دراوە.

## نیشانەکانی ژەهراوییبوون بە ڕایسین

نیشانە سەرەکییەکانی ژەهراوییبوون بە ڕایسین دەکەوێتە سەر ئەوەی کەسەکە چۆن ڕایسینەکەی بەرکەوتووە و بڕی چەند چووەتە ناو لەشی و لە حاڵەتە توندەکانی بەرکەوتنەکەیدا ڕایسینەکە کاری لە چەند ئەندامی لەشی تووشبووەکە کردووە.

* هەڵمژینی ڕایسین: لە ماوەی چەند کاژێرێکی کەمی هەڵمژینی بڕێکی بەرچاو لە ڕایسین، نیشانە چاوەڕوانکراوەکانی ئەمانە دەبن: تەنگەنەفەسی، تالێهاتن، کۆکە، هێڵنجهاتنەوە و سنگتەنگبوون. دەشێت ئارەقکردنەوەیەکی زۆر و کۆبوونەوەی ئاوی لە سییەکاندا بەدوادا بێت. ئەمەش هەناسەدان قورستر دەکات و پێستیش شین هەڵدەگەڕێت. لە کۆتاییدا، دەشێت فشاری خوێن دابەزێت، کۆئەندامی هەناسەدان پەکی بکەوێت و ببێتە هۆی مردن. لەو حاڵەتانەی کە دەزانرێت کەسێک تووشی ژەهراوییبوون بە ڕایسین بووە و نیشانەکانی هەناسەدانی لێ دەرکەوتوون، دەبێت بەدوای چارەسەری پزیشکیدا بگەڕێت.

* قووتدانی ڕایسین: ئەگەر کەسێک بڕێکی بەرچاو لە ڕایسینی قووت دا، ئەوا تووشی ڕشانەوە و سکچوون دەبێت، کە دەشێت سکچوونەکەی خویناوی بێت. هەروەها تووشبووەکە تووشی وشکبوونەوە دەبێت کە نزمبوونەوەیەکی زۆری پەستانی خوێنی بەدوادا دێت. نیشانەکانی تری تووشبوون بە ژەهرابوون بە ڕایسین، گەشکە و هەبوونی خوێنە لە میزدا. لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا، دەشێت جگەر و سپڵ و گورچیلەکانی تووشبووەکە لە کار بکەون و تووشبووەکە بمرێت.

* پێست و چاو کەوتنەبەر ڕایسین: لەوە ناچێت ڕایسین لە ڕێی پێستی ئاساییەوە هەڵبمژرێت. ئەگەر کەسێک بکەوێتە بەر هاڕاوە یان بەرهەمەکانی ڕایسین، دەشێت ببێتە هۆی سووربوونەوە و ئازار لە پێست و لە چاوەکانیدا. ئەگەر یەکێک دەستەکانی بەر ئەو ڕایسینە بکەوێت کە لە سەر پێستیەتی، ئینجا بە دەستەکانی خواردن بخوات یاخود بیانخاتە ناو دەمیەوە، ئەوا دەشێت هەندێک لە ڕایسین قووت بدات. مردن، بە هۆی ژەهراوییبوون بە ڕایسین، لە ماوەی ٣٦ بۆ ٧٢ کاژێر لە تووشبوون بە ژەهراوییبوونەکە ڕوو دەدات.

## چارەسەرکردنی ژەهراوییبوون بە ڕایسین

هیچ دژەژەهرێک بۆ چارەسەرکردنی ژەهراوییبوون بە ڕایسین نییە و گرنگترین شت ئەوەیە نەیەڵیت تووشی ژەهراوییبوونەکە ببێت. ئەوەی تووشی ژەهراوییبوون بە ڕایسین ببێت، دەبێت سەردانی نەخۆشخانە بکات، بۆ ئەوەی کاریگەرییەکانی ژەهراوییبوونەکەی ئەوپەڕی کەم بکرێنەوە.

## خۆپاراستن

* لەو شوێنە دوور بکەوە کە ڕایسینی تێدا بڵاو کراوەتەوە. ئەگەر شوێنەکە داخراو بێت، ئەوا لە شوێنە داخراوەکە بڕۆرە دەرەوە.

* ئەگەر پێت وایە کەوتوویتەتە بەر ڕایسین، ئەوا دەبێت جلەکانت داکەنی، بە خێرایی خۆت بە ئاو و سابوون بشۆیت و بخرێیتە ژێر چاودێریی پزیشکییەوە.

* داکەندنی جل:

° کە جلەکان دادەکەنیت، نابێت جلەکان لە ڕێی سەر و دەموچاوەوە دابکەنیت، بەڵکو دەبێت بیاندڕێنیت، لەجیاتیی ئەوەی لە ڕێی سەر و دەموچاوەوە دایان بکەنیت.

° ئەگەر یـارمەتیی کەسـێکی تووشـبوو دەدەیـت بـۆ داکەنـدنی جلەکانی، مەیەڵە جلەکان یان لەشـی تووشـبووەکە بەر هـیچ شـوێنێکت بکەوێت.

* خۆشتن:

° بە زووترین کات، بە هۆی شتن بە بڕێکی زۆری ئاو و سابوون، ڕایسینەکە لە سەر پێست لاببە.

° ئەگەر چاوت سووتایەوە یان شتت بە لێڵی بینی، ئەوا بۆ ماوەی ۱۰ بۆ ۱۵ چرکە چاوت بە ئاوی ئاسایی بشۆ. ئەگەر هـاوێنەی لکاوت بەکـار هێنـاوە، ئەوا هـاوێنە لکاوەکـان لە چـاوت بـکەرەوە و لەگەڵ جلەکان بیخەرە ناو کیسێکی نـایلۆنەوە. ئەگەر چاویلکەت لە چاودایە، ئەوا چاویلکەکان دابکە و بە ئاو بیشۆ، دواتر بەکاری بهێنەوە.

* **فڕێدانی جلوبەرگەکان**

هەمـوو جلوبەرگەکـانی تووشـبووەکە لەگەڵ هـاوێنە لکاوەکـانی دەخرێنە ناو کیسێکی نایلۆنەوە، ئینجا ئەم کیسە نـایلۆنە دەخرێتە نـاو کیسێکی نایلۆنی ترەوە و فڕێ دەدرێت.[1]

---

[1] https://emergency.cdc.gov/agent/ricin/facts.asp

## تۆکسینی تی–تو – T–2 Toxin

چەنـــــــدین کەڕوو هەن، وەک کەڕووەکـــــــانی *fursarium*، *trichothecium*، *myrothecium* و *stacchbotrys* کە تۆکســــــین دروســـت دەکەن، لە نـــاو ئەو تۆکســـینانەدا تۆکســـینی T–2 هەیە کە بەناوبانگترینـــانە. کەڕووی *myrothecium* تۆکســـینی T–2 دروســـت دەکات. هەروەها تۆکسینی تی–تو، لە بنچینەدا، مایکۆتۆکسینی تی–تو (T–2 mycotoxin)ـە، بەڵام بە کـورتکراوەیی پێـی دەڵـێن، تۆکســینی T–2. پێکهـاتی کیمیـایی تۆکســینی T–2 لە وێـنەی (٥–٧)دا پیشـان دراوە.




وێنەی (٥–٧): پێکهاتی کیمیایی تۆکسینی T–2

ئەم تۆکسینە بە چەندین ڕێگە دەچێتە نـاو لەشـی مـرۆڤەوە، وەک هەڵمژینی بۆ ناو سـییەکان، قووتـدان و خـواردنی لە ڕێگەی دەمەوە و گوزەرکردنی بە ناو پێستدا.[1]

تۆکسینی تی–تو تا ڕادەیەکِ لە ئاودا ناتوێتەوە، بەڵام لە ئەلکهولی ئەثیلـی و مەثیلـی و پـرۆپیلین گلایکۆلـدا زۆر دەتـوێتەوە. پرۆتینێکـی

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and
Francis Group, New York, 2018, pp.38–40.

جێگیرە و بەرگەی گەرمی و تیشکی سەروو وەنەوشەیی دەگرێت. ئەگەر بتەوێت تۆکسینی تی-تو ناچالاک بکەیت، دەبێت بۆ ماوەی ٣٠ خولەک بۆ ٢٦٠ پلەی سەدی گەرمی بکەیت یان هایپۆکلۆریتی سۆدیۆمی تێ بکەیت.

تۆکسینی تی-تو، بۆ یەکەم جار پزیشکانی ڤێترنەریی ئۆکرانیا لە ساڵی ١٩٣١دا دۆزییانەوە، کاتێک باسیان لە نەخۆشییەکی ناوازە لە چەند ئەسپێکدا کرد. ئەم پزیشکانە سەرنجیان دا کە ئەو ئەسپانە تووشی ئاوبەندی لیچ، ڕزین یان داوەشانی ناودەم بووبوون و پاشان تەشەنەیان کردبوو بۆ مەیینی خوێن و سڕبوونی دەماری و مردن. پزیشکەکان ئەم نەخۆشییەیان ناو نا alimentary toxic aleuka. ئەم نەخۆشییە بە هۆی خواردنێک کە تۆکسینی تی-توی پێوە بێت، تووشی ئاژەڵ یاخود مرۆڤ دەبێت. ئەم تۆکسینە ئەگەر لە خواردنێکدا بێت، نە تام و نە بۆنی هەیە و گومان لەوە ناکرێت لە خواردنەکەدا بێت.[1]

بە پێچەوانەی زۆرینەی تۆکسینە بایۆلۆجییەکان کە کار ناکەنە سەر پێست، تۆکسینی تی-تو بە ڕووشێنەرێکی چالاک و بەهێزی پێست دادەنرێت. سەرەڕای ئەوەش، ئەم تۆکسینە تاقە چەکی بایۆلۆجییە کە لە ڕێی پێستی ساغەوە هەڵبمژرێت و بچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە و ببێتە هۆی ژەهراویبوون. نیشانەکانی کەوتنەبەر تۆکسینی تی-تو لە ماوەی چەند چرکەیەکدا دەردەکەون. هەرچەندە بڕێکی زۆرتر لە تۆکسینی تی-تو پێویستە بۆ ئەوەی ببێتە کوشندەژەمێک (lethal dose) لە چاو کوشندەژەمەکانی VX، سۆمان یان سارین، بەڵام بە وردی سەرنج دراوە کە هۆکارێکی بەهێزی بلۆقکردنی کارایە. دەکرێت تۆکسینی تی-تو لە ڕێی خۆراک، ئاو یان دڵۆپەی بچووک، پرژە یان دووکەڵەوە، بە هۆی سیستەمی جۆراوجۆری بڵاوکردنەوە یان چەکەوە، بڵاو بکرێتەوە. ئەم ڕەوشتانە وا لە

[1] https://toxicdangerzone.weebly.com/t-2-mycotoxin.html#:~:text=T-2%

تۆکسینی تی–تو دەکەن کە بە سەرکەوتوویی وەک چەکێکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێت. کوشندەژەمی مامناوەندیی تۆکسینی تی–تو نزیکەی ١ میللیگرام\ کیلۆگرامە. بە واتایەکی روونتر، ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی کێشی مرۆڤی ئاسایی بە ٧٠ کیلۆگرام دابنێین، ئەگەر کۆمەڵەمرۆڤێکی ئاسایی هەریەکەیان ٧٠ میللیگرام لە تۆکسینی تی–تو بچێتە ناو لەشیانەوە، ئەوا نیوەیان دەکوژێت. بەگوێرەی شایەتحاڵەکان و قوربانییەکانی تۆکسینی تی–تو، شێوە پرژەییەکەی (aerosolized) کە پێی دەوترێت "بارانی زەرد"، بە هۆی فڕۆکەی نزم فڕیوەوە، وەک شلەیەکی ڕۆنی زەرد بەسەر ئەو قوربانییانەدا کراوە. تۆکسینی تی–تو لە ناکۆکییە سەربازییەکاندا لە لاوس (١٩٧٥–١٩٨١)، کامبۆدیا (١٩٧٩–١٩٨١) و ئەفغانستان (١٩٨١) بەکار هێنراوە، بۆ ئەوەی زیانی کوشندە یان ناکوشندەی لێ بکەوێتەوە. زیاتر لە ٦٣٠٠ کەس لە لاوس و ١٠٠٠ کەس لە کامبۆدیا و ٣٠٠٠ کەس لە ئەفغانستان بە هۆی کەوتنەبەر بارانی زەردەوە کوژراون.

### نیشانەکانی کەوتنەبەر تۆکسینی تی–تو

نیشانە سەرەتاییەکانی کەوتنەبەر تۆکسینی تی–تو لە ماوەی چەند خولەکێکدا دەردەکەون، لەوانە، ئازاری سووتانی پێست، سووربوونەوە و بلۆقکردنی پێست، پاشان بلۆقکردنەکە، مردنی پێستەکە و ڕەشبوون و قەتماغەکردنی لێ دەکەوێتەوە. لە حاڵەتە کوشندەکاندا ڕووبەرێکی فراوانی پێستی تووشبووەکە قەتماغەکە فڕێ دەدات.

ئەگەر تۆکسینی تی–تو بەر لووت بکەوێت، خوران و ئازاری لووت، پژمین، خوێنبەربوونی لووت و ئاوهاتن لە لووت، ژەهراویبوونی سی/بۆریچکەکانی هەوا، تەنگەنەفەسی و خیزەخیزلێهاتن و کۆکینی لەگەڵدا دەبێت.

قورگ و دەم کەوتنەبەر تۆکسینی تی-تو، ئازار و لیک و بەڵغەمی خوێناویی لێ دەکەوێتەوە. تووشبووەکە ئیشتیای خواردنی نامینێت و تووشی هێڵنجهاتنەوە و ڕشانەوە و سکچوونی ئاوی یان خوێناوی دەبێت لەگەڵ ئازاری سک و ژەهراویبوونی گەدە و ڕیخۆڵەکان.

ئەگەر تۆکسینی تی-تو بچێتە ناو چاوەوە، دەشێت ئەمانە ڕوو بدەن: ئازاری چاو، فرمێسکهاتن و سووربوونەوە، هەستکردن بە هەبوونی شتێکی نامۆ لە ناو چاودا، شتبینین بە لێڵی. نیشانەکانی پێست کەوتنەبەر تۆکسینی تی-تو لە ماوەی چەند خولەکێک بۆ چەند کاژێرێکدا دەردەکەون، لە کاتێکدا نیشانەکانی چاو کەوتنەبەر تۆکسینەکە، لە ماوەی چەند خولکێکدا دەردەکەون.

نیشانەکانی ژەهراویبوونی سەرتاپای لەشی تووشبووەکە ئەمانەن: لاوازی، دەمەوڕووکەوتن، گێژبوون، نووچدان، پێکەوەنەگونجان و کارنەکردنی ماسوولکەکانی لەش بۆ کردنی کارێک. حاڵەتە کوشندەکانی ژەهراویبوون زیابوونی لێدانی دڵ و نزمبوونەوەی پلەی گەرمی و نزمبوونەوەی پەستانی خوێنی بەدوادا دێت. دەشێت تووشبووەکە لە ماوەی چەند خولەکێک، چەند کاژێرێک یان چەند ڕۆژێکدا بمرێت. نیشانە هەرە باوەکانی ژەهراویبوونی سەرتاپای لەش ئەمانەن: ڕشانەوە، سکچوون، ئازارێکی لەڕادەبەدەری پێست و سووربوونەوە و خوران، دەرکردنی لیر یان بلۆق، خوێنبەربوون و تەنگەنەفەسی. بەڵگە کۆکراوەکان ئەوە دەردەخەن کە تۆکسینی تی-تو دەشێت ببێتە هۆی چەندین نەخۆشی، لە نەخۆشییەکانی توندی پێستەوە تا دەگاتە چەندین شێرپەنجە لە مرۆڤ و ئاژەڵدا، ئەوەیش لە ڕێگەی چەند میکانیزمێکەوە کە تۆکسینەکە لە لەشی تووشبووەکەدا دەیگرێتە بەر.[1]

---

[1] Gopalakrishnakone,P, Balali-Mood, Mahdi, Llewellyn, Lyndon, Singh, Bal Ram, Biological Toxins and Bioterrorism, Springer Science+Business Media Dordrecht , 2015, pp.299-301.

بۆ نموونە، تۆکسینی تی-تو نایەڵێت زیندەکارلێکی دروستکردنی ناوکەترشی ڕایبیی کەمئۆکسجین (DNA) و دروستکردنی پرۆتین لە ناو خانەکانی لەشدا ڕوو بدات، ئەمەش مردنی خانەکان و پاشان مردنی تووشبووەکەی لێ دەکەوێتەوە.[1]

## چارەسەرکردن

* هەموو جلەکان لە بەری تووشبووەکە دابکەنە. پێستی تووشبووەکە بە ئاو و سابوون بشۆ و ئینجا بیسڕەوە.

* پێستی تووشبووەکە لە ماوەی ٦ کاژێردا پاش تووشبوونی لە تۆکسینەکە پاک بکرێتەوە، پاککردنەوەکە ٨٠ - ٩٠٪ی تۆکسینەکە لە سەر پێستەکە لادەبات و نایەڵێت تووشبووەکە تووشی نەخۆشیی پێست یان مردن ببێت.

* ئەوانەی چاودێریی تەندروستی پێشکەش بە تووشبووەکە دەکەن، دەبێت ڕێکارە تەندروستییە گشتییەکان بۆ تووشبووەکە بەکار بهێنن.

* ئەوانەی بە شێوەیەکی توند تووشی ژەهراویبوون بە تۆکسینەکە دەبن، دەبێت بە وردی چاودێریی ئەو گرفتانەی تووشبووەکە بکرێت کە لە هەناسەدان، بۆریی هەوا و سووڕی خوێندا تووشی دەبێت.

* جلەکانی تووشبووەکە دووربخەرەوە و بیانخەرە ناو کیسێکی نایلۆنەوە، بۆ ئەوەی کەسی دیکە تووش نەبێت.

* دەتوانرێت، لە ماوەی کاژێرێک دوای قووتدانی تۆکسینەکە، تووشبووەکە ڕووەکەخەڵووزی چالاککراو (activated charcoal)ی بدرێتێ، بۆ ئەوەی خەڵووزەکە تۆکسینەکەی ناو گەدەی تووشبووەکە بمژێت.[2]

---

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism, CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, p. 40

[2] https://toxicdangerzone.weebly.com/t-2-mycotoxin.html#:~:text=T-2%

## کەڕووەکان – Fungi

بێگومـــان کەڕووەکـــانیش، وەک چەکـــی بـــایۆلۆجی، دەشـــێت دژی مـرۆڤ، ئـاژەڵ یـان دژی کشـتوکاڵ و بەرهەمە دانەوێڵەییەکـان بەکـار بهێنرێن. بە تایبەتی دژی دانەوێڵە و بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی تر، بۆ گەیانـــدنی زیـــانێکی ئـــابووریی گەورە و بڵاوکـــردنەوەی برســـێتی و قاتوقڕی لە نـاو لایەنـی بەرامبەردا. وێڕای ئەوانەی لە سـەرەوە بـاس کران، مرۆڤ کەڕووەکان وەک خۆراک و بۆ ئامادەکردن و هەڵگرتنی خـۆراک بەکـار دەهێنێـت. پـێش ئەوەی باسـی کەڕوو بکەیـن وەک چەکێکـــی بـــایۆلۆجی دژی کشـــتوکاڵ، باشـــترە هەنـــدێک زانیـــاری دەربـارەی ئەوەی کەڕوو چییە، چ تایبەتمەندییەکی هەیە و سـەر بە چ جیهانێکە لە جیهانی زیندەوەراندا، بخەینە ڕوو.

کەڕوو بـــریتییە لە هەر ئەنـــدامێکی گرووپـــی زینـــدەوەرە نـــاوک ڕاســـتەقینەکان، کە وردبیـــنە زینـــدەوەرەکانی وەک ترشـــێن (yeast) و mold و قـارچکە زۆر باوەکـان دەگـرێتەوە. ئەم زینـدەوەرانە لە یەک جیهانـــدا پـــۆلێن کـــراون و جیایـــان دەکـــاتەوە لە جیهـــانە نـــاوک ڕاستەقینەکانی ڕووەک و ئاژەڵ.

ئەو تایبەتمەنـدییەی کە کەڕووەکـان دەکـاتە جیهـانێکی جیـا و لە جیهـانی ڕووەک، بەکتریـا و هەنـدێک پێشـەنگییەکان جیـا دەکـاتەوە، هەبوونی کایتن (chitin)ـە لە دیواری خانەکانی کەڕووەکاندا (کایتن پـۆلیمەرێکی لێـوەرگیراوی گلوکـۆزە). کەڕووەکـانیش، وەک ئـاژەڵ، خـۆنەژێنن (heterotrophs)؛ خواردنیـان لە ڕێـی هەڵمژینـی گەردە تواوەکانـەوە دەسـت دەکەوێت، ئەوەیـش بە گشـتی لە ڕێـی دەردانـی ئەنزیمـی هەرسـکردن بە نـاو ژینگەکەیانـدا. کەڕووەکـان کـرداری

ڕۆشنەپێکهاتن ئەنجام نادەن. گەشەکردن هۆیەکی جووڵەکردنیانە، جگە لە سپۆرەکانیان (هەندێکی کەمیان قامچییان پێوەیە) کە بە ناو هەوا و ئاودا دەجووڵێنەوە. کەڕووەکان شێکەرەوەی سەرەکیی سیستەمی ژینگەیین. ئەو پسپۆڕییەی زیندەزانی (biology) کە بۆ خوێندنی کەڕووەکان تەرخان کراوە، پێی دەوترێت کەڕووزانی (mycology).[1]

لەو ۱۰۰۰۰۰ یان زیاتر جۆرە کەڕووەی کە هەیە، ۸۰۰۰ جۆریان بەوە ناسراون دەبنە هۆی نەخۆشی لە ڕووەکاندا.[2]

نزیکەی لە ۹۰٪ی نەخۆشییەکانی ڕووەک بە هۆی کەڕووەکانەوەیە، هەموو ساڵێک بە بڕی ملیاران دۆلار زیان بە بەروبوومی دانەوێڵە و جەنگەڵەکان دەگەیەنن.[3]

لە وڵاتێکی هەژاردا، کە تێیدا ملیۆنان هاووڵاتی بۆ خۆراکیان پشت بە بەروبوومێکی سەرەکیی وەک برنج دەبەستن، ئەگەر بەربوومی دانەوێڵەکەیان کە برنجە، بەر هێرشێکی دژی دانەوێڵە بکەوێت، ئەوا زیانێکی زۆر بەر برنجەکە دەکەوێت و دەبێتە هۆی قاتوقڕی. ئەگەر هێرشێک بە چەکی بایۆلۆجیی دژەدانەوێڵە، لەگەڵ هێرشێک بە چەکی بایۆلۆجیی پیسەکوان بۆ سەر شارێک بەراورد بکەین، دەبینین کە هێرش بە چەکی دژەدانەوێڵەکە زیانی بۆ دانیشتوان کەمترە. بێگومان هێرشێک بە چەکی دژەدانەوێڵە، گەورەترین زیان بە هەژارترین بەشی دانیشتوان دەگەیەنێت و بەدخۆراکی و برسێتییان لە ناودا بڵاو دەکاتەوە.

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Fungus
[2] Whitby, Simon M., Biological Warfare against Crops, Palgrave, New York, 2002, p.25.
[3] sciencedirect.com/referencework/9780123847201/encyclopedia-of-biodiversity

**ئەو زیانـانەی کەڕووەکـان بە کشـتوکاڵی هەنـدێک وڵاتانیـان گەیاندووە:**

* سـاڵی ۱۹۷۰، بڵاوبـوونەوەی نەخۆشـیی دۆکەی گەڵا (leaf blight) لە باشووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بایی یەک ملیار دۆلار گەنمەشامیی لەناو برد.

* لە سەدەی نۆزدەیەمدا، نەخۆشیی ژەنگی گەڵای قاوە ( coffee leaf rust)، کێڵگەکانی قاوەی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەناو برد. لە ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابوردوودا، هەر ئەم نەخۆشییە ببوو بە کێشەیەکی تەنگپێهەڵچنەر لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتینیدا.

* دۆکەی پەتـاتە لـە سـاڵانی ۱۸٤٥–۱۸٤٦دا لە ئێرلەنـدا بـڵاو بـووەوە و بـوو بە هـۆی قـاتوقڕی. ئەم دەردە پەتـاتەیە یەک ملیـۆن کەسی کوشت و ملیۆنێکی تریشی وا لێ کرد وڵاتەکە بەجێ بهێڵن.

* نەخۆشیی پەڵەی قاوەیی برنج، تا ڕادەیەکی سنووردار، بوو بە هـۆی بڵاوبـوونەوەی قـاتوقڕی لە بەنگـال لە هیندسـتان لە سـاڵانی ۱۹٤۲–۱۹٤۳دا و زیاتر لە دوو ملیۆن کەس لە برسان مردن.

**بەرنامەی وڵاتان بۆ بەکارهێنانی کەڕوو وەک چەکێکی بایۆلۆجی دژی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان**

* هێرشکردن بە چەکێکی بایۆلۆجیی وەک کەڕوو یان سپۆرەکانی کەڕوو بۆ سەر کشتوکاڵی دانەوێڵەیی، بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی لە ناو ڕووەکە دانەوێڵەییەکاندا لێ دەکەوێتەوە. دەشێت بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لە بڵاوبوونەوەیەکی سروشتی بچێت، هێرشکەرەکە بە نادیاری بمێنێتەوە و لە تاوانبارکردن و ئاسەواری خراپی هێرشەکە پارێزراو بێت.

بە زۆری، وڵاتـان بەرنـامەی تـوێژینەوە و ئامـادەکردن و عەمبـارکردنی چەکە بایۆلۆجییەکانیـان زۆر بە نهێنـی دەهێڵـنەوە، بـۆ

ئەوەی لە سـزاكانی یاسـای قەدەغەكردنـی چەكە كیمیـایی و بایۆلۆجییەكـان دوور بـن. ئەم وڵاتـانە، وەک بـابەتێكی ئاسایشـی كشتوكاڵی یاخود خۆراكی، لەو بەرنامەیە دەڕوانن.

لێرەدا بەرنامەی چەكی بایۆلۆجیی چەند وڵاتێک دەخەینە ڕوو، بە تایبەتی ئەو چەكە بایۆلۆجییانەی كە دژی بەروبوومە دانەوێڵەییەكان بەكار دەهێنرێن.

* بەرنامەی چەكی بایۆلۆجیی فەرەنسی ساڵی ١٩٢١ دەستی پێ كرد، لە كۆتـایی سـاڵی ١٩٣٠دا تـوێژینەوەی لەسـەر دوو لەنـاوبەری پەتـاتە، كە دۆكەی پەتـاتە و قـالۆنچەی كۆلـۆرادۆ بـوو، بە ئەنجـام گەیاندبوو.

* بەریتانییەكان وەبەرهێنانیان لە بواری جەنگی دژی دانەوێڵەییدا كرد، وەربەهێنانەكەیان لە گیاكوژە جۆراوجۆرەكاندا چڕ كردەوە. لە سـاڵانی ١٩٥٠دا، هەنـدێک لەو ڕووەككـوژە كیمیاییـانە لە شـەڕەكان لەگەڵ یاخیبووە كۆمۆنیستەكان لە مالایا ڕۆڵی خۆیان بینی. هەروەها بەكارهێنانی ئەم ڕووەككوژانە ڕێگەیان خۆش كرد بۆ قۆناغێكی چڕی بەكارهێنـانی گەڵاوەرێنەكـان (defoliants)، لە سـاڵانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا، لە لایەن ویـلایەتە یەكگرتووەكـانی ئەمەریكـاوە لە جەنگـی ڤێتنامدا.

* ئەڵمانیـا تـوێژینەوەی لەسـەر ژمـارەیەک لە نەخۆشـییەكانی بەروبـوومی كشـتوكاڵی كـرد، لەوانە، دۆكەی پەتـاتە و ژەنگـی گەنـم، وێڕای دەردەمێرووەكانی وەک قالۆچەی كۆلۆرادۆ و قالۆچەی تۆوی شێلم و قالۆچەی گەنمەشامی. ساڵی ١٩٤٣، بەرنامەیەكی بەرفراوان بۆ پەروەردەكردنی قالۆچە لە قۆناغە سەرەتاییەكانیدا بوو. بەڵگەكان باسـی ئەوە دەكەن كە لەوانەیە قالۆچەكـان لە حـوزەیرانی سـاڵی ١٩٤٤دا بۆ بڵاوكردنەوەیان لە بەریتانیا، ئامادە كرابن، بەڵام ئەو ساڵە درەنگ كەوتبوو بۆ لەناوبردنی بەرهەمی پەتاتەی بەریتانی.

* ژاپۆن، لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، سەرگەرمی توێژینەوە بوو لەسەر نەخۆشخەرەکانی ڕووەک و گیاکوژە کیمیاییەکان. ژاپۆن چاوی لەسەر ئەو نەخۆشییانە بوو کە دانەوێڵەکانی ئەمەریکا و یەکێتیی سۆڤییەت تووشی نەخۆشی دەکەن، بە تایبەتی ئەو ڕووەکە دانەوێڵەییانەی لە باکووری ڕۆژئاوای زەریای هێمن دەڕوێن. وا دەردەکەوێت کە بڵاوکردنەوەی نەخۆشیی خەڵووزە و کرمی دەزوولەیی گەنم ئەو چەکانە بووبن کە ژاپۆنییەکان بە چەکی زۆر ئومێدبەخشیان دانابن. هەروەها ژاپۆنییەکان دەزگایەکیان دامەزراندبوو کە توانیبووی ساڵانە زیاتر لە ٩٠ کیلۆگرام لە سپۆرەکانی ژەنگی دانەوێڵە بەرهەم بهێنێت. بێگومان بڵاوکردنەوەی ئەم بڕە زۆرەی سپۆر، وەک تۆز لە ناو با و هەوادا، دەشێت ببێتە هۆی لەناوبردنی ڕووبەرێکی فراوانی گەنمی ئەمەریکا.

* ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لەسەر بەرنامەیەکی سەرەکیی جەنگی بایۆلۆجی، وەک توێژینەوە بەرفراوانەکانی لەسەر چەکە دژەدانەوێڵەییەکان، لە ساڵانی ١٩٤٠کانەوە تاکو ساڵی ١٩٦٩ بەردەوام بوو.

بەرنامەی دژەدانەوێڵەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا توێژینەوەیان لەسەر چەندین نەخۆشی کردبوو، وەک دۆکەی پەتاتە و sclerotium rot کە هێرش دەکەنە سەر بەروبوومەکانی وەک پاقلەی سۆیا، چەوەندەری شەکر، پەتاتەی شیرین و لۆکە. ئامانجە سەرەکییەکانی بەرنامەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گەنم بوو لە ڕۆژئاوای یەکێتیی سۆڤییەت، بە تایبەتی ئۆکرانیا و برنج بوو لە ئاسیا، بە شێوەیەکی سەرەکییش لە چین.

* لە نێوان ساڵانی ١٩٥١ و ١٩٦٩دا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، زیاتر لە ٣٠٠٠٠ کیلۆگرام لە سپۆرەکانی کەڕووی *Puccinia graminis tritici* عەمبار کردبوو. ئەم کەڕووە دەبێتە هۆی ژەنگهێنانی لاسکی گەنم؛ دەشێت ئەم ٣٠٠٠٠ کیلۆگرامە بەشی

ئەوە بکات هەرچی ڕووەکی گەنمە لەسەر گۆی زەوی، تووشی ئەم نەخۆشییەی بکات.

کەڕووی *Puccinia graminis tritici* بە باشترین چەک دادەنرێت، چونکە دەتوانێت بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ، لە گەنجینەی سارددا، بە زیندوویی بمێنێتەوە. کاتێک بەرەڵا دەکرێت، زۆر بە خێرایی بڵاو دەبێتەوە. دەنکەگەنمێکی تووشبوو بەم کەڕووە دەشێت ١٠ ملیۆن سپۆری تێدا بێت، هەر یەکێک لەو سپۆرانە دەتوانێت لاسکی گەنمێکی دیکە تووش بکات. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەخۆشیی وشکبوونی مەرەزە (rice blast)ی هەڵبژارد، کە بە هۆی کەڕوویەکەوە بە ناوی *Piricularia oryzae* تووشی مەرەزەی برنج دەبێت. ئەمەریکا ئەم کەڕووەی بە هۆکارێکی سەرەکیی دژەمەرەزە دادەنا. ئەمەریکا، لە ساڵی ١٩٦٦دا، نزیکەی یەک تەن لە سپۆری ئەم هۆکارەی لە حەشارگەیەکدا هەڵگرتبوو، قەبارەی سپۆرەکانیش ئەوەندی قەبارەی تەنۆکەکانی تۆز دەبوون. بە گشتی، تاوەکو قەبارەی سپۆرەکان بچوکتر بن، باشتر بە هەوادا بڵاو دەبنەوە و وەک چەکێکی بایۆلۆجیی دژەدانەوێڵە، باشتر سوودیان لێ وەردەگیرێت.

* هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پەرەی بە ژمارەیەک چەک دا کە هەندێکیان بە سیستەمی نوێی چەک وەسف دەکران و بۆ بڵاوکردنەوەی هۆکارەکانی دژەبەرووبوومی دانەوێڵە دروست کرابوون. یەکێک لەو چەکانە بۆمبێکی ٥٠٠ پاوەندی بوو کە لە بنچینەدا بۆ بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەی پروپاگەندەیی دروست کرابوو. ئەم بۆمبە، لەجیاتیی بڵاوکراوەی پڕۆپاگەندەیی، پڕ کرابوو لە پەڕی باڵندە و ئەو پەڕانە تۆزێکی وردی سپۆرەکانی کەڕوویان پێوە نووسێنرابوو. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چەند تاقیکردنەوەیەکی مەیدانیی لەسەر "بۆمبی پەڕی باڵندە" لە Camp Detrick و لە دوورگەکانی Virgin کردبوو. کاتێک بۆمبەکە لە

بەرزاییەکـــی زۆرەوە تەقێنرابـــووەوە، پەڕەکـــانی باڵنـــدە کە تـــۆزی سپۆرەکانی نەخۆشییەکەیان پێوە بوو، بە سەر ڕووبەرێکی فراوانی دانەوێـڵەدا کەوتبـوونە خـوارەوە و سـپۆرەکانیان بـڵاو کردبـووەوە. هەروەهـــا ئەمەریکـــا لە ڤێتنـــام، بـــۆ پرژانـــدنی گیاکوژەکـــان و گەڵاوەرێنەکان بە سەر کشتوکاڵ و دارستانی ڤێتنامدا، فڕۆکەی بەکار دەهێنا، دواتر باڵۆنیشی بۆ هەمان مەبەست تاقی کردەوە.[١]

* عێـراق لە بەرنـامەی چەکە بایۆلۆجییەکەیـدا، کە لە ناوەڕاسـتی سالآنی ١٩٧٠کاندا دەستی بەو بەرنامەیە کردبوو، خەڵووزەی گەنمی ئامادە کردبوو، بۆ ئەوەی دژی کێڵگە گەنمەکانی وڵاتانی نەیاری، بە تـایبەتی دژی ئێران بەکاری بهێنێـت، ئەو وڵاتە تووشـی کورتهێنـانی بەرهەمهێنـانی دانەوێـڵەی گەنـم بکـات و قـاتوقڕی بـڵاو ببێـتەوە و کێشـەی ئـابووری بۆ دروست بکات، چونکە ئێران لە بەرهەمهێنـانی گەنمدا پشتی بە خۆی دەبەست و لە دەرەوە هاوردەی نەدەکرد.[٢]

* بە گـوتەی ئەلـی بێـک (AliBek) کە هەڵگەڕاوەیەکـی یەکێتیـی سـۆڤییەت بـوو و پەنـای بـۆ ئەمەریکـا بردبـوو، یەکێتیـی سـۆڤییەت بەرنـامەی دژەبەروبـوومی دانەوێڵەی لە کۆتـایی سـالآنی ١٩٤٠ـەکان یان سەرەتای سالآنی ١٩٥٠کان دەست پێ کردبوو، نەخۆشـخەرەکانی وەک ژەنگـی گەنـم و وشـکبوونی مەرەزە و وشـکبوونی جـۆفەڕەنگی (rye blast)ی وەک هۆکارەکانی دژە دانەوێڵە پەرە پێ دابوو.[٣]

---

[1] Rogers, Paul, Whitby, Simon, and Dando, Malcolm, Biological Warfare Against Crops, Scientific American, June 1999, pp. 70–75.

[2] Whitby, Simon, and Rogers, Paul, *Anti–crop Biological* Warfare Implications of the Iraqi and US Programs, Defense Analysis, VoL 13. No. 3, 1997 , pp. 303–318

[3] Singh, Sunit K and Kuhn, Jens H. Defense Against Biological Attacks,Volume II, Springer Nature Switzerland AG, 2019, p.364.

## نەخۆشیی خەڵوورەی گەنم – Wheat Smut Disease

گەنم سەرچاوەیەکی گرنگی کاربۆهایدرات و پرۆتین و ڤیتامین و کانزایە. گەنم ٢٧٪ی سەرجەم هەموو ئەو دانەوێڵانە پێک دێنێت کە لە جیهانـــدا بەرهەم دەهێنـــرێن. لە نێـــو ئەو زینـــدە بەربەســـتانەی کاریگەرییـــان لەســـەر بەرهەمهێنـــانی گەنـــم هەیە، نەخۆشـــییەکانی خەڵـــوورەی گەنمـــن. ئەم نەخۆشـــییانە کـــار لە بەرهەم و کـــواڵیتیی دەنکەکان و بەرهەمە ناسەرەکییەکانی گەنم دەکەن.[1]

گەنـم دانەوێڵەیەکـی ئەوپەڕی بڵاوە لە جیهانـدا و ١٧٪ی سـەرجەم ئەو زەوییانەی جیهان پێک دێنێت کە بە کشتوکاڵ دەچێنرێن. هەروەها گەنم خۆراکی سـەرەکیی ٣٥٪ی هەموو دانیشـتوانی جیهـانە و کالۆری و پرۆتینـی زیـاتر لە هەمـوو دانەوێڵەکـانی تـر لە سیسـتەمی خـۆراکی جیهانیدا دابین دەکات.[2]

نەخۆشـــیی خەڵـــوورەی گەنـــم بە هـــۆی کەڕووی *Ustilago tritici*ەوە تووشی گەنم دەبێت.[3]

بێگومان هێرشکردن بە کەڕووی (*Ustilago tritici*) و بەکارهێنانی وەک چەکێکـی بـایۆلۆجی دژی کـێڵگە گەنمەکـانی هەر وڵاتێـک، بە تایبەتی ئەو وڵاتانەی بۆ خۆراکی سەرەکییان پشت بە گەنم دەبەستن، دەبێـــتە هـــۆی بڵاوبـــوونەوەی برســـێتی و قـــاتوقڕی و لە ڕووی کورتهێنـــانی بەرهەمـــی گەنـــم و تێچووەکـــانی چارەســـەرکردن و نەبڕکردنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە، کێشەی ئابووری لەو وڵاتەدا دەخوڵقێنێت.

---

[1] http://www.fao.org/3/y4011e0h.htm
[2] https://www.idrc.ca/en/research–in–action/facts–figures–food–and–biodiversity
[3] https://bmcplantbiol.biomedcentral.com/articles/10.1186/s12870–020–02525–x

## ژەنگی لاسکی گەنم – Wheat Stem Rust

ژەنگی لاسکی گەنم لە هەموو شوێنێکی جیهان بڵاوە؛ لە کوێ گەنم بچێنرێت، نەخۆشیی ژەنگی لاسکی گەنمی لێیە، بەڵام بە شێوەیەکی سنووردار. کەڕووی ژەنگی لاسکی گەنم، هێرش دەکاتە سەر هەموو بەشە دیارەکانی ڕووەکی گەنم کە لە سەر ڕووی خاکن. ئەو گەنمەی تووشی ئەم نەخۆشییە دەبێت، خەڵفەی کەمتر لە لاسکەکەی دەردەکات و تۆی کەمتر لە گوڵەکانیدا دەبێت و قەبارەی دەنکەگەنمەکانیشی بچووکتر دەبن؛ بە شێوەیەکی گشتی، ئەم دەنکە گەنمانە تووشی سیسبوون دەبن و کوالێتییان بۆ هاڕین باش نابێت و بەهای خۆراکییشیان کەم دەبێت. ئەو ڕووەکە گوڵەگەنمانەی تووشی نەخۆشیی ژەنگی لاسک دەبن، ناتوانن خۆیان ڕابگرن و دەچەمێنەوە بۆ سەر زەوی. لە بارودۆخی توندا، نەخۆشیی ژەنگی لاسکی گەنم دەبێتە هۆی مردن و لەناوچوونی ڕووەکی گەنمەکە. ژەنگی لاسکی گەنم ساڵانە زیانێکی زۆر بە ئەمەریکای باکوور دەگەیەنێت و یەک ملیۆن تەن گەنم لەناو دەبات، لە ماوەی ساڵانی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییەدا، زیانەکانی دەیان یاخود سەدان ملیۆن تەن گەنمە. زیانی ژەنگی لاسکی گەنم لەو وڵاتە گەشەکردوانەی کە گەنم دەچێنن، لەوەی ئەمەریکای باکوور زیاترە.[١]

ژەنگی لاسکی گەنم بە هۆی کەڕووی *Puccinia graminis tritici*ەوە تووشی گەنم دەبێت.[٢]

وەک لە سەرەوە باس کراوە، نەخۆشیی لاسکی گەنم بە شێوەیەکی سروشتی هەیە و زیان بە بەرهەمی گەنم دەگەیەنێت و بەرهەمی کێڵگەکانی گەنم کەم دەکاتەوە. دەتوانرێت لە بارودۆخی ئاساییدا کۆنترۆڵ بکرێت، یان زیانەکانی ئەوپەڕی کەم بکرێنەوە،

---

[1] https://www.sciencedirect.com/book/9781782423355/emerging-technologies-for-promoting-food-security

[2] https://www.apsnet.org/edcenter/disandpath/fungalbasidio/pdlessons/Pages/StemRust.aspx#:~:text

بەڵام لە حاڵەتی جەنگدا و هێرشکردن بە کەڕووی ژەنگی لاسکی گەنم وەک چەکێکی بایۆلۆجی بۆ سەر کێڵگەکانی گەنمی وڵاتێک، کارەساتی کورتهێنانی بەرهەمهێنانی گەنمی لێ دەکەوێتەوە و قاتوقڕی و برسێتی بڵاو دەکاتەوە و ئاسایشی خۆراکیی وڵاتەکەش دەخاتە مەترسییەوە.

### نەخۆشیی وشکبوونی مەرەزە – Rice Blast Disease

برنج خۆراکی سەرەکیی ٣,٥ ملیار کەسە لە جیهاندا، بە تایبەتی لە کیشوەری ئاسیا و ئەمەریکای لاتین و هەندێک بەشی کیشوەری ئەفریقا. لە ئێستادا، چین و هیندستان و ئەندەنوسیا و بەرازیل گەورەترین بەرهەمهێنەری برنجن لە جیهاندا.[١]

برنج یەکێکە لە بەروبوومە دانەوێڵەییە هەرە گرنگەکان لە جیهاندا، بە تایبەتی لە ئاسیا، نزیکەی نیوەی دانیشتوان وەک خۆراکێکی سەرەکی پشت بە برنج دەبەستن.

نەخۆشیی وشکبوونی مەرەزە مەترسیدارترین و لەناوبەرترین نەخۆشیی مەرەزەیە کە بە هۆی کەڕووی پایریکلۆریا ئۆریزا (*Pyricularia oryzae*)وە تووشی مەرەزە دەبێت. کەڕووی پایریکلۆریا ئۆریزای نازایەندی، سپۆری شێوە هەرمێی ڕەنگ خۆڵەمێشی یان ڕوون بەرهەم دەهێنێت کە پێی دەوترێت conidia.[٢]

لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، هاوپەیمانان بیریان لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی کردەوە، بۆ لەناوبردنی مەرەزەی ژاپۆنی. ساڵی ١٩٤٥، بەروبوومی مەرەزەی ژاپۆنی بە شێوەیەکی توند تووشی نەخۆشیی وشکبوون بوو. هەروەها بەرهەمی پەتاتەش لە ئەڵمانیا تووشی نەخۆشی بوو. ئەم بوو

---

[1] https://www.nationalgeographic.org/encyclopedia/food–staple/#:~:text=Introduced

[2] Hosseini–Moghaddam, Mahdieh and Soltani, Jalal, Progress in Biological Sciences, Vol. 3, Number 2, Summer/Fall 2013/135–143

ڕووداوە هاوکات بوون لەگەڵ توێژینەوەی نهێنیی هاوپەیمانان لەسەر ئەم نەخۆشییانە. دەشێت هاوپەیمانان هۆکارەکانی دژەبەروبوومی دانەوێڵە و بەرهەمی پەتاتەیان بەکار هێنابێت.

لە ئازاری ١٩٥٨دا، کەڕووی پایریکلۆریا ئۆریزا ( *Pyricularia oryzae*) وەک هۆکارێکی پێوانەیی چەکی بایۆلۆجیی دژەبەروبوومی دانەوێڵەیی، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە پۆلێن کرا. کەڕووی پایریکلۆریا ئۆریزا کە هۆکاری وشکبوونی مەرەزەیە، بە هۆکاری دژەبەروبوومی دانەوێڵەیی، LX، ناسرابوو. لەو ماوەیەدا سپۆرەکانی وشکبوونی مەرەزە بە گرێبەستێک لە لایەن کۆمپانیای Charles Pfizerـەوە ئامادە دەکران و ڕەوانە دەکران بۆ Fort Detrick (فۆرت دیتریک، کەمپێکی توێژینەوەی سەربازییە لە ئەمەریکا) بۆ پۆلێنکردن و وشککردنەوە و هەڵگرتنیان. هەروەها لە سالانی ١٩٦٠ـەکاندا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هۆکاری وشکبوونی مەرەزەی لەسەر مەرەزەکانی دوورگەی ئۆکیناوا لە ژاپۆن تاقی کردەوە.[١]

بێگومان هێرشکردن بە هۆکاری وشکبوونی مەرەزە (بە کەڕووی پایریکلۆریا ئۆریزا) وەک چەکێکی بایۆلۆجی بۆ سەر مەرەزەکانی وڵاتێک، بە تایبەتی بۆ سەر ئەو وڵاتەی کە خۆراکی سەرەکیی دانیشتوانەکەی برنجە، دەبێتە هۆی لەناوچوونی مەرەزەکانی برنج و کارەسات بۆ وڵاتەکە دەخوڵقێنێت، قاتوقڕی و برسێتیی لێ دەکەوێتەوە و زیانێکی گەورەی ئابووریش بە وڵاتەکە دەگەیەنێت؛ وێڕای ئەوە، ئاسایشی خۆراکیی وڵاتەکەش دەخاتە مەترسییەوە.

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/United_States_herbicidal_warfare_research

## نەخۆشیی دۆکەی پەتاتە – Potato Blight Disease

پەتاتە، ئێستا، خۆراکێکی سەرەکییە لە ئەورووپا و زۆر لە بەشەکانی کیشوەری ئەمەریکای باکوور و باشوور. بەرهەمهێنەرە سەرەکییەکانی پەتاتە چین، ڕووسیا، هیندستان، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئۆکرانیان.[1] نەخۆشیی دۆکەی پەتاتە خراپترین کێشەیە کە تووشی چێنەرانی پەتاتە دەبێت. کاتێک ڕووەکی پەتاتە تووشی ئەم نەخۆشییە دەبێت، لە ماوەی ڕۆژێک یان دوو ڕۆژی تووشبوونیدا بەرهەمی پەتاتە لەناو دەبات، ئەوەیش کاتێک کەڕووی نەخۆشییەکە لە گەڵاکانی ڕووەکی پەتاتەوە دەگوازرێتەوە بۆ سەلکەکانی پەتاتەکە لە ژێر زەویدا و تووشی گەنینیان دەکات.

وەک لە پێشەوە باس کرا، دۆکەی پەتاتە، لە ساڵی ١٨٤٠ لە ئێرلەندا بوو بە هۆی برسێتی و قاتوقڕی لەو وڵاتەدا، چونکە پەتاتە خۆراکێکی سەرەکیی دانیشتوانەکەی بوو. لە سەرەتادا، نەخۆشیی دۆکەی پەتاتە لە ئەورووپا بڵاو بووەوە، لە کۆتاییدا گەیشتە ئێرلەندا. لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو کە جووتیارە ئێرلەندییەکان یەک جۆر پەتاتەیان دەچاند کە زۆر هەستیار بوو بۆ ئەو نەخۆشییە و ڕووەکیی پەتاتەکەش بە ئاسانی تووشی نەخۆشییەکە دەبوو. هۆی نەخۆشیی دۆکەی پەتاتە کەڕوویەکە بە ناوی *Phytophthora infestans* هەروەها، ئەم کەڕووە دەتوانێت ڕووەکی تری خێزانی پەتاتە، وەک ڕووەکی تەماتە، تووشی ئەم نەخۆشییە بکات. سپۆرەکانی ئەم کەڕووە هەوا هەڵیان دەگرێت و بە هۆی باوە دەگوازرێنەوە و لە سەر ڕووەکەکان دەنیشنەوە، بارودۆخی گونجاوی کەشوهەوا، وەک شێ و گەرمییەکی کەم، یارمەتیی گەشەکردنیان لەسەر ئەو ڕووەکانە دەدات.[2]

---

[1] https://www.nationalgeographic.org/encyclopedia/food-staple/#:~:text=Introduced

[2] https://www.allotment-garden.org/vegetable/potatoes/potato-blight/





ا                                                    ب

وێنەی (٦-١):

ا- گەڵای ڕووەکی پەتاتە کە تووشی نەخۆشیی دۆکەی پەتاتە بووە.

ب- سەلکەپەتاتەیەک کە تووشی نەخۆشیی دۆکە بووە و گەنیوە.

لە سەرەتای ئەم بەشەدا بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق، لە سەرەتای دەستپێکردنیەوە تاکو ڕازیبوونی عێراق بە بڕیاری ٦٨٧ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە شێوەی کرۆنۆلۆجیا دەخەینە ڕوو. بێگومان بڕیاری ٦٨٧ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٣ی نیسانی ١٩٩١ دەرچوو، لە ٦ی نیسانی هەمان ساڵ عێراق ئەم بڕیارەی قبووڵ کرد. یەکێک لە بڕگەکانی ئەم بڕیارە لەناوبردنی چەکە کۆکوژەکانی عێراقە، کە چەکە بایۆلۆجییەکانیش دەگرێتەوە.

### ٧-١ کرۆنۆلۆجیای بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق

* ساڵی ١٩٦٤، بەشی چەکە کیمیاییەکانی سوپای عێراقی دامەزراوە. کاری ئەم بەشە پلانـدانان، گواستنەوە، بەکارهێنان و ئۆپەراسیۆنە بەرگرییەکانی دژی چەکە کیمیاییەکان بووە. فەرماندەی ئەم بەشە، فەرماندەی یەکەی کیمیایی عێراقیش بووە. دروستبوونی ئەم بەشە یارمەتیی سەرهەڵدانی بیرۆکەی چەکی بایۆلۆجیی داوە.[1]

* لە ١٠ی نیسانی ١٩٧٢، پەیماننامەی قەدەغەکردنی پەرەپێدان و بەرهەمهێنان و عەمبارکردنی چەکە بایۆلۆجی و تۆکسینییەکان و لەناوبردنیان خراوەتە بەردەم وڵاتان بۆ واژۆکردن. عێراق لە ١١ ئایاری ١٩٧٢، ئەم پەیماننامەیەی واژۆ کردووە، بەڵام پەسەندی نەکردووە. لە کۆتاییدا، عێراق، ئەم پەیماننامەیەی لە نیسانی ١٩٩١

[1] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Ithaca and London: Cornell University Press, 2000), p. 62.

پەسەند کرد، ئەوەیش دوای ئەوەی لە جەنگی کەنداوی یەکەمدا، لەسەر دەستی هێزەکانی هاوپەیمانان تووشی شکست بوو.[1]

* ساڵی ١٩٧٤، بە فەرمانێکی حکومەت بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکان دەستی پێ کرد.[2]

* لە ٢ی نۆڤەمبەری ١٩٧٤، وەزیری کشتوکاڵی عێراق گرێبەستێک لەگەڵ پەیمانگەی میریۆکس (Merieux)، کە بنکەکەی لە پاریس بوو، واژۆ دەکات بۆ دامەزراندنی یەکەم دامەزراوەی بەرهەمهێنانی ڤاکسین لە ئەبووغرێب.[3]

* ساڵی ١٩٧٥، عێراق بەرنامەی توێژینەوە و پەرەپێدانی چەکە بایۆلۆجییەکان لە پەیمانگەی حەسەن ئیبن هەیسەم دادەڕێژێت. پەیمانگەی حەسەن ئین هەیسەم لە سەلمان پاک بوو، کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەلاتی بەغدا و ٣٠ کیلۆمەتر لە بەغداوە دوورە.[4]

* ساڵی ١٩٧٦، عێراق بەکتریای کوشندەی پیسەکوانی بە دەست هێنا، کە سەرچاوەکەی مرۆڤ و ئاژەڵ بوو. عێراق توێژینەوەی لەسەر ئەم بەکتریایە لە ڕووی چاندن، نەخۆشخستن، بە کردار گوێزرانەوەی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر و هەڵگرتنی کرد (دیار نییە عێراق چۆن بەکتریای پیسەکوانی، کە سەرچاوەکەی مرۆڤ بێت، دەست کەوتووە؛ نەخۆشیی پیسەکوان نەخۆشییەکی نیشتەجێیە لە عێراقدا).[5]

* لە ١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٧٩دا، بەگوێرەی سەرچاوە عێراقییەکان، پەیمانگەی حەسەن ئیبن هەیسەم دادەخات و کۆتایی بە توێژینەوەی بایۆلۆجی دێنێت. چەندین لە تاقمی کارمەندانی

---

[1] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf
[2] https://fas.org/nuke/guide/iraq/bw/program.htm
[3] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today,* Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 236.
[4]https://fas.org/nuke/guide/iraq/bw/program.htm
[5] Dany Shoham, "Iraq's Biological Warfare Agents: A Comprehensive Analysis," *Critical Review in Microbiology,* Vol. 26, No. 3, 2000, p. 181.

پەیمانگـەکە، لەوانە، سـەرۆکی پەیمـانگەکە، غەسـان ئیبـراهیم، کە پـلە سـەربازییەکەی ڕائیـد بـووە، لەسـەر دزینـی پـارە دەسـتگیر دەکـرێن. داخسـتنی پەیمانگـەکە بە هـۆی خراپیی ئیدارەدان و نەبوونی شـوێنی گونجاو و ئامێرەوە بووە (کۆمیسیۆنی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان مەزەنـدەی ئەوە دەکـات کە بەرنـامە بـایۆلۆجییەکەی عێـراق لەسـەر ئاستێکی بچووک بەردەوام بوو بێت).[1]

* لە کۆتـایی سـاڵانی ١٩٧٠کانـدا، عێراق مایۆکۆتۆکسـینی تـی–تـو (T–2 mycotoxin) لە پەیمانگـەی نیشـتیمانیی زانسـتیی تەندروسـتیی ژینگەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکڕێت.[2]

* لە کۆتـایی سـاڵانی ١٩٧٠کانـدا، حکـومەتی عێـراق گرێبەسـتێک لەگەڵ کۆمپانیـایەکی فەرەنسـی دەکـات بـۆ دروسـتکردنی کـارگەیەکی ڤاکسـینی ڤێتـرنەری لە نـاوچەی دۆرەی بەغـدا، کە لە سـاڵێکدا توانـای بەرهەمهێنانی ١٥ ملیۆن ژەم لە ١٥ ڤاکسینی جۆراوجۆری هەبێت.[3]

* لە سێپتەمبەری ساڵی ١٩٨٠، جەنگی ئێران – عێراق دەست پێ دەکات.

* لە سـاڵانی ١٩٧٩–١٩٨٥، دوای داخسـتنی پەیمانگـەی حەسـەن ئیبن هەیسەم (بە هـۆی دزینـی پارە، لە لایەن سـەرۆکی پەیمانگەکە و تـاقمی کارمەنـدە باڵاکـانی)، تـوێژینەوەی بـایۆلۆجی لە سـەلمان پـاک بەردەوام دەبێت.[4]

* لە سـاڵانی ١٩٨٠کانـدا، عێـراق نـزیکەی ١٠ تەن لە ناوەنـدی گەشەکردنی بەکتریا لە کۆمپانیایەکی بەریتانیی نەناسراو دەکڕێت.[5]

---

[1] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

[2] Dany Shoham, "Iraq's Biological Warfare Agents: A Comprehensive Analysis," *Critical Review in Microbiology,* Vol. 26 (3), 2000, p. 192.

[3] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today,* Vol. 14, No. 3, December 1993, pp. 236–237

[4] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C.

[5] William J. Broad and Judith Miller, "How Iraq's Biological Weapons Program Came to Light," *New York Times*, 26 February 1998

* لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا، عێراق ١٧ جۆر لە هۆکاری بایۆلۆجی لە دامەزراوە بازرگانییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و فەرەنسا بە دەست دەهێنێت، لەوانە، بەکتریای پیسەکوان و تۆکسینی بۆتولینوم.[١]

* لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا، عێراق لە ڕێی نوێنەرێکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، لە کۆمپانیای Sigma–Chemie، تۆکسینی تی–تو و تۆکسینی ئیچ تی–تو، تۆکسینەکانی diacetoxyscirpenol و verrucarol بە دەست دەهێنێت.[٢]

* لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا، سەنتەری کۆنترۆڵکردنی نەخۆشیی سەر بە خزمەتگوزاریی تەندروستیی گشتیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ڤایرۆسێک دەنێرێت بۆ پسپۆڕێکی مایکرۆبایۆلۆجیی عێراقی لە بەسرا. ناردنەکە، بە ڕواڵەت، بۆ توێژینەوەی تەندروستیی گشتی بووە. ڤایرۆسەکە تیرەیەکی ئیسرائیلیی ڤایرۆسی ڕۆژئاوای نیلی هەوکردنی مێشک بووە. وەک دەڵێن، بە کۆمەکی دارایی بەرنامەی توێژینەوەی بەرگریی بایۆلۆجیی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ئیسرائیل هەوڵی پەرەپێدانی ئەم ڤایرۆسە دراوە.[٣]

* لە سەرەتای ساڵانی ١٩٨٠کاندا، عێراق، دەبێتە خاوەنی بەکتریای پیسەکوان و دەیخاتە ناو گوللەتۆپەکانیەوە.[٤]

---

[1] Philip Shenon, "Iraq Links Germs for Weapons to U.S. and France," *The New York Times,* 16 March, 2003

[2] Dany Shoham, "Iraq's Biological Warfare Agents: A Comprehensive Analysis," *Critical Review in Microbiology,* Vol. 26, No. 3, 2000, p. 192.

[3] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today,* Vol. 14, No. 3, December, 1993, p. 238

[4] Dany Shoham, "Iraq's Biological Warfare Agents: A Comprehensive Analysis," Critical Review in Microbiology, Vol. 26, No. 3, 2000, p. 181.

* ساڵی ١٩٨٠، حکومەتی عێراق، گرێبەستێک لەگەڵ کۆمپانیایەکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بە ناوی Thyssen Rheinstahl Technik واژۆ دەکات بۆ دروستکردنی تاقیگەیەکی توێژینەوەی بایۆلۆجی لە نزیک سەلمان پاک. هەروەها عێراق، لە ساڵی ١٩٨١دا، گرێبەستێکی دیکە لەگەڵ هەمان کۆمپانیا بۆ هەمان مەبەست واژۆ دەکات. تاقیگەکە لە ساڵی ١٩٨٣ تەواو دەبێت و دەبێتە چەقی توێژینەوەی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق و هەوڵەکانی پەرەپێدانیان. ئەم تاقیگەیە، لەڕووی ئاسایشییەوە، زۆر پارێزراو بووە.[١]

* لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٣دا، بە فەرمانی سەددام حسێن، زانا عێراقییەکان تیرەکانی ئەو هۆکارە بایۆلۆجییانەی دەبنە هۆی نەخۆشیی بۆتولیزم و پیسەکوان و سالمۆنیلا، لە تاقیکردنەوەی چەکەکاندا بەکار دەهێنن. ئەوەش بە گوتەی ڕۆژنامەی ئۆبزێرڤەر (Observer) کە قسەکانی لە زانایەکی عێراقی وەرگرتووە. ئەم زانایە لە عێراق هەڵگەڕابووەوە و پەنای بۆ ئێران بردبوو. زاناکە وتوویەتی ئەوە دەزانم کە زانا عێراقییەکان بەکتریای کلۆستریدۆم بۆتولیزمیان لە جۆری C لەسەر مەڕ تاقی کردووەتەوە. ساڵی ١٩٨٣، زانا عێراقییەکان توانییان بەسەر کێشەیەکدا سەربکەون، ئەوەیش بەدیهێنانی ئەوەی ئەو تۆکسینەی لە بۆمب یان لە گوللەتۆپەکان دەکرێت، لە کاتی تەقینەوەیاندا تێک نەچێت.[٢]

1 Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today*, Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 237.

2 Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), p. 57.

* ساڵی ١٩٨٣، بەرنامەی جەنگی بایۆلۆجی دەبێت بە بەشێک لە ئامانجەکانی دامەزراوەی ئەلموثەننا.[1]

* ساڵی ١٩٨٣، عەبدولناسر ئەلهینداوی کە پسپۆڕێکی مایکرۆبایۆلۆجیی عێراقی بوو، ڕاپۆرتێکی نهێنی بۆ بەرپرسە باڵاکانی حیزبی بەعسی عێراقی دەنووسێت و لە ڕاپۆرتەکەدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن دەتوانرێت بەرنامەی بایۆلۆجی بگۆڕرێت بۆ سەرچاوەیەکی هێزی سەربازی و بەرهەمێکی بەرفراوانیشی هەبێت. بە گوتەی بەرپرسە باڵاکانی عێراق، ڕاپۆرتەکە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو. لە ماوەی ساڵێکدا، ڕژێم فەرمانی دەرکرد کە کۆمەڵە تەلارێکی جیا لە دامەزراوەی ئەلموثەننا بۆ توێژینەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان دروست بکرێن. ساڵی ١٩٩٧، عێراق بە کۆمیسیۆنی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکانی (UNSCOM) ڕاگەیاند "ئەو ئامانجانەی ئێمە لە خەیاڵماندا بوون دەربارەی بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکان، بەرهەمهێنانی پێشگیریکەرێکی کردەنی (viable deterrent) بوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەگەری هەر هێرشێکی ئیسرائیل کە تێیدا چەکی ناوکی بەکار بهێنێت."[2]

* ساڵی ١٩٨٣، عێراق دەستی بە پرۆژەیەک کرد کە بە "پرۆژەی لەپێشینەی سەرۆکایەتی" ناسرابوو. وەک دەڵێن، پرۆژەکە دوای ئەوە بوو کە عەبدولناسر ئەلهینداوی ڕاپۆرتێکی نهێنیی پێشکەش بە سەرکردایەتیی ڕژێمی عێراق کردبوو، ڕاپۆرتەکە ئەوەی ڕوون کردبووەوە کە چۆن بەرهەمهێنانی هۆکارە بایۆلۆجییەکان، بە

---

[1] Official Iraqi Document *Full, Final and Complete Disclosure of Iraq's Past Biological Programme*, September 1997

[2] Jeffrey Smith, "Iraq's Drive for a Biological Arsenal," *Washington Post*, 21 November 1997.

شـــێوەیەکی بەرفـــراوان، دەتوانێـــت وەک چەکێـــک دژی هێـــزە چەکدارەکانی ئێران بەکار بهێنرێت.[1]

* ســاڵی ١٩٨٤، کۆڵۆنێـل ســەمیم جەلال عەبـدوڵلەتیف، ئەنـدامی بەشـی ڕاهێنـان لە بەشـی یەکەی کیمیـایی هێزە چەکدارەکانی عێـراق، نـامیلکەیەکی ســەربازی لەســەر "ئۆپەراسیۆنە کیمیـایی و بـایۆلۆجی و ناوکییەکان" بڵاو دەکـاتەوە. نـامیلکەکە شـیکردنەوەیەکی دوورودرێژی دەربــارەی جەنگــی بــایۆلۆجی تێـدا بــوو. هەروەهــا ئەم نــامیلکەیە گفتوگــۆیەکی دەربــارەی ئەوەی چــۆن ناکوشــندەژمەکانی هۆکــارە بایۆلۆجییەکـان دەتـوانن ئەرکێکی گـران بـخەنە سـەر شـانی هێزەکـانی دوژمن و ورەیان بڕووخێنن. لەتیف دەگـاتە ئەو ئەنجـامەی کە دەبێت ئەرکـانی گشـتیی سـوپای عێراقـی، لە ئەگەرەکـانی لێدانی دوژمـن بە هۆکــارە بایۆلۆجییەکــان، بە بەکارهێنــانی ئەو سیســتەمە چەکــانەی بەردەستن، بکۆڵێتەوە.[2]

* ســاڵی ١٩٨٤، عێـراق هەشـت تـاقیگەی گەڕۆک لە کۆمپانیـایەکی ئەڵمانی بەناوی Iveco Magirus AG بە دەست دەهێنێت.[3]

* ساڵی ١٩٨٤، عێراق لە سەلمان پاک دەست بە توێژینەوە لەسـەر خەڵووزەی گەنم دەکات.[4]

* ســاڵی ١٩٨٥، عێـراق بەرنـامەی چەکە بـایۆلۆجییەکەی لە ژێـر چەتـری بەرنــامەی چەکـی کیمیاییـدا دەبـووژێنێتەوە. بووژانـدنەوەی

---

[1] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), pp. 47–78.

[2] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control* Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 238

[3] "Iraq Watch" project of the Wisconsin Project on Nuclear Arms Control, 24 April 2000, www.iraqwatch.org.

[4] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.

بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکە دەدرێتە پاڵ جەنەراڵ نزار عەتتار. نزار عەتتار بەڕێوەبەری گشتیی دامەزراوەی گشتیی ئەلموثەننا و بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پیشەسازییە هونەرییەکانی وەزارەتی بەرگری بوو. عێراق کۆتا قۆناغی توێژینەوەی سەربازیی بە توێژینەوە لەسەر چەند تیرەیەکی بەکتریای پیسەکوان دەست پێ دەکات. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٧دا، کۆمەڵێک لە توێژەرانی بایۆلۆجی دەگوازرێنەوە بۆ سەلمان پاک، لەوێ لە دەزگایەک کار دەکەن کە سەر بە دەزگای ئاسایشی عێراقە. دواتر ئەم کۆمەڵە توێژەرە بایۆلۆجییە، لە ساڵانی ١٩٨٨-١٩٨٩دا، دەگوازرێنەوە بۆ کارگەی ئەلحەکەم.[1]

* ساڵی ١٩٨٥، دکتۆرە ڕیحاب تەها دادەمەزرێنرێت بۆ ڕێبەرایەتکردنی گرووپێکی بچووکی توێژینەوەی چەکی بایۆلۆجی و تاکو ساڵی ١٩٨٧ لەوێ دەبێت.[2]

* ساڵی ١٩٨٥، بەرنامەی جەنگی بایۆلۆجی خێراتر دەکرێت. توێژینەوە لەسەر پیسەکوان لە دامەزراوەی گشتیی ئەلموثەننا دەست پێ دەکات. تاقمێکی زیادەی جەنگی بایۆلۆجی لە ئەلموثەننا دادەمەزرێنرێت.[3]

* ساڵی ١٩٨٥، دامەزراوەی گشتیی ئەلموثەننا، کە دەزگایەکی سەرەکیی چەکە کیمیاییەکانی عێراق بوو، پێشنیازی دەستپێکردنی بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکان دەکات. ئەم دامەزراوەیە، لە ئایار یان حوزەیران، هەوڵ دەدات ڕەزامەندیی وەزارەتی بەرگریی عێراق بۆ بەرنامەکە بە دەست بهێنێت و بە دەستی دەهێنێت. دامەزراوەی

[1] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

[2] *Iraq's Weapons of Mass Destruction: The Assessment of the British Government*. 2002, p. 11–12.

[3] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past as Future?" *The Journal of the American Medical Association,* 6 August 1997, Vol. 278, Issue. 5, pp. 418–424

ئەلموثەننا ئامێرێکی ترشێنەری ١٥٠ لیتری دەکڕێت و تاقمێکی بۆ دادەمەزرێنێت. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا، تاقمێکی ١٠ کەسی کار لەسەر توێژینەوەی چەکی بایۆلۆجی دەکەن.[١]

* ساڵی ١٩٨٥، بە گوتەی هەڵگەڕاوەیەکی عێراقی کە لە ڕژێمی سەددام هەڵگەڕابووەوە، نزیکەی ٥٠ زیندانی گوازراونەتەوە بۆ سەلمان پاک، بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆجییان لەسەر بکرێت.[٢]

* لە ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٨٠کاندا، وەزارەتی پەروەردەی عێراق داوای ٧٠ پاکەت (قوتوو) لە میکرۆب و تۆکسین لە ڕێکخراوەی American Type Culture Collection (ATCC)ی ئەمەریکی دەکات. ئەم ڕێکخراوە ڕێکخراوەیەکی قازانجنەویستە و لە Rockvilleیە لە ویلایەتی میریلاند. ڕێکخراوەکە ٣٦ تیرەی دە نەخۆشخەر بۆ عێراق دەنێرێت؛ لەوانە، بەکتریای پیسەکوان و بەکتریای کلۆسرتریدیوم بۆتولینوم. لە نێوان ساڵانی ١٩٨٥-١٩٨٩دا، وەزارەتی بازرگانیی ئەمەریکا ڕەزامەندیی لەسەر ناردنی ئەو میکرۆب و تۆکسینانە داوە. بە گوتەی شیکەرەوەیەک، داوایەکی عێراق لە ساڵی ١٩٨٦دا، بەکتریای کلۆستریدیوم پێرفرینجنز (*Clostridium Perfringens*)ی تێدا بووە، ئەم بەکتریایە دەبێتە هۆی نەخۆشیی گازەگانگرین.[٣]

* ساڵی ١٩٨٥، لە دامەزراوەی سەلمان پاک توێژینەوە لەسەر تیرەیەکی کەڕوویی (fungal strain) کە دەبێتە هۆی خەڵوورەزەی گەنم، کرا. لەم توێژینەوەیەدا دەرکەوت کە ئەو تیرەیە زۆر کوشندیە

---

[1] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[2] Khidhir Hamza with Jeff Stein, *Saddam's Bombmaker: The Terrifying Inside Story of the Iraqi Nuclear and Biological Weapons Agenda*, New York: Scribner, 2000, p. 199.

[3] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

بۆ ڕووەکی گەنم، ئەگەر ڕووەکی گەنمی پێنەگەیشتوو بە سپۆرەکانی ئەم تیرەیە بڕشێنرێت.[1]

* ساڵی ١٩٨٦، عێراق دەست بە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیات (literature)ی نەخۆشخەرە جۆراوجۆرەکان دەکات. ئەو هۆکارە بایۆلۆجییانەی عێراق لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکردن، ئەمانە بوون: پیسەکوان، کلۆستریدیوم پێرفرینجنز، تۆکسینە بەهێزەکان (تۆکسینی بۆتولینوم، ئەفلاتوسین، رایسین، تۆکسینە کەڕووییەکانی ترایکۆثیسین)، هۆکارێکی دژەدانەوێڵە (خەڵووزەی گەنم) و نەخۆشییەکخەرەکانی ئاژەڵ (خوێنبەربوونەچاوئێشە، ڤایرۆسی ڕۆتا و ئاوڵەی وشتر). پسپۆڕانی عێراقی داوای کڕینی گەلێک تۆویان بۆ چاندن لە تاقیگە بازرگانییەکانی فەڕەنسا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کرد.[2]

* ساڵی ١٩٨٦، کۆمپانیای گشتی بۆ بەرهەمهێنانی مێرووکوژەکان ترشێنەرێکی (fermenter) ١٥٠ لیتری دەکڕێت و لە سەلمان پاک دای دەمەزرێنێت.[3]

* ساڵی ١٩٨٦، حکومەتی عێراق چوار نموونە لە تۆکسینەکەڕووی ترایکۆثیسین دەکرێت. بە ڕواڵەت، عێراق وای پیشان دەدات کە بۆ شیکردنەوە تاقیگەییەکان بەکاری دەهێنێت. بەگوێرەی ڕۆژنامەی دێر شپیگل، ئەم مامەڵە بازرگانییە بە هۆی کۆسیف کوهن، سەرۆکی کۆمپانیای هەناردەکردنی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و دەڵاڵێکی گومانلێکراوی

[1] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past as Future?" *The Journal of the American Medical Association,* Vol 278, No. 5, 6 August 1997, pp. 418–424.

[2] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), pp. 47–78.

[3] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today* , Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 238.

عێراقییەوە ئەنجام دراوە. ئەم دەڵاڵە عێراقییە تۆکسینەکان لە کۆمپانیای Sigma–Chemie لە میونخ دەکڕێت. کۆمپانیای Sigma–Chemie کۆمپانیایەکە سەر بە کۆمپانیایەکی ئەمەریکییە کە بنکەکەی لە سانت لویسە. ئەم کۆمپانیا ئەمەریکییە مادەی زیندەکیمیایی (biochemical) کە تایبەتن بە دامەزراوە توێژینەوەییەکان، دروست دەکات.[1]

* ساڵی ١٩٨٦، عێراق سەنتەری ئەندازەی بۆماوەزانی و توێژینەوەی زیندەتەکنۆلۆجیا دەکاتەوە. ئەم سەنتەرە بە ڕواڵەت چاو دەخاتە سەر کارپێکردنە مەدەنییەکانی تەکنۆلۆجیای DNA و یەکگرتنەوە.[2]

* ساڵی ١٩٨٦، عێراق ٢٤ نەخۆشخەر دەکڕێت، لەوانە ١٣ بەکتریای تێدا دەبێت. ئەم ١٣ بەکتریاییە وا پۆلێن کرابوون کە زیان بە تەندروستیی گشتی و بەروبوومی دانەوێڵە دەگەیەنن. هەروەها ئەم نەخۆشخەرە کڕراوانە هەندێک تیرەی تایبەتی بەکتریایان تێدا دەبێت کە دەبنە هۆی پیسەکوان و بۆتولیزم و گازەگانگرین. ئەم نەخۆشخەرە کڕراوانە نێررابوون بۆ زانکۆی بەغدا و سوپای عێراق بە نهێنی پارەی کڕینەکەی دابوو.[3]

* لە ٣ی ئابی ١٩٨٦دا، بەگوێرەی یاداشتنامەیەکی حکومەتی عێراق، جەنەراڵ زیا عەبدولوەهاب عیزەت، فەرماندەی فیرقەی هەولێر، فەرمان بۆ هەموو یەکەکانی فیرقەکە دەردەکات کە ئاماری نیوەساڵانە بۆ هەموو "مادە بایۆلۆجی و کیمیاییەکان" بکەن. شیکەرەوەکانی دەزگای هەواڵگریی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا،

[1] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Contemporary Security Policy,* Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 239.

[2] Jonathan Tucker, p. 240.

[3] Jeffrey Smith, "Iraq's Drive for a Biological Arsenal," *Washington Post*, 21 November 1997; "A look at US Shipments of Pathogens to Iraq", *USA Today*, 30 September, 2002.

کە لێکۆڵینەوەیـان لەسـەر ئەو بەڵگەنامەیـە کردبـوو، گەیشـتبوونە ئەو ئەنجامەی کە ئەم بەڵگەنامەیە بەڵگەنامەیەکی ڕاستەقینەیە.[١]

* سـاڵی ١٩٨٧، عێـراق، ٢,٧ گـرام لە تۆکسـینەکەڕووییەکانی لە کۆمپانیایەکی ئەڵمانی هاوردە کرد.[٢]

* ساڵی ١٩٨٧، بڕوا وابوو کە عێراق دەستی بە کارکردن لەسـەر تۆکسـینەکەڕووییەکانی ترایکۆثیسـین کردبێت. عێـراق ڕای گەیانـدبوو کە لە ئازاری ساڵی ١٩٩٠دا دەستی بەم کارە کردووە.

* سـاڵی ١٩٨٧، عێـراق لە سـەلمان پـاک و ئەلموثەننـا گەلێـک تاقیکردنەوە لەسەر بڵاوکردنەوەی هۆکارە بایۆلۆجییەکان بە شێوەی پـرژە و تەنـۆلکەی بچـووک لە هەوادا دەکـات بـۆ ئەو هۆکـارە بایۆلۆجییانەی کە بە شێوەی شل یان وشک هەن.

* سـاڵی ١٩٨٧، عێـراق بە شـێوەیەکی بەرفـراوان دەسـت بە بەرهەمهێنانی هۆکارەکانی چەکی بایۆلۆجی دەکات.[٣]

* لە ئایاری ١٩٨٧، عێراق بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی، لەوانە تـوێژینەوە لەسـەر نەخۆشـیی پیسـەکوان، لە دامەزراوەی گشـتیی ئەلموثەننـاوە دەگـوازێتەوە بـۆ سـەلمان پـاک. عێـراق گرووپێکـی توێژینەوەی چەکە بایۆلۆجییەکانی لە سەلمان پاک پێک هێنابوو.[٤]

* لە حـوزەیرانی ١٩٨٧دا، تـاریق ئەلزوبەیـدی، کـە پسـپۆڕێکی نەخۆشی بوو لە بواری تەندروستیدا، هێنرابوو بۆ سەلمان پاک، بۆ ئەوەی کار لەسـەر پێشخسـتنی ئـامێرێکی بڵاوکـردنەوەی هۆکارەکـانی چەکە بایۆلۆجییەکـان بکـات، دواتـر ئـامێرەکە نـاو نـرا ئـامێری

---

[1] Jonathan Tucker , p. 239.

[2] "Iraq Watch" project of the Wisconsin Project on Nuclear Arms Control, www.iraqwatch.org.

[3] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

[4] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past As Future?" *Journal of the American Medical Association (JAMA)*, Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, pp.418–419

ئەلزوبەیدی. ئامێرەکە هێلیکۆپتەرێک بوو کە ئامێرێکی دروستکەری پرژەی پێوە کرابوو.[1]

* لە ئابی ١٩٨٧دا، کارگەیەکی پرۆتینی یەکخانەیی کە پێشتر لە ئەلتاجی بوو، ڕادەستی سەنتەری توێژینەوەی هونەری دەکرێت و لە ساڵی ١٩٨٨دا دەخرێتە بواری کارپێکردنەوە.

* لە کۆتایی ١٩٨٧دا، سەنتەری توێژینەوەی هونەری ڕاپۆرتێک پێشکەش بە لیژنەی پیشەسازیی سەربازی دەکات دەربارەی سەرکەوتنی لە کارەکانی لەسەر چەکە بایۆلۆجییەکان. لە ئەنجامدا، عێراق بڕیار دەدات کە قۆناغی بەرهەمهێنانی تەواوی چەکە بایۆلۆجییەکان دەست پێ بکات.[2]

* لە کۆتایی ١٩٨٧دا، عێراق تۆکسینی بۆتولینوم بۆ تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان بەرهەم دەهێنێت.[3]

* ساڵی ١٩٨٧، وەزارەتی بەرگریی عێراق دووەم نامیلکە بڵاو دەکاتەوە، بە ناوی بنەماکانی بەکارهێنانی چەکە بایۆلۆجی و کیمیاییەکان لە جەنگدا. لەم نامیلکەیەدا، لەو بەشەی کە لەسەر بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجییە، ڕێنمایی کرداری باس دەکات کە چۆن هێرشگەلی بچووک و ئۆپەراسیۆنی تێکدەرانە بکرێن، پێش ئەوەی هێرشێکی گشتی دەست پێ بکات. ئەمەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سوپای عێراق بیر لە ئەگەری بە نهێنی بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی لە پشت هێڵەکانی دوژمنەوە بکاتەوە.

---

[1] Based on a conversation with a former UNSCOM inspector, 26 February 2001.

[2] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[3] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.

* ساڵی ١٩٨٧، بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراقی، لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە، دەخرێتە ژێر کۆنترۆڵی سەنتەری توێژینەوەی هونەری لە ناو ڕێکخراوەی ئاسایشی تایبەتدا. بەڕێوەبەری ڕێکخراوەی ئاسایشی تایبەت، فەریق ڕوکن حسێن کامل، فەرمان دەردەکات کە دامودەزگاکانی توێژینەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان تەواو بکەن و ژوورێکی تاقیکردنەوەی پرژەی تێدا بێت بۆ لێکۆڵینەوە لە کاریگەرییەکانی هۆکارەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر مەڕ، گوێدرێژ، مەیموون و سەگ. سەرەڕای ئەوەش، توێژینەوەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان لە ئەلموثەنناوە گوازرانەوە بۆ سەلمان پاک.[١]

* ساڵی ١٩٨٧، توێژینەوەی پیسەکوان لە دامەزراوەی سەرەکیی عێراقیی چەکە کیمیاییەکان، دامەزراوەی گشتیی ئەلموثەننا، گوازرایەوە بۆ سەلمان پاک. بەم جۆرە، سەلمان پاک بوو بە سەنتەری توێژینەوە و پەرەپێدان لە بواری جەنگی بایۆلۆجیدا.[٢]

* ساڵی ١٩٨٧، عێراق لەسەر ئاستی تاقیگەیی و پیشەسازی دەست دەکات بە بەرهەمهێنانی هۆکارەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان. هەرچەندە عێراق نکۆڵی دەکات لەوەی بتوانێت پەرە بە چەکی وا بدات و بتوانێت هۆکاری بایۆلۆجی بە دوژمندا بکات.[٣]

* لە کۆتایی ١٩٨٧دا، عێراق تۆکسینی بۆتولینوم بەرهەم دەهێنێت، بۆ ئەوەی بۆ چەک تاقیی بکاتەوە.[٤]

---

[1] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), pp. 47–78.

[2] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past as Future?" *The Journal of the American Medical Association,* Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, pp. 418–424.

[3] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C

[4] *Full, Final and Complete Disclosure of Iraq's Past Biological Programme*, September 1997; UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C.

* ساڵی ١٩٨٧، عێراق دەست دەكات بە تاقیكردنەوەی مەیدانی بە بەكارهێنانی چەک كە لاساییكراوەكانی پیسەكوان و تۆكسینی بۆتولینومیان تێدا بوو. [لێدوانەكانی عێراق بۆ نەتەوە یەكگرتووەكان، دەربارەی پلاندانانی بۆ تاقیكردنەوەی چەكە بایۆلۆجییەكان، دەڵێت تاكو ساڵی ١٩٨٨ دەستی بە پلاندانان نەكردووە. بەرپرسانی UNSCOM لەگەڵ ئەو رایەی عێراق نین و لەو بڕوایەدان كە پلاندانانەكە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٦ دەستی پێ كراوە و لە ساڵی ١٩٨٧ پلاندانانی دوورودرێژ دەستی پێ كراوە.][١]

* كۆتایی ساڵانی ١٩٨٠كان، عێراق بەكتریای كلۆستریدیوم پێرفرینجز دەكات بە چەكی بایۆلۆجی.[٢]

* ساڵی ١٩٨٨، حسێن كامیل بەرنامەی چەكە بایۆلۆجییەكان دەگرێتە دەست.[٣]

* ساڵی ١٩٨٨، عێراق داوای كڕینی نزیكەی ٤٠ تەن ناوەندی گەشەكردنی دیارینەكراوی لە كۆمپانیای ئۆكسۆید لە بێدفۆرد، ئینگلتەرا و كۆمپانیای سویسریی فلوكا كردبوو، ئەو دوو كۆمپانیایەش ئەو برەیان رادەستی عێراق كردبوو.[٤]

* ساڵی ١٩٨٨، عێراق داوای كڕینی ئامێرێكی ترشێنەری ١٣٢٥ گالۆنیی لە كۆمپانیای Chemapی سویسری كردبوو و هەوڵی كڕینی چەند ئامێرێكی ترشێنەری زیاتریشی دابوو، بەڵام ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا و هاوپەیمانەكانی، سویسرا رازی دەكەن كە واز لەم مامەڵەی فرۆشتنە بهێنێت.[٥]

---

[1] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

[2] *Full, Final and Complete Disclosure of Iraq's Past Biological Programme*, September 1997; UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C.

[3] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

[4] Al J. Venter, "New–Era Threat: Iraq's Biological Weapons," *Middle East Policy,* Vol 6, No. 4, 4 June 1999, p. 111

[5] William J. Broad and Judith Miller, "How Iraq's Biological Weapons Program Came to Light," *New York Times*, 26 February 1998.

* ساڵی ١٩٨٨، لەسەر داوای ئەفسەرێکی ئاسایشی ناوخۆ، عێراق دەست بە توێژینەوە لەسەر ڕایسین دەکات لە سەلمان پاک. هەرچەندە عێراق بانگەشەی ئەوە دەکات کە تاکو ساڵی ١٩٨٩ توێژینەوەی لەسەر ڕایسین دەست پێ نەکردبێت، بەڵام لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ عێراق، لەو بڕوایەدایە عێراق لە ساڵی ١٩٨٨دا دەستی بە توێژینەوە لەسەر ڕایسین کردبێت.[1]

* ساڵی ١٩٨٨، عێراق چەندین تاقیکردنەوەی جێگیر لەسەر بڵاوکردنەوەی هۆکارەکانی چەکی کیمیایی بە بەکارهێنانی بۆمبی هەوایی جۆری LD–250 دەکات.[2]

* ساڵی ١٩٨٨، سەنتەری کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکان و پاراستن (CDC) لە ئەمەریکا، هەندێک نموونەی بەکتریا بۆ پەیمانگەی زەرداو (serum) و ڤاکسینی عێراقی کە لە عامریە بوو، دەنێرێت. پەیمانگەکە نموونەکان هەڵدەگرێت، وێڕای ئەوەی توێژینەوەی ئەندازەی بۆماوەییان بۆ بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر دەکات.[3]

* ساڵی ١٩٨٨، گەنمی پێنەگەیشتوو کە لە نزیک شاری موسڵ چێنرابوون، تووشی نەخۆشیی خەڵووزەی گەنم بووبوون. عێراق ئەم گەنمە تووشبوانە دروێنە دەکات و دەیگوێزێتەوە و لە فوزەیلییە لە عەمباردا هەڵیان دەگرێت.[4]

* لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨دا، عێراق دەست دەکات بەوەی هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی بکات بە چەک. هەروەها عێراق

---

[1] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.

[2] Al J. Venter, "Missing in Iraq: The UN Charts Saddam's Lethal Inventory," *Jane's International Defense Review*, May 1999, p. 35.

[3] "A Look at US Shipments of Pathogens to Iraq", *USA Today*, 30 September, 2002.

[4] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past As Future?" *Journal of the American Medical Association (JAMA),* Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, p. 419.

گەورەزانایانی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجی، لە سەنتەری توێژینەوەی هونەری، دەنێرێت بۆ کارگەکانی چەک و تەقەمەنی، بۆ ئەوەی ئەم زانایانە ئاشنایەتی لەم بوارەدا پەیدا بکەن. هەروەها عێراق ڕازی بوو کە دامەزراوەی گشتیی ئەلموثەننا، بە هۆی ئەوەی ئەزموونی هەبوو لەوەی هۆکارە کیمیاییەکان بکات بە چەک، یارمەتیی پێویستی زاناکان بدات بۆ هەڵبژاردنی جۆری چەکەکان و ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی مەیدانی بەو چەکانە.[1]

* لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨دا، پەیمانگەی حەسەن ئیبن هەیثەم دەستنیشان کرا و بەسترایەوە بە دەزگای سەلمان پاکی جەنگی بایۆلۆجییەوە.[2]

* لە مانگی شوبات یان ئازار – سێپتەمبەر/ئۆکتۆبەری ١٩٨٨، بەرهەمهێنانی تۆکسینی بۆتولینوم لە ئەلتاجی، بە تاقمێکی هەشت کەسی دەست پێ دەکات کە ترشێنەرێکی ٤٥٠ لیترییان بەکار هێنابوو.[3]

* لە ٢٤ی ئازاری ١٩٨٨دا، دامەزراوەی ئەلحەکەم کرا بە شوێنێکی تازەی بەرهەمهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکان. ئەم پرۆژەیە ناو نرا پرۆژەی "٣٢٤".[4]

---

[1] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[2] *Iraq's Biological Weapon Sites and Facilities*, Center for Nonproliferation Studies, Monterey Institute of International Studies, July 1999, pp. 10–11.

[3] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[4] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu; Official Iraqi Document, September 1997.

* له ئـــــازاری ١٩٨٨دا، دەوترێـــــت عێـــــراق یەکەم و دووەم تـــــاقیکردنەوەی مەیـــدانیی چەکە بایۆلۆجییەکــــانی له مەیـــدانی تـــــاقیکردنەوەی مەودای چەکەکـــــان له دامەزراوەی ئەلموثەننـــــا له مەحمودییە کردبێت. ئەو هۆکارانەی تاقی کرابوونەوە، بریتی بوون له بەکتریای Bacillus subtilis، لاساییکەرەوەیەکی بەکتریای پیسەکوان و تۆکسـینی بۆتولینـوم. ئەو چەکـانەی بەکـار هێنرابـوون، بۆمبەکـانی LD-250یشیان دەگرتەوە.

* له نیســانی ١٩٨٨دا، عێـراق چەنـد هۆکـارێکی نـوێ بـۆ کـاری توێژینەوەی بەکتریایی له سەلمان پاک زیـاد دەکات، وێڕای بەکتریـای پیســەکوان و تۆکسـینی بۆتولینـوم. ئەم بەکتریـا زیـادکردنە بەکتریـای کلۆسـتریدیوم پێرفرینجـزی گـرتەوە، کە بەکتریـایەکە مـرۆڤ تووشـی گازەگانگرین دەکات.

* له ٢٢ی ئایــاری ١٩٨٨دا، لەگەڵ دامەزرانـدنی دکتـۆر عیمــاد له ســەلمان پــاک، عێـراق دەسـت بە تـوێژینەوە لەســەر ئەفلاتۆکسـین aflatoxin دەکات.[1]

* له ئـابی ١٩٨٨دا، عێـراق سـەرکەوتوو دەبێـت له تـاقیکردنەوەی مەیدانیی ئامێرەکانی ئەلزوبەیدی و ئامێرە پرژەدروستکەرەکانی تر، بۆ پرژاندنی سپۆرەکانی بەکتریـایBacillus subtilis له خـان بەنـی سەعد.[2]

* له سێپتەمبەری ١٩٨٨دا، دروستکردنی تەلارەکانی بەرهەمهێنان له ئەلـحەکەم تەواو دەبـن و دەســت بە دروســتکردنی تەلارەکــانی تاقیگەکان دەکرێت.[3]

---

[1] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu

[2] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

[3] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

* لە سـێپتەمبەری ١٩٨٨دا، ڕێکخـراوی ATCC لە ڤێرجینیـای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، چوار تیرەی بەکتریای Bacillus anthracis، یەک تیـرەی بەکتریـای کلۆسـتریدیوم بۆتولینـوم و سـێ تیرەی بەکتریای کلۆستریدیوم پێرفرینجز بۆ عێراق دەنێرێت.[1]

* لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٨دا، هێڵی ترشێنەری ٤٥٠ لیتری لە ئەلتاجی، کە بۆ بەرهەمهێنانی تۆکسینی بۆتولینوم بەکار دەهێنرا، دەگوازرێتەوە بۆ ئەلحەکەم.[2]

* لە نـۆڤەمبەری ١٩٨٨دا، دوو ترشـێنەری ١٨٥٠ لیتـری و ٧ ترشـێنەری ١٤٨٠ لیتـری لە تاقیگەکـانی تـوێژینەوەی ڤێتـرنەرییەوە دەگوازرێنەوە بۆ ئەلحەکەم.[3]

* لە کۆتـایی ١٩٨٨دا، عێـراق تـوێژینەوە لەسـەر ترشـاندنی بەکتریای پیسەکوان و بەرهەمهێنانی سـەرەتایی پیسـەکوان دەکات لە سەلمان پاک، بە بەکارهێنانی ترشێنەری تاقیگەیی قەبارە ٧ لیتری و ١٤ لیتری.[4]

* لە سـاڵانی ١٩٨٨-١٩٨٩دا، عێـراق، تـاقیکردنەوە لەسـەر ئەو بۆمـب و مووشـەکانە دەکات کە تۆکسـینی بۆتولینـوم، ئەفلاتۆکسـینی شێرپەنجە پەیداکەر و بەکتریای Bacillus subtilisی تێ کردبوون.[5]

---

[1] —"A Look at US Shipments of Pathogens to Iraq," *USA Today*, 30 September, 2002.

[2] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[3] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[4] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[5] Louis Meixler, "U.N. Report: Iraq Misled Weapons Monitors," *Associated Press*, 11 October 1995.

* ساڵی ١٩٨٩، عێراق ترشێنەری (fermenter)ی قەبارە ١٥٠ لیتری، کە لە ئەلموثەنناوە گوازرابووەوە بۆ سەلمان پاک، بۆ بەرهەمهێنانی بەکتریای Bacillus subtilis بەکار دێنێت.[١]

* ساڵی ١٩٨٩، تویژینەوە لەسەر بەکتریای کلۆستریدیوم پێرفیرینجنز دەگوازرێتەوە بۆ ئەلحەکەم.[٢]

* ساڵی ١٩٨٩، بەرهەمهێنانی ئەفلاتۆکسین بۆ مەبەستەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان، گوازرایەوە بۆ دەزگایەک لە فوزەیلییە. ئەم دەزگایە لە نیسان – ئایاری ١٩٩٠ تاکو دیسەمبەری هەمان ساڵ، بۆ ئامادەکردنی ئەفلاتۆکسین لە ڕێی کەموڵەوە (flask) بەکار دەهێنرا. عێراق ڕای گەیاند کە نزیکەی ١٨٥٠ لیتر گیراوەی ئەم تۆکسینەی لە فوزەیلییە ئامادە کردووە.[٣]

* ساڵی ١٩٨٩، عێراق چەندین پرژەوشکەرەوەی پێوانەیی (کە گیراوەی خەستی بەکتریاکان دەکات بە هاڕاوە) لە کۆمپانیای Niro Atomiser لە دانیمارک کڕی. دواتر عێراق دان بەوەدا دەنێت کە یەکێک لە پرژەوشکەرەوەکانی لە ساڵی ١٩٩٢دا لە ئەلحەکەم دامەزراندووە. پرژەوشکەرەوەکەی تر لە عەمبارێک لە شارۆچکەیەکی باکووری عێراق دۆزرایەوە.[٤]

---

[1] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[2] Anthony H. Cordesman, "Iraq's Past and Future Biological Weapons Capabilities," *CSIS Middle East Dynamic Net Assessment*, 17 February 1998, p. 7.

[3] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[4] Al J. Venter, "New–Era Threat: Iraq's Biological Weapons," *Middle East Policy*, Vol. 6, No. 4, 4 June 1999, p. 111

* ساڵی ۱۹۸۹، عێراق دەست بە بەرهەمهێنانی بڕێکی زۆری بەکتریای پیسەکوان دەکات لە کارگەی ئەلحەکەم بۆ بەرهەمهێنانی پرۆتینی یەکخانەیی.[1]

* ساڵی ۱۹۸۹، عێراق دەست دەکات بە بەرهەمهێنانی ئەفلاتۆکسین لە سەلمان پاک. لە کۆتاییدا، ۲۲۰۰ لیتر لە گیراوەی ئەفلاتۆکسین دروست دەکات.[2]

* ساڵی ۱۹۸۹، دامەزراوەی گشتیی عێراق بۆ بەرهەمهێنانی مێرووکووژەکان، هەندێک ترشێنەری مایکرۆبایۆلۆجی و چەند ناوەندێکی شلی چاندن لە کۆمپانیایەکی هامبورگ بە ناوی Water Engineering Trading دەکڕێت.[3]

* ساڵی ۱۹۸۹، ئەنجامەکانی ئەو توێژینەوانەی لە سەلمان پاک بە دەست هێنرابوون، لە کارگەی ئەلحەکەم بۆ بەرهەمهێنانی پرۆتینی یەکخانەیی، بەکار دەهێنرێن بۆ بەرهەمهێنانی بڕێکی زۆری بەکتریای پیسەکوان.

* ساڵی ۱۹۸۹، لە سەلمان پاک ۱۰ لیتر لە گیراوەی خەستی ڕایسین بەرهەم هێنرابوو.[4]

* لە دەوروبەری ئازاری ۱۹۸۹دا، عێراق دەست دەکات بە بەرهەمهێنانی بەکتریای پیسەکوان لە سەلمان پاک.

* لە نیسانی ۱۹۸۹دا، عێراق دەست دەکات بە بەرهەمهێنانی تۆکسینی بۆتولینوم لەسەر ئاستی پیشەسازی لە ئەلحەکەم، بە مەبەستی کردنی بە چەکی بایۆلۆجی.

---

[1] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past As Future?" *Journal of the American Medical Association (JAMA)*, Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, p. 419

[2] Raymond A. Zilinskas, pp.418–424

[3] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today,* Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 240.

[4] Raymond A. Zilinskas, pp.418–424

* له ئایاری ١٩٨٩دا، عێراق دەست دەکات بە بەرهەمهێنانی بەکتریای پیسەکوان بە مەبەستی کردنی بە چەکی بایۆلۆجی.[١]

* لە ئابی ١٩٨٩دا، کارکردن لەسەر بەکتریای کلۆستریدیوم پێرفرینجز لە سەلمان پاکەوە دەگوازرێتەوە بۆ ئەلحەکەم.[٢]

* لە سێپتەمبەری ١٩٨٩دا، عێراق لە جورف ئەلسەخەر لە هەوای کراوەدا تاقیکردنەوە لەسەر بەکارهێنان و تەقاندنی گوللەتۆپی ١٥٥ میللیمەتریی پڕکراو لە تۆکسینی ڕایسین دەکات.[٣]

* لە نۆڤەمبەر و دیسەمبەری ١٩٨٨دا، عێراق چەندین تاقیکردنەوەی مەیدانیی جێگیر و جوولاو، بە بەکارهێنانی لاساییکراوەی بەکتریای پیسەکوان و تۆکسینی بۆتولینوم و ئەفلاتۆکسین کە لە ناو چەندین مووشەکی سەقەر-١٨ و بۆمبی R400ی دانابوون، لە مەحمودییە دەکات.[٤]

* لە سالآنی ١٩٨٩-١٩٩٠دا، عێراق بە نەتەوە یەکگرتووەکان ڕادەگەیەنێت کە تۆکسینی بۆتولینومی لەسەر ئاستی پیشەسازی بەرهەم هێناوە، ٢٠٠٠٠ لیتر لە گیراوەیەک کە تۆکسینی بۆتولینومی تێدایە، لە ئەلحەکەم و ئەلمەنال دروست کراوە. ١٢٠٠٠ لیتری بۆ پڕکردنی کلاوەی مووشەکانی یان بۆ تاقیکردنەوە بەکار هێناوە و ئەو ٨٠٠٠ لیترەی ماوەتەوە، لە ئەلحەکەم هەڵگیراوە.[٥]

---

[1] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[2] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

[3] U.S. Intelligence Community, *Intelligence Related to Possible Sources of Biological Agent Exposure During the Persian Gulf War*, August 2000, www.gulflink.osd.mil

[4] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu

[5] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C.

* ساڵی ١٩٩٠، عێراق دەست دەکات بە توێژینەوە لەسەر ڤایرۆس و ئەندازەی بۆماوەیی.[1]

* ساڵی ١٩٩٠، عێراق، ٢٠٠ بۆمبی بایۆلۆجیی R400 دروست دەکات. ١٠٠ بۆمبیان پڕ دەکات لە تۆکسینی بۆتولینوم و ٥٠ بۆمبیان بە بەکتریای پیسەکوان و ٧ بۆمبیشیان بە ئەفلاتۆکسین.

* ساڵی ١٩٩٠، عێراق دەستکاریی فڕۆکەی میگی-٢١ دەکات و دەیکات بە فڕۆکەی بێفڕۆکەوان، تانکییەکی ٢٢٠٠ لیتریی لە ناودا دادەنێت و ئامێری پرژاندنی پێوە دەکات.

* ساڵی ١٩٩٠، عێراق ١٠٠ مووشەکی ئەلحوسەین دەگوازێتەوە بۆ دامەزراوەی گشتیی ئەلموثەننا. ٢٥ لەو مووشەکانە کڵاوەی بایۆلۆجییان پێوە بوو. لەو ٢٥ کڵاوەیە، ١٣ کڵاوەیان پڕ کرابوون لە تۆکسینی بۆتولینوم، ١٠ کڵاوەیان بە ئەفلاتۆکسین و ٢ کڵاوەیان بە بەکتریای پیسەکوان. وەک دەڵێن، هەموو ئەو مووشەکانە لە چەند شوێنێک بڵاو کرابوونەوە: ١٠ مووشەکیان لە ناو تونێلێکی قووڵی ڕێگەی ئاسنی شەمەندەفەر و ١٥ مووشەکیشیان لە ناو چەند چاڵێکی قووڵ بە درێژایی ڕووباری دیجلە دانرابوون.[2]

* ساڵی ١٩٩٠، ٣٤٠ لیتر لە بەکتریای کلۆستریدیۆم پێرفرینجز لە ئەلحەکەم بەرهەم هێنرابوو.

* ساڵی ١٩٩٠، زانا عێراقییەکان توێژینەوە لەسەر توانای هەندێک کەڕووی دیاریکراو دەکەن بۆ بەرهەمهێنانی هەندێک کەڕووەتۆکسینەکانی ترایکۆسیثین. ئەو زانایانە دەڵێن ٢٠ میللیلیتر لە گیراوەیەک کە کەڕووەتۆکسینەکانی ترایکۆسیثینی تێدا بووە، بەرهەم

---

[1] Christian Seelos, "Lessons from Iraq on Bioweapons," *Nature*, Issue 398, 18 March 1999, p. 188.

[2] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past As Future?" *Journal of the American Medical Association (JAMA)*, Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, p. 420.

هێنـاوە. هەنـدێک لەو کەڕووەتۆکسـینانەیان لەسـەر ئـاژەڵ تـاقی کردووەتەوە.

* سـاڵی ١٩٩٠، بە گـوتەی عێراقییەکـان، ئەو دانەوێـڵانەی کە تووشی خەڵووزەی گەنم بووبوون، لە فوزەیلییە سووتاندوویانن.

* ساڵی ١٩٩٠، عێـراق سـەرجەم ٢٠٠ بـۆمبی بـایۆلۆجیی R400 (٤٠٠ پاوەندی)ی بەرهەم هێناوە. لە دوو شوێن دای نـابوون و ئامادە کرابوون بۆ ئەوەی دەستبەجێ بەکار بهێنرێن. ١٠٠ لەو بۆمبانە پڕ کرابوون لە تۆکسینی بۆتولینوم، پەنجایان بە بەکتریای پیسەکوان و ٧ بۆمبیان ئەفلاتۆکسین. هەندێکی کەم لە گوللەتۆپی ١٥٥ ملیمەتری پڕ کرابوون لە ڕایسین و بۆ تاقیکردنەوەی مەیدانی تەرخان کرابوون.

* سـاڵی ١٩٩٠، دامەزراوەی گشـتیی ئەلموثەننـا ١٠٠ مووشـەکی ئەلحوسـەین وەردەگرێـت. هەنـدێک لەو مووشـەکە مەودا ٣٠٠ کیلۆمەترییـانە، مەوداکەیـان کرابـوو بە دوو ئەوەنـدە، ئەوەش مانـای ئەوە بوو کە توانای هەڵگرتنی تەقەمەنـی و هۆکاری بایۆلۆجییان کەم ببووەوە (توانـای بنەڕەتییـان یەک تەن بـوو). ٢٥ لەو ١٠٠ مووشـەکە کـڵاوەی بایۆلۆجییـان پێـوە کرابـوو: کـڵاوەی ١٣ مووشـەکیان بە تۆکسـینی بۆتولینـوم پـڕ کرابـوو، ١٠ کڵاوەیـان بە ئەفلاتۆکسـین و ٢ کڵاوەیان بە بەکتریای پیسەکوان. ئەو ٢٥ مووشەکە لە چەند شـوێنێک بـڵاو کرابـوونەوە. ١٠ لەو مووشـەکانە لە تـونێلێکی ڕێگـەی ئاسـن دانرابـوون و ١٥ مووشەکیشـیان بە درێژایـی ڕووبـاری دیجـلە دانرابوون.[1]

* سـاڵی ١٩٩٠، پـرۆژەی ١٤٤ (ئەم پـرۆژەیە یەکەیەکـی بەرپـرس بـوو لە بەرهەمهێنـانی مووشـەکی ئەلحوسـەین) داوای لـێ کـرا کە

---

[1]Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past as Future?" *The Journal of the American Medical Association,* Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, pp. 418–424.

کڵاوەی "جووڵەوزە" و "کڵاوەی تایبەت" دروست بکات، کە بتوانن هۆکاری کیمیایی و بایۆلۆجی هەڵبگرن و بڵاوی بکەنەوە و بیرشێنن.[1]

* لە سەرەتا – ناوەڕاستی ١٩٩٠دا، بەرنامەیەکی خێرا بە فەرمانی حوسەین کامیل بۆ پرۆژەی ١٤٤ دانرا، بۆ دروستکردنی ٧٥ کڵاوەی کیمیایی و بایۆلۆجی.[2]

* لە سەرەتایساڵی ١٩٩٠دا، لە سەنتەری نەخۆشیی تەبەقی سەر بە دامەزراوەی ئەلمەنال، توێژینەوە لەسەر ٥ ڤایرۆس کرا، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا وەک چەکی بایۆلۆجی بەکار بهێنرێن. پێنج ڤایرۆسەکە ئەمانە بوون: ڤایرۆسی خوێنبەربوونی کۆنگۆ – قەرەم، ڤایرۆسی زەردەتا، ڕیخۆڵەڤایرۆسی ١٧، ڕۆتاڤایرۆسی مرۆڤ و ڤایرۆسی ئاوڵەی وشتر.[3]

* لە بەهاری ساڵی ١٩٩٠دا، عێراق ٤٠ ئامێری پرژەدروستکەری زۆر بەتوانای بە دەست هێنابوو. ئەم ئامێرە پرژەدروستکەرانە توانای ئەوەیان هەبوو لە خولەکێکدا ٥٠ لیتر مادەی شل یان ڕەق بڵاو بکەنەوە.[4]

* لە ئازاری ١٩٩٠دا، عێراق بە سەرپەرشتیی عەلی نووری عەبدولحوسەین دەست دەکات بە بەرنامەی ئەندازەی بۆماوەیی.[5]

---

[1] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000).

[2] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker,pp. 47–78.

[3] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past as Future?" *The Journal of the American Medical Association,* Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, pp. 418–424.

[4] "Iraqi Biological Warfare Developments", October 1990, www.gulflink.osd.mil.

[5] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.

* له ١ی نیسانی ١٩٩٠دا، سەددام حوسەین له وتەیەکیدا بۆ شاندێکی سیناتۆری ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، دووباره جەخت لەوە دەکاتەوە که ئەگەر ئیسرائیل به چەکی ناوکی هێرش بکاته سەر عێراق، ئەوا عێراق له وەڵامی ئەم هێرشەدا چەکێکی کیمیایی دوانی بەکار دەهێنێت. له کاتێکدا ئەم وتەیەی سەددام حوسەین هیچ ئاماژەیەکی ڕاستەخۆی بۆ چەکه بایۆلۆجییەکان تێدا نەبوو، له ڕاستیدا سەددام نکۆڵیی لەوە دەکرد که عێراق به شوێن چەکه بایۆلۆجییەکاندا بگەڕێت، ئەو جەختی له مافی عێراق دەکردەوە بۆ بەدەستهێنانی هەر چەکێک که له جبەخانەی ئیسرائیلیدا هەبێت.

* له ١٨ی نیسانی ١٩٩٠دا، سەددام حوسەین لەو وتەیەکیدا له بەردەم فەرماندارییه گشتییەکەی و ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشدا دەڵێت، "ئەگەر هەر لایەنێک... هێرش بکاته سەر هەر لایەنێکی عەرەبی و ئەو لایەنه عەرەبییه یارمەتیی ئێمه قبووڵ بکات، ئەوا به باشترین ئەو چەکانەی هەمانن، وەڵامی دەستدرێژیکەر دەدەینەوە.... ئەگەر توانیمان به هەموو مووشەک و بۆمبا و تواناکانمان له دەستدرێژیکەرەکه بدەین، ئەوا پاشان [بەم چەکانەش] لێی دەدەین.[1]

* له ئایاری ١٩٩٠دا، عێراق به سەرکەوتوویی هەڵدانی چەند مووشەکێکی ١٢٢ میللیمەتریی و تەقاندنی چەند بۆمبی هەوایی که پڕ کرابوون له هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی، تاقی دەکاتەوە.[2]

---

[1] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), pp. 47–78.

[2] UNSCOM Eighth Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715, 1991, S/1995/864, 11 October 1995, http://cns.miis.edu.

* لە تەمووزی ۱۹۹۰دا، دکتۆر حازم عەلی کە ڤایرۆسناسێک بوو، دەست دەکات بە توێژینەوە لەسەر ڤایرۆس بۆ مەبەستەکانی چەکی بایۆلۆجی.[1]

* لە ئاب تا ئۆکتۆبەری ۱۹۹۰، دوای داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە، بەرهەمهێنانی بەچەککردنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان لەسەر ئاستێکی بەرفراوان دەست پێ دەکات. لەم ماوەیەدا عێراق بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەمانەی بەرهەم هێناوە: ۱۹۰۰۰ لیتر لە گیراوەی خەستی تۆکسینی بۆتولینوم، ۸۵۰۰ لیتر لە تێکەڵێکی شل و خەستی (۱۰۱۰ سپۆر لە یەک میللیلیتردا) سپۆرەکانی بەکتریای پیسەکوان و ۲۲۰۰ لیتر گیراوەی خەستی ئەفلاتۆکسین.[2]

* لە ئابی ۱۹۹۰دا، دوای ئەوەی عێراق کوێت داگیر دەکات، بەرنامەیەکی چڕوپڕ دەست پێ دەکات بۆ خێراکردنی پەرەپێدانی چەکە بایۆلۆجییەکان. بەرنامەکە توێژینەوە لە ڤایرۆسناسی و ئەندازەی بۆماوەیی لە خۆ دەگرێت. عێراق چەقی بایەخدانەکەی دەگۆڕێت بۆ بەرهەمهێنان، دواتر بۆ بەچەککردنی هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی. کارگەی نەخۆشیی تەبەقی گۆڕیبوو بۆ بەرهەمهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکان.

* لە ئابی ۱۹۹۰دا، عێراق دەست بە بەرهەمهێنانی بەکتریای کلۆستریدیۆم پێرفرینجز دەکات کە هۆکارێکی بایۆلۆجییە و دەبێتە هۆی نەخۆشیی گازەگانگرین. مەبەستی عێراق لە بەرهەمهێنانی ئەم هۆکاری بایۆلۆجییە، بۆ بەکارهێنانی بووە وەک چەکێکی بایۆلۆجی. عێراق بۆ بەرهەمهێنانی ئەم هۆکارە، ترشێنەرێکی ۱۵۰ لیتریی لە

---

[1] *Full, Final and Complete Disclosure of Iraq's Past Biological Programme*, September 1997; UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C.

[2] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), pp. 47–78.

ئەلـحەکەم بەکـار دەهێنـا کە لە سـەلمان پـاکەوە گواسـتبوویەوە بـۆ ئەوێ.[1]

* لە سێپتەمبەری ١٩٩٠دا، عێراق دەست دەکات بە بەرهەمهێنانی بەکتریای پیسەکوان لەسەر ئاستی پیشەسازی لە کارگەی ئەلحەکەم.

* لە سـێپتەمبەری ١٩٩٠دا، مووشـەکەکانی جـۆری R400 لە ئەلمەحمـودییە تـاقی کـرانەوە. ئەگەری ئەوەیە هەیە کە ئەو تاقیکردنەوانە، بە بەکارهێنانی ئەو چەکانەی لەوێ بڵاو کراوبوونەوە، ئەنجام درابن.

* لە سێپتەمبەری ١٩٩٠دا، دەزگای ئەلمەنال لە دۆرە دامەزرێنرا، بۆ ئەوەی تۆکسینی بۆتولینوم بۆ چەک بەرهەم بهێنێت. وێڕای ئەوە، سپۆرەکانی بەکتریای پیسەکوانیش لە ئەلمەنال بەرهەم دەهێنران.[2]

* لە کۆتـایی سـێپتەمبەر – نـۆڤەمبەری ١٩٩٠دا، بەڕێـوەبەری پـرۆژەی ١٤٤، کـڵاوەی تـایبەت کە دروسـت کرابـوون بـۆ هەڵگرتنـی هۆکـاری کیمیـایی و بـایۆلۆجی و بڵاوکردنەوەیـان، دەگـوازێتەوە بـۆ دامەزراوەی گشـتیی ئەلموثەننـا، کە دەزگـایەکی عێراقیـی سـەرەکیی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی بوو. بەڕێوەبەرەکە لەو بڕوایەدا دەبێت کە هەموو ئەو کڵاوە تایبەتییانە تەرخـان کراون بـۆ ئەوەی پڕ بکرێن لە هۆکـاری کیمیـایی. بە هـۆی کۆتـا خێرایـی ئەم جـۆرە مووشـەکە بالیسـتییانە، دروسـتکردنی ئامێرێک بـۆ بەرەڵاکردن و بڵاوکـردنەوەی هۆکـارە کیمیـایی یـان بایۆلۆجییەکـان کـارێکی زۆر قـورس دەبێت. لە هەوڵێک بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنـانی ئـامێری داگیرسـانی بۆمـب، عێـراق بەرنـامەیەکی بەکارهێنـانی پەرەشـووتی دەسـت پـێ کـرد بـۆ کەمکـردنەوەی خێرایـی کڵاوەکـان، بـۆ ئەوەی ئەم کـڵاوانە باشـتر ئەو

---

[1] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http:/cns.miis.edu.

[2] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C.

هۆکارە کیمیاییە یان بایۆلۆجییەی هەڵیان گرتووە، بڵاو بکەنەوە، پێش ئەوەی بەر ئامانجەکە بکەون.[1]

* لە نـــۆڤەمبەری ۱۹۹۰دا، عێـــراق ڕای دەگەیـــەنێت کە ئەو ۱۰ لیتـرەی ڕایسـین کە بەرهەمـی هێنـاوە، لە تـاقیکردنەوەیەکی مەیدانیـدا بەکـاری هێنـاوە و لە تـاقیکردنەوەی گوللەتـۆپی ۱۵۵ میللیمەتریـدا بەکاری هێناوە.

* لە نۆڤەمبەری ۱۹۹۰دا، عێراق تـانکییەکی بەردانەوە دەسـتکاری دەکـات، بـۆ ئەوەی نمـوونەیەکی سـەرەتایی لە تـانکیی بەردانەوەی میـراج ئێـف-۱ دروسـت بکـات و زنجیـرەیەک تـاقیکردنەوەی لەسـەر دەکات.[2]

* لە کۆتـایی ۱۹۹۰دا، عێـراق دەسـت بە بەرنـامەیەکی چڕوپڕ بـۆ کۆکردنەوەی بەری ڕووەکی گەرچەک دەکات، بۆ ئەوەی لە بەری ئەم ڕووەکە بڕێکی زۆر ڕایسین دەربهێنێت.[3]

* لە دیسـەمبەری ۱۹۹۰دا، عێـراق ئـامێرێکی تـری بڵاوکـردنەوەی چەکی بـایۆلۆجی دروسـت دەکـات، ئەوەیش لە ڕێی دەسـتکاریکردنی تـــانکییەکی بەردانەوەی فـــڕۆکەی میراجـــی ئێـــف-۱ و کردنـــی بە تانکییەکی ڕشاندنی چەکی بـایۆلۆجی. دەتـوانرا بە تـانکییەکە تـا ۲۰۰۰ لیتـر لە بەکتریـای پیسـەکوان بە شـێوەی پـڕژە بـڵاو بکـرێتەوە. بـۆ تاقیکردنـەوەی ئەم تـانکییە، لە دیسـەمبەری سـاڵی ۱۹۹۰دا لە بـنکەی فڕۆکەوانیـــی ئەبوعوبەیـــدە دوو تـــاقیکردنەوەی مەیـــدانی کـــران. تاقیکردنەوەیەکی تر لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۱ کرا. وەک

---

[1] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), pp. 47–78.

[2] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.

[3] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, p.54

دەڵێن، تاقیکردنەوەکان سەرکەوتوو نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا، سێ تانکیی بەردانەوەی تر گۆڕانکارییان بەسەردا هێنرابوو، هەڵگیرابوون و ئامادە کرابوون بۆ بەکارهێنانیان.

* لە دیسەمبەری ۱۹۹۰ و کانوونی یەکەمی ۱۹۹۱دا، عێراق لە دامەزراوەی ئەلموثەننا، لەسەر ئاستێکی بەرفراوان هۆکارە بایۆلۆجییەکان دەکات بە چەکی بایۆلۆجی.[1]

* لە سالآنی ۱۹۹۰-۱۹۹۱دا، دوانزە پەناگە دۆزرانەوە. ئەم پەناگانە لە ناو دەزگای سەلمان پاکدا بوون و ئامێری بەتاڵکردنەوەی هەورەتریشقە و ژوورۆچکەی هەوابەندیان تێدا بوو. ئەم پەناگانە لە ڕووی ژینگەییەوە کۆنترۆڵ کرابوون و یەکەکانی ساردکردنەوەیان تێدا بوو. چەندین پەناگە کە بە هەمان شێواز دروست کرابوون، لە ناوچەکانی دیکەی عێراق دۆزرانەوە و وا دادەنران کە پەناگەی هەڵگرتنی هۆکاری چەکی بایۆلۆجی و چەکی کیمیایی بن. چەندین لەو پەناگانە لە عەمبارەکانی هەڵگرتنی چەک و تەقەمەنی کە لە سەرانسەری بەغدا بوون، دۆزرانەوە.[2]

* لە کانوونی یەکەمی ۱۹۹۱دا، سەددام حوسەین فەرمان بە فەرماندە سەربازییەکان دەدات کە بە چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی هێرش بکەنە سەر سوپا و پایتەختەکانی دوژمن، ئەگەر بە چەکی ناوکی هێرش کرایە عێراق. هەروەها بڕیار درابوو کە چەکی کیمیایی یان بایۆلۆجی دژی سوپای هاوپەیمانان یان دانیشتوانی مەدەنی بەکار نەهێنرێت، ئەوەیش بە هۆی هەڕەشەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە "هەر بەکارهێنانێکی چەکی نائاسایی، دەبێتە هۆی هاندانی

---

[1] UNSCOM Eight Report Under Paragraph 8, Security Council Resolution 715 (1991), S/1995/864, 11 October 1995, http://www.cns.miis.edu

[2] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

وەڵامـدانەوەیەکی وێرانکەر." ئەمەش مانـای تـۆڵەکردنەوەی بە چەکـی ناوکی دەگەیاند.[1]

* ساڵانی ١٩٩١–١٩٩٥، عێراق بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە نکۆڵیی لە هەبوونی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجی دەکردەوە.[2]

* ســاڵی ١٩٩١، بە گــوتەی پشــکنەری نەتەوە یەکگرتووەکــان، ئەوەی پێــی دەوتــرا لیــژنەی بــاڵای تــایبەت، کە جێگــری ســەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران سـەرۆکی بوو، کۆ دەبێتەوە بۆ پلانـدانان بـۆ شــاردنەوەیەکی گەورەی چەکە نــاوکی و کیمیــایی و بــایۆلۆجی و مووشەکییەکانی عێراق.[3]

* ساڵی ١٩٩١، بەگوێرەی لێدوانەکانی عێراق، عێراق هەموو چەک، هۆکار و بەڵگەکانی لەناو بردووە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراوی نەخستە بەردەست پشکنەرانی نێودەوڵەتی.[4]

* لە کانوونی یەکەمی ١٩٩١دا، عێراق بۆمبەکانی جۆری R400 و کڵاوەکــانی ئەلحوســەین کە پــڕ کرابــوون لە هۆکارەکــانی جەنگــی بــایۆلۆجی، لە چــوار شــوێن بــڵاو دەکــاتەوە. ٢٠٠ بــۆمبی هەوایــی و نــزیکەی ٨٠ کــڵاوەی مووشــەکیی پڕکـراو لە بەکتریـای پیســەکوان لە نزیک تکریت دەشارێتەوە.[5]

* کــانوونی دووەمــی ١٩٩١، فەرمانــدایەتیی ســەربازیی عێــراق هەڕەشەی بەکارهێنانی "چەکێکی نهێنی" دەکات.

---

[1] Anthony Goodman, "Iraq Targeted "Enemy Capitals" if Baghdad is Nuked," *Reuters*, 21 September 1995.
[2] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C.
[3] —"The Inspector's Story," *CNN/Time Impact*, 1 March 1998.
[4] Christian Seelos, "Lessons from Iraq on Bioweapons," *Nature,* Issue 398, 18 March 1999, p. 188.
[5] Dany Shoham, "Iraq's Biological Warfare Agents: A Comprehensive Analysis," *Critical Review in Microbiology,* Vol. 26, No. 3, 2000, p. 182.

* له ٩ی کانوونی دووەمی ١٩٩١دا، وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، جەیمس بەیکەر، بە جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق دەڵێت، "ئەگەر هەر بەکارهێنانێکی [چەکێکی کیمیایی یان بایۆلۆجی] هەبێت، ئامانجەکانمان تەنها ڕزگارکردنی کوێت نابێت، بەڵکو لەناوبردنی ڕژێمی ئێستای عێراق دەبێت و هەر کەسێک بەرپرسیار بێت لە بەکارهێنانی ئەم چەکانە، لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت." (دووبارە جەخت لە قسەکانی دەکاتەوە).[1]

* له ١٠ی کانوونی دووەمی ١٩٩١دا، عێراق تاقیکردنەوەیەکی مەیدانی لە بنکەی ئەلرەشیدی هێزی ئاسمانی دەکات و فرۆکەیەکی جەنگیی جۆری میگ-٢١ی دەستکاریکراو کە لە دوورەوە بە کۆنترۆڵ ئاراستە دەکرێت، بەکار دەهێنێت. فرۆکەکە گیراوەیەکی ورپاکەرەوەی بایۆلۆجیی تێدا بووە و بەسەر ئامانجێکدا پرژاندوویەتی کە لە ناو بنکەی ئەلرەشیدی هێزی ئاسمانیدا بووە. ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوەیە تاکو ئێستاش نەزانراوە.[2]

* له ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٩١دا، چەند تاقیکردنەوەیەک لەسەر تانکیی پرژاندنی میراج بۆ پرژاندنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان کران. ئەم تاقیکردنەوانە لە کاتێکی درەنگدا کران.[3]

* له ٢٢-٢٣ی کانوونی دووەمی ١٩٩١، عێراق کەلوپەل لە دامەزراوەی ئەلحەکەمەوە دەگوازێتەوە بۆ خوێندنگەی ئەلئەسما.

---

[1] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), pp. 47–78.

[2] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past As Future?" *Journal of the American Medical Association (JAMA)* Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, p. 420.

[3] —"Anthony Cordesman, "Iraq's Search for Weapons of Mass Destruction", *The Military Balance in the Middle East*, Part XIV, Center for Strategic and International Studies, 6 September, 1999, pp. 50–60.

عێــراق ڕای دەگەیەنێــت کە هەنــدێک ناوەنــدی گەشــەکردن لەو گواستنەوەیەدا ون بووە.[1]

* لە مانگی ئازاری ١٩٩١دا، بە گوتەی حوسەین شارستانی، کە زانایەکی ناوکیی عێراقی بوو، عێراق ئەفلاتۆکسینی بەکار هێناوە بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕین لە کەربەلا.[2]

* لە ٣ی نیســـانی ١٩٩١دا، ئەنجـــوومەنی ئاسایشـــی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ٦٨٧ دەردەکات و داوا لە عێراق دەکات، بەبێ هیچ مەرجێک، هەموو چەکە نائاساییەکانی لەناو ببات و هەروەها عێراق بەڵێن بدات ئەو جۆرە چەکانە نە بەکار بهێنێت و نە پەرەیان پێ بدات و نە دروستیان بکات یان بە دەستیان بهێنێت. لیژنەیەکی تــایبەت پێــک هێنــرا، لیــژنەی تــایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکــان، بــۆ لێکهەڵوەشــاندنەوەی چەکە کۆکوژەکانی عێراق. بێگومان ئەم بڕیارە دوای کۆتاییهاتنی گەردەلوولی بیابان دەرچوو.[3]

* لە ٦ی نیسانی ١٩٩١دا، عێراق بڕیاری ٦٨٧ قبووڵ دەکات.[4]

* لە ١٨ی نیســانی ١٩٩١دا، عێــراق پەیماننــامەی قەدەغەکردنــی چەکە بایۆلۆجییەکان پەسەند دەکات. یەکەم ڕاگەیاندننامە، بەگوێرەی بڕیــاری ٦٨٧، پێشــکەش بە لیــژنەی تــایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکــان دەکات و ڕای دەگەیەنێت کە بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی نییە.[5]

---

[1] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.

[2] *Al–Sharq al–Awsat*, 19 March 2001, p.3; in "Iraqi Scientist on Iraq's Use of Poison Gases, Chemical Weapons," FBIS Document GMP20010319000087, 19 March 2001.

[3] U.N. Resolution 687.

[4] UNSCOM: Chronology of Main Events, December 1999, www.un.org.

[5] UNSCOM: Chronology of Main Events, December 1999, www.un.org.

## ٧-٢ لەناوبردنی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق

دوای ئەوەی عێراق لە جەنگی یەکەمی کەنداودا شکست دێنێت، لە ٦ی نیسانی ١٩٩١دا بڕیاری ٦٨٧ قبووڵ دەکات کە دەبێت بەبێ هیچ مەرجێک هەموو چەکە نائاساییەکانی لەناو ببات و بەڵێن بدات ئەو جۆرە چەکانە نە بەکار بهێنێت و پەرەیان پێ بدات، نە دروستیان بکات یان بە دەستیان بهێنێت. هەروەها دوای ئەوەش، عێراق لە ١٨ی نیسانی ١٩٩١ پەیماننامەی قەدەغەکردنی چەکە بایۆلۆجییەکان پەسەند دەکات. کاری لیژنە تایبەتییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی لەناوبردنی چەکە کۆکوژەکانی عێراق دەست پێ دەکات. بێگومان عێراق فڕوفێڵی زۆری بەکار هێنا بۆ شاردنەوەی چەکە کۆکوژەکانی لە لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەو هیوایەی هەندێک لەو چەکە بایۆلۆجییانە و ئامێر و کەلوپەلەکانیان هەڵبگرێت و لە داهاتوودا بەکاریان بهێنێتەوە. نەتەوە یەکگرتووەکان چەندین لیژنەی پشکنین و چاودێری و ڕوومالّی پێک هێنا بۆ گەڕان بەدوای چەکە بایۆلۆجی و ئامێر و کەلوپەلەکانی تایبەت بەو چەکە بایۆلۆجییانە و لەناوبردنیان. لە کۆتاییدا، ڕژێمی سەددام لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هێزەکانی هاوپەیمانانەوە ڕووخێنرا و گەلی عێراقیان لە ڕژێمێکی دیکتاتۆری ئەوپەڕی دڕندە ڕزگار کرد. لە خوارەوە، کرۆنۆلۆجیای لەناوبردنی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق دەخەینە ڕوو:

* لە نیسانی ١٩٩١دا، دوای گەیشتن بە ڕێککەوتنەکانی ڕاوەستاندنی شەڕ، وەک دەڵێن، ١١ کارمەندی تاقمی بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکان فەرمانیان پێ دەکرێت چەکە بایۆلۆجییەکان لەناو ببەن.

* سالّی ١٩٩١، وەک دەوترێت، کەرەستەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان، بەگوێرەی ڕێککەوتنەکانی وەستاندنی شەڕ، لەناو بران. عێراق کڵاوەی مووشەکانی کردبووەوە، فۆرماڵدیهاید و پەرمەنگەناتی پۆتاسیۆمی لە ناو گیراوەی ناو کڵاوەی مووشەکەکان

کردبـوو. کەرەسـتە و کڵاوەکـانی مووشـەکەکانی بە بڵـدۆزەر تەخـت کردبوو، ئینجا سـوتاندبوونی و دواتر بە تەقاندنەوەی بۆمبی ئاسـایی لە نێـو پاشـماوەکانی کڵاوەکانـدا، شـوێنبزری کردبـوون. وەک دەڵـێن، هەندێک لەو کەرەستە بایۆلۆجییانەی بۆ تاقیکردنەوە بەکار دەهێنران، بەبێ ئەوەی تێک بشکێنرێن، فڕێ درابوونە ناو ڕووباری دیجلەوە.[1]

* لە ١٨ی نیسـانی ١٩٩١دا، عێـراق پەیماننـامەی قەدەغەکردنـی چەکە بایۆلۆجییەکـان پەسـەند دەکـات و بەپێـی بڕیـاری ٦٨٧، یەکەم ڕاگەیانـدننامە پێشـکەش بە لایەنـی پەیوەندیـدار دەکـات و ڕای دەگەیەنێت کە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی نییە.[2]

* لە ئایـار یـان حـوزەیرانی ١٩٩١دا، بە گـوتەی عێراق، بە نهێنـی هەموو چەکە بایۆلۆجییەکان و کەرەستەکانیان و بەڵگەنامەکانی لەنـاو بـردووە، بەڵام هـیچ بەڵگەیەکـی بـاوەڕپێکراو پێشـکەش بە لیژنەکـانی نەتەوە یەکگرتووەکان ناکات بۆ ئەوەی ڕاستیی قسەکانی بسەلمێنێت.[3]

* لە ئایـاری ١٩٩١دا، بە گـوتەی عێـراق، خوێندنگـەی ئەلئەسـما شکێنراوە و هەندێک ناوەندی گەشەکردنی بەکتریا دزراون.[4]

* لە حـوزەیرانی ١٩٩١دا، عێـراق دەڵێـت بڕێکـی زۆری هۆکـارە بایۆلۆجییەکـانی لەنـاو بـردووە. بە گـوتەی لیـژنەی تـایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکـان، عێـراق هـیچ بەڵگەیەکـی مـادی یـان بەڵگەنـامەی دەربارەی لەناوبردنیان پیشان نەداوە.[5]

* لە حوزەیرانی ١٩٩١دا، بە گوتەی عێراق، پێش گەیشتنی یەکەم تیمـی پشـکنینی چەکـی بـایۆلۆجیی سـەر بە لیـژنەی تـایبەتی نەتەوە

[1] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past as Future?" *The Journal of the American Medical Association,* Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, pp. 418–424.
[2] UNSCOM: Chronology of Main Events, December 1999, www.un.org.
[3] Christian Seelos, "Lessons from Iraq on Bioweapons," *Nature,* Vol. 398, 18 March 199, p. 188.
[4] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.
[5] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C.

یەکگرتووەکـــان، ئەو ناوەنـــدی گەشـــەکردنەی کە لە دامەزراوەی ئەلحەکەم مابووەوە، گواستوویەتەوە بۆ کۆمپانیای گشتیی دەرمان و بەبـازارکردنی پێداویستییە پزیشکییەکان (ئەم کۆمپانیـایە بە کیمادیـا ناسراوە) کە سەر بە وەزارەتی تەندروستییە. ڕۆڵی کیمادیا بۆ ئەوە بـوو کە چیرۆکێک بـۆ دیارنەمـانی ناوەنـدی گەشـەکردنەکە دروسـت بکات کە لە بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیدا بەکار هێنرابوو.

* لە تەمـووزی ۱۹۹۱دا، عێـراق بـڵاوی کـردەوە کە ئەو چەکـانەی هۆکـاری بایۆلۆجییـان هەڵگرتبـوو، لەنـاوی بـردوون (تێبینـی: لیـژنەی تـایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکـان توانیی جەخـت لە لەنـاوبردنی هەندێک گوللەتۆپی R400 و کڵاوەی مووشەک بکاتەوە، بەڵام نەیتوانی جەخت لە ڕاستیی ژمارەی هەموو ئەوانەی لەناو براون، بکاتەوە).[1]

* لە تەمووزی ۱۹۹۱دا، بە گوتەی عێراق، بە شێوەیەکی تاکلایەنە، لە هەنـدێک شـوێنی دیـاریکراو لە بیابـانی ئەلنیبـای (al–Nibai)، ۲۵ کڵاوەی چەکی بایۆلۆجیی لەناو بردووە.

* لە ۲–۷ی ئابی ۱۹۹۱دا، یەکەم تیمی پشکنینی بایۆلۆجیی لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەگاتە سەلمان پاک. پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێن لە سەلمان پاک توانای توێژینەوە، بەرهەمهێنـان، تـاقیکردنەوە و ئەمبـارکردنی هۆکارەکـانی جەنگـی بایۆلۆجیمـان بینـی، بەڵام هـیچ بەڵگەیەکمـان سـەبارەت بە بـوونی چەکـی بـایۆلۆجی یـان دەزگای پڕکردنی چەک لە هۆکاری بایۆلۆجی نەبینی.[2]

---

[1] Ibid.

[2] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons: The Past As Future?" *Journal of the American Medical Association*, Vol. 278, No. 5, 6 August 1997, p. 420

* له ٢ی ئـابی ١٩٩١دا، عێـراق به تیمـی پشـكنین ڕادەگەیەنێـت چـالاكیگەلێكی تـوێژینەوەی بـایۆلۆجیی بـۆ مەبەسـتی بەرگریـی سەربازی كردووە.[١]

* له ٢ی ئـابی ١٩٩١دا، پشـكنەرانی لیـژنەی تـایبەتی نەتەوە یەكگرتووەكان دەگەنە سەلمان پاك، بۆ دۆزینەوەی ئەوەی كە چەند ڕۆژێك پێشتر، بەشێك له دامەزراوەی سەلمان پاك تەقێنراوەتەوە و به گڵ داپۆشراوە.[٢]

* له سـێپتەمبەری ١٩٩١دا، یەكەم پشـكنین له دامەزراوەی ئەلحەكەم دەكرێت.

* له ٢٠ی سـێپتەمبەر – ٣ی ئۆكتـۆبەری ١٩٩١دا، پشـكنەرانی بایۆلۆجیی نەتەوە یەكگرتووەكان هیچ چەكێكی بایۆلۆجی یان دەزگای پڕكردنی چەك له هۆكاری بایۆلۆجی نادۆزنەوە. پشكنەرەكان هەندێك شـوێن دیـاری دەكەن بـۆ ئەوەی له داهـاتوودا بخـرێنە ژێـر چـاودێرییەوە. دەزگـای ئەلـحەكەم بـۆ یەكەم جـار دەپشـكنرێت. پشـكنەرەكان، به قسـەی عێـراق، ڕازی دەبـن كە كـاری دەزگـای ئەلحەكەم كاری زیانبەخش نییە.[٣]

* له ٢٥ی ئۆكتـۆبەری ١٩٩١دا، لیـژنەی تـایبەتی نەتەوە یەكگرتووەكـان (UNSCOM) ڕاپۆرتێـك پێشـكەش به نەتەوە یەكگرتووەكان دەكات، باسی ئەنجامەكانی پشكنینی لیژنەكەیان تا ئەو كاتە دەكات. ڕاپۆرتەكە دەڵێت: "بەڵگەی بڕواپێكراو كۆ كراونەتەوە كە عێراق سەرگەرمی بەرنامەیەكی توێژینەوەی بـایۆلۆجیی سەربازیی پێشـكەوتوو بـووە. هـیچ بەڵـگەیەك لەسـەر بەچەككردنـی ڕاسـتەقینە

---

[1] UNSCOM: Chronology of Main Events, December 1999, www.un.org.

[2] Raymond A. Zilinskas, "Iraq's Biological Weapons, pp. 418–424.

[3] Christian Seelos, "Lessons from Iraq on Bioweapons," *Nature,* Vol. 398, 18 March 1999, p. 187

نەدۆزراوەتەوە، بەڵام پشکنینەکان بانکێکی زانیاریی باشیان پێکەوە نابوو بۆ چاودێریکردنی ئاییندەی توانا بایۆلۆجییەکانی عێراق.[1]

* لە ١٨ی نـــــۆڤەمبەر – ١ی دیسـێـــــەمبەری ١٩٩١دا، نەتەوە یەکگرتووەکان سێیەم پشکنینی بایۆلۆجی دەکات. پشکنینەکان بە شێوەیەکی لەناکاو دەکرێن. بەڵام هیچ بەڵگەیەک نادۆزنەوە کە دەزگاکان بۆ مەبەستی چەکە بایۆلۆجییەکان بەکار هێنرابن.[2]

* سالّی ١٩٩٢، بە گوتەی عێراق، ئامێرێکی پرژەوشکەرەوەی لە دانیمارک کڕیوە و لە دامەزراوەی ئەلحەکەم دای مەزراندووە، وەک خۆی دەڵێت، بۆ بەکارهێنانی بێمەترسییانە بووە.[3]

* لە ئایاری ١٩٩٢دا، عێراق یەکەم ڕاپۆرتی 'دوورودرێژ و کۆتایی و تەواوی ئاشکراکردن' دەربارەی بەرنامە بایۆلۆجییەکەی، دەدات بە نەتەوە یەکگرتووەکان. عێراق نکۆڵی لەوە دەکات کە هەرگیز هیچ جۆرە چەکێکی بایۆلۆجیی تاقی کردبێتەوە و دەڵێت، دامەزراوەی ئەلحەکەم و کارگەی نەخۆشیی تەبەق و VRLـە، پەیوەندییان بە چالاکییەکانی چەکە بایۆلۆجییەکانەوە نەبووە. عێراق ددان بەوەدا دەنێت کە تەنها بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی 'بەرگریکردنی' هەیە.[4]

* لە ٢٦ی حـــــوزەیران – ١٠ی تەمـــــــوزی ١٩٩٢، نەتەوە یەکگرتووەکـــان پشـــکنینێکی هـــاوبەش لە عێـــراق بـــۆ چەکە کیمیایی/بایۆلۆجییەکان دەکات. ئەم پشکنینە ناتوانێت هیچ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە بخاتە ڕوو. هەروەها لە ٦ – ١٢ی دیسـەمبەری هەمان

---

[1] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today,* Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 257.

[2] *Appendix V: U.N. Inspections in Iraq Suspected Biological Weapons Facilities*, GAO/NSIAD–93–113 Arms Control, p. 56.

[3] Jeffrey Smith, "Iraq's Drive for a Biological Arsenal," *Washington Post*, 21 November 1997.

[4] William J. Broad and Judith Miller, "How Iraq's Biological Weapons Program Came to Light," *New York Times*, 26

ساڵ، نەتەوە یەکگرتووەکان پشکنینێکی تری هاوبەش لە عێراق بۆ چەکە کیمیایی/بایۆلۆجییەکان دەکات. ئەم پشکنینەش ناتوانێت هیچ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە بخاتە ڕوو.[١]

* لە ٣٠ی دیسەمبەری ١٩٩٢دا، ڕۆژنامەی نیویورک تایمز باسی بەڵگەنامەیەک دەکات کە گرووپێکی کوردی بڵاوی کردووەتەوە، ئەم بەڵگەنامەیە یەکەم ئاماژەی نووسراوی تێدایە کە بەغدا لە ساڵی ١٩٨٦ـەوە چەکە بایۆلۆجییەکانی هەیە.[٢]

* لە ٢٤ی شوباتی ١٩٩٣دا، جەیمس ولسی، بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی (CIA)، لە شایەتیدانی لە بەردەم لیژنەی کاروباری حکومەت لە ئەنجوومەنی پیران، دەڵێت، عێراق تاکو ئێستاش بەرنامەیەکی "پێشکەوتوو"ی چەکی بایۆلۆجیی هەیە، هەرچەندە لە جەنگی کەنداودا بە خەستی بۆمباران کراوە و گەلێک پشکنینیش کراون.[٣]

* لە ١١ – ١٨ی ئازاری ١٩٩٣، پشکنینێکی تایبەت بۆ چەکە بایۆلۆجییەکان لە عێراق کراوە. پشکنینەکە نەیتوانی هیچ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی دەست بکەوێت.[٤]

* ئایاری ١٩٩٣، لە ئازاری ٢٠٠١دا ئەوە بڵاو کرایەوە محەمەد ئیبراهیم ئەلئەعزەمی، کە ئەفسەرێکی پۆلیسی پێشوو بووە و بەم دواییە ڕای کردووە بۆ ئەڵمانیا، ئەوەی ئاشکرا کردووە کە لە ئایاری ١٩٩٣دا عێراق کەرەستەی کیمیایی و بایۆلۆجیی قەدەغەکراوی لە

---

[1] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today,* Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 278.

[2] "Document Says Iraq Has Biological Weapons," *New York Times*, 30 December 1992, p. A9.

[3] Jonathan Tucker, "Lessons of Iraq's Biological Weapons Programme," *Arms Control Today,* Vol. 14, No. 3, December 1993, p. 259.

[4] Jonathan Tucker, p. 278.

گۆڕستانی کەرخ ناشتووە. گۆڕستانی کەرخ ٢٥ کیلۆمەتر لە بەغداوە دوورە. ئەعزەمی وتوویەتی کە ئەو کەرەستانە خرابوونە ناو نۆ دارەمەیتی "باش دروستکراو و توند داخراو و مۆرکراو"، ئینجا نێژرابوون و خرابوونە ژێر چاودێریی پاسەوانییەوە. لە شوباتی ٢٠٠١دا، ئەلئەعزەمی سەردانی ئەو گۆڕستانەی کردبوو و بینیبووی کە ئەو نۆ گۆڕە لەگەڵ زەوی تەخت کرابوون و پاسەوانەکانیش دیار نەمابوون.[١]

* لە نۆڤەمبەری ١٩٩٣دا، لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNSCOM)، لە ڕاپۆرتێکدا بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، دەڵێت عێراق هەموو پابەندبوونەکانی سەرشانی خۆی لە بواری بایۆلۆجیدا بەجێ هێناوە و ئەم دۆسییەیە بە داخراو دادەنرێت. دواتر، لەژێر فشارەکاندا، لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان دووبارە دۆسییە بایۆلۆجییەکە دەکاتەوە.[٢]

* ساڵی ١٩٩٤، پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان کامێرای لە دوورەوە چاودێریکردن لە ئەلحەکەم دادەنێن.

* لە حوزەیرانی ١٩٩٤دا، پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان گۆڕێکی بەکۆمەڵ لە نزیک سەنتەری چەکە بایۆلۆجییەکانی سەلمان پاک دەدۆزنەوە. بەرپرسانی عێراق نکۆڵی لەوە دەکەن کە کوژراوەکان کەسانێک بن کە بە چەکە بایۆلۆجییەکان تاقیکردنەوەیان لەسەر کرابێت. نوێنەرێکی عێراقی بە نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێت، کە مردووەکان "بەکرێگیراوی سیاسی" بوون و لە سێدارە درابوون.[٣]

---

[1] Mu'idd Fayyad, "Escapee Iraqi Police Officer Reveals Secret of Bogus Funerals. Baghdad's Authorities Buried Chemical and Biological Material," *Al-Sharq al-Awsat*, 12 March 2001, p. 3.
[2] "INA Reviews Government Cooperation with UN," *INA* DATE; in FBIS Document NO, 18 June 1995
[3] Al J. Venter, "Biological Warfare Atrocities Revealed," *Pointer*, March 1998, p. 1.

* له دیسەمبەری ١٩٩٤دا، لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەوەی بۆ ئاشکرا دەبێت کە بەشی هاوردەکردنی کەرەستە هونەری و زانستییەکان، بە ناوی وەزارەتی تەندروستییەوە، بڕێکی زۆر ناوەندی گەشەکردنیان هاوردە کردووە کە بۆ چاندن و گەشەکردنی وردەزیندەوەر بەکار هێنراون. سەرجەم ئەو بڕەی هاوردەیان کردووە، ٣٩ تەن بووە و لە چەند بەرمیلێکی ٢٥ – ١٠٠ کیلۆگرامیدا بووە، ئەمەش گومانی لای پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان دروست کردبوو (ئەم ناوەندی گەشەکردنە کە هاوردە دەکرێت، بە شێوەی ئاسایی لە قوتوو یان پاکەتی ١٠٠ – ٥٠٠ گرامی لە لایەن لایەنی هەناردەکەرەوە دەنێررێت). لیژنەکە، تا ساڵی ١٩٩٧، تەنها ٢٢ تەن لەو ٣٠ تەنەی ناوەندی گەشەکردنیان تۆمار کردبوو.[1]

* لە ساڵانی ١٩٩٤–١٩٩٥دا، پرۆفیسۆر حوسەین شارستانی، زانای ناوکیی عێراقی، ئەوەی ئاشکرا کرد کە عێراق لە نێوان ساڵانی ١٩٩٤ و ١٩٩٥دا چەندین بەرمیلی کە چەکی بایۆلۆجی و مادەی کیمیایی قەدەغەکراویان تێدا بووە، فڕێ داوەتە ناو ڕووباری دیجلە و فورات و گەلێک چەکی کیمیایی لە چەند شوێنێکی دوورەدەست تەقاندووەتەوە. مەبەستی عێراق لەم کارانە ئەوە بووە کە نەهێڵێت پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان بتوانن ئەم چەکە بایۆلۆجی و کیمیاییانە بدۆزنەوە.[2]

* ساڵی ١٩٩٥، لیوا وەفیق ئەلسامەڕائی، سەرۆکی پێشووی هەواڵگریی عێراقی، لە ڕژێم هەڵدەگەڕێتەوە و هەڵدێت بۆ دەرەوەی عێراق، ئەوە ئاشکرا دەکات کە حوسەین بڕێکی زیاتری لەو چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییانە شاردووەتەوە کە بۆ پشکنەرانی نەتەوە

---

[1] James Hackett, "Saddam and the Risk of Germ Warfare," *Washington Times*, 27 May 1997, p. A17.

[2] Mu'idd Fayyad, "Iraqi Nuclear Scientist Hussein al–Shahrastani: Baghdad Dumped Barrels of 'Chemical' Weapons in the Tigris and Euphrates," *Al–Sharq al–Awsat*, 26 February 2001, p. 5

یەکگرتووەکانی ئاشکرا کردووە. ئەو چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییانەی شاراونەتەوە، ئەمانەن: ٢٢٥ کۆنتێنەر (container) کە دەشێت کەرەستە بایۆلۆجییەکانیان تێدا بێت، ٢٣٠ کۆنتێنەر هاڕاوەیان تێدایە و ٢٥ کۆنتێنەریش شلەیان تێدایە.[1]

* لە کانوونی دووەمی ١٩٩٥دا، دوو کۆمپانیای ئەورووپی ددانیان بەوەدا نا کە ٣٩ تەن لە ناوەندی گەشەکردنیان بە عێراق فرۆشتووە، بەڵام وردەکاریی زیاتری فرۆشتنەکەیان نەدرکاند.[2]

* لە ئازاری ١٩٩٥دا، عێراق دووەم "ڕاپۆرتی دووروودرێژ و کۆتایی و تەواوی ئاشکراکردن" دەربارەی بەرنامە بایۆلۆجییەکەی دەدات بە نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم ڕاپۆرتەشیان زانیاریی نوێی گرنگی لەچاو ڕاپۆرتی یەکەم تێدا نابێت.[3]

* لە ١٠ی نیسانی ١٩٩٥دا، لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە ڕاپۆرتەکەی بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش، بۆ یەکەم جار ئەوە ئاشکرا دەکات کە عێراق بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی ڕانەگەیەنراوی هەبووە.[4]

* لە ١ی تەمووزی ١٩٩٥دا، عێراق بۆ یەکەم جار ددان بەوەدا دەنێت کە بەرنامەیەکی چەکی بایۆلۆجیی هێرشبردنی هەبووە و پێش جەنگی کەنداو بە نهێنی تۆکسینی بۆتولینۆم و بەکتریای پیسەکوانی دروست کردووە. عێراق نکۆڵی لەوە دەکات کە تۆکسینی بۆتولینۆم و بەکتریای پیسەکوانی کردبێت بە چەک و دووپاتی دەکاتەوە کە هیچ هۆیەکی نەبووە بۆ ئەوەی چەکە بایۆلۆجییەکانی پێ بهاوێت. هەروەها عێراقییەکان ددان بەوەدا دەنێن کە لە کارگەی ئەلحەکەم هەزاران

[1] Sean Boyne, "Iraq 'Unlikely' to Give Up Nuclear Option," *Jane's Intelligence Review & Jane's Sentinal Pointer*, September 1996, p. 6.
[2] John Barry, "Unearthing the Truth," *Newsweek*, 2 March 1998.
[3] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.
[4] Laurie Mylroie, "The Method to Saddam's Madness," *Washington Times*, 13 January 1999, p. 17;

گـالۆن لە بەکتریـای پیسـەکوان و تۆکسـینی بۆتولینومیـان بەرهەم هێناوە.[1]

* لە ٤ی ئـابی ١٩٩٥دا، عێـراق سـێیەم "ڕاپـۆرتی دووروودرێـژ و کۆتـایی و تەواوی ئاشـکراکردن" دەربـارەی بەرنـامە بـایۆلۆجییەکەی دەدات بە نەتەوە یەکگرتووەکان، دواتر خودی عێراق ڕای دەگەیەنێت کە ئەم ڕاپۆرتە هیچ و بێبایەخە.[2]

* لە ٨ی ئـابی ١٩٩٥دا، فەریـق حوسـەین کامـل حەسـەن، زاوای سـەددام حوسـێن و قەیسـەری چەکـی کۆکـوژی عێـراق، لە ڕژێـم هەڵـدەگەڕێتەوە و هەڵـدێت بـۆ ئەردەن، زانیـاری دەربـارەی بـواری بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق ئاشکرا دەکات.[3]

* لە ٢٠ی ئـابی ١٩٩٥دا، دوای هەڵـگەڕانەوەی حوسـەین کامیـل، عێراق زانیاریی نوێ لەسەر بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکەی پێشـووی پێشـکەش بە لیـژنەی تـایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکـان دەکـات. ئەم زانیارییانە وردەکارییـان دەربارەی کردنـی هۆکارە بایۆلۆجییەکان بە چەک و کارمەندە سـەرەکییەکان و جۆرەکانی هۆکارە بایۆلۆجییەکـان و چەک و شـوێنەکان تێـدا بـوو. ئەم زانیارییـانە لە ١٥٠ سـندووقی بەڵگەنامەدا، لە کێڵگەیەکی بەخێوکردنی مریشکدا شارابوونەوە.[4]

* لە حـوزەیران – ئـابی ١٩٩٥دا، لیـژنەی تـایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکـان دووپـاتی دەکـاتەوە کە لەو مـاوەیەدا ژمـارەیەک لە زینـدانیکراوی سیاسـی لە زینـدانی ئەبـووغرێبەوە گوازراونـەتەوە بـۆ

---

[1] Edith M. Lederer, "Biological Weapons," *The Associated Press*, 24 April 1997; Christian Seelos, "Lessons from Iraq

[2] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.

[3] UNSCOM: Chronology of Main Events, December 1999, www.un.org.

[4] William J. Broad and Judith Miller, "How Iraq's Biological Weapons Program Came to Light," *New York Times*, 26 February 1998.

شوێنێکی نهێنی له ڕۆژئاوای عێراق. لەم شوێنەدا، به سەرپەرشتیی یەکەیەکی تایبەتی سەر به لیژنەی پیشەسازیی سەربازی، ئەم زیندانییانه هۆکاره کیمیایی و بایۆلۆجییەکانیان لەسەر تاقی کراوەتەوە. به گوتەی پشکنەرێکی چەکەکان، "بەڵگەی باوەڕپێکراو" هەیە که زیندانییەکان له ئەبووغرێبەوه گوازراوونەوه بۆ سەلمان پاک.[1]

* له سێپتەمبەری ١٩٩٥دا، تاریق عەزیز دەڵێت ئەگەر عێراق له جەنگی کەنداودا به چەکی ناوکی هێرشی بکرێته سەر، ئەوا به چەکی بایۆلۆجی تۆڵەی خۆی دەکاتەوە.[2]

* له ئۆکتۆبەری ١٩٩٥دا، وەزیری نەوتی عێراق، عامر ڕەشید، دەڵێت "عێراق نیازی بەکارهێنانی چەکه بایۆلۆجییەکانی نییه، مەگەر هاوپەیمانان یان ئیسرائیل به چەکه ناوکییەکان هێرش بکەنه سەر بەغدا."[3]

* له ئۆکتۆبەری ١٩٩٥دا، تاریق عەزیز، جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق، ڕای دەگەیەنێت له جەنگی کەنداودا ستراتیجی سەربازیی عێراق بەم جۆره بووه، ئەگەر هێزەکانی هاوپەیمانان چەکی ئاسایییان بەکار هێنابایە، ئەوا عێراقیش هەر چەکی ئاسایی بەکار دەهێنا. ئەگەر چەکی ناوکی بەکار هێنرابایە، ئەوا سوپای عێراق بەو چەکانەی له بەردەستیدا بوون، وەڵامی دەدایەوە، لەوانه، چەکه بایۆلۆجی و کیمیاییەکان.[4]

---

[1] Betsy Pisik, "Chemical Arms Tests on Inmates Suspected," *Washington Times*, 15 January 1998, p. 1.

[2] "U.N. Reports Iraq Getting Rid of Its Chemical Weapons," *Nando Times*, 9 September 1997.

[3] .https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

[4] Timothy V. McCarthy and Jonathan B. Tucker, "Saddam's Toxic Arsenal: Chemical and Biological Weapons in the Gulf Wars," in Peter R. Lavoy, Scott D. Sagan and James Wirtz (ed.), *Planning the Unthinkable* (Cornell University Press, 2000), pp. 47–78.

* لە ئایار – حوزەیرانی ١٩٩٦دا، عێراق بە سەرپەرشتیی لیژنەی تــایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکــان، تەلارە گەورەکــان و ئــامێر و کەرەستەکان لە دەزگاکانی ئەلحەکەم، دۆرە و ئەلمەنال دەڕووخێنێت و لەناویان دەبات.[١]

* لە ٢٢ی حــوزەیرانی ١٩٩٦دا، عێــراق، چــوارەم "ڕاپــۆرتی دووروودرێــژ و کۆتــایی و تەواوی ئاشــکراکردن" دەربــارەی بەرنــامە بـایۆلۆجییەکەی دەدات بە نەتەوە یەکگرتووەکـان. دوای هەوڵێکـی زۆر بــۆ ســەلماندنی وردیــی ئەم ڕاپــۆرتە، لیــژنەی تــایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکــان ڕاپــۆرتەکە ڕەت دەکەنەوە، لەبەر ئەوەی نە بە وردی دەزانن و نە بڕوایان پێی دەبێت.[٢]

* لە ســـەرەتای ســـاڵی ١٩٩٧دا، لیـــژنەی تـــایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان چەند بەڵگەنامەیەک دەدۆزنەوە، ئەوە پیشـان دەدەن کە عێراق ڕایسینی بەرهەم هێناوە.[٣]

* لە ١٤ – ١٥ی شـــوباتی ١٩٩٧دا، لیـــژنەی تـــایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکـان ١٧٣، سەرپەرشـتیی هەڵکەندنەوەی ئەو چاڵانە دەکەن کە لە ئەلعەزیزییە بوون، عێراق ڕای گەیاندبوو کە بۆمبەکـانی جۆری R400ی لەو چاڵانەدا تێک شکاندووە.[٤]

* لە نیســانی ١٩٩٧دا، پشــکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکــان بڕیــار دەدەن چاوپێکەوتن لەگەڵ شـاکر ئەلعەگیدی بکەن. شـاکر ئەلعەگیدی

---

[1] Tim McCarthy, *Iraq's Biological Weapon Sites and Facilities*, Center for Nonproliferation Studies, Monterey Institute of International Studies, July 1999, p. 8.
[2] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.
[3] *Iraq's Weapons of Mass Destruction Programs*, U.S. Government White Paper, 13 February 1998.
[4] U.S. Intelligence Community, *Intelligence Related to Possible Sources of Biological Agent Exposure During the Persian Gulf War*, August 2000, www.gulflink.osd.mil.

کە پرۆفیسۆرێکی بایۆلۆجی بوو لە زانکۆی بەغدا، پەیوەندیی بەوەوە دەبێت کە لەسەر تۆکسین کاری کردبێت. کاتێک پشکنەرەکان دەگەنە شوێنەکە، پیاوێکی نەناسراو، دوایی دەردەکەوێت کە شاکر بووە، بە پەلە بە کۆمەڵێک کاغەزەوە کە لە بن باڵیدا بوون، لە تەلارەکە دێتە دەرەوە. شاکر دەڵێت ئەو کاغەزانە هیی هاوسەرەکەی بوون. ئەو کاغەزانە بەڵگەی ئەوەیان تێدا بووە کە حکومەتی عێراق، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٠دا، بەردەوام بەری ڕووەکی گەرچەکی کۆ کردووەتەوە و ڕایسینی لێ دەرهێناوە.[1]

* لە ١٢ی حوزەیرانی ١٩٩٧دا، بەرپرسانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەیانەوێت پشکنینێکی لەناکاو بۆ بارەگای یەکەی تایبەتی گاردی کۆماری عێراقی بکەن. پشکنەران پێشبینیی ئەوە دەکەن تۆمارەکانی گواستنەوەی هۆکارە بایۆلۆجییەکانیان بدۆزنەوە کە بە ساردکەرەوە لە سەنتەرێکی ڕاهێنانی سەربازی و زانکۆی ئەلبەکر گوازرابوونەوە. کاتێک پشکنەرەکان دەگەنە ئەوێ، ڕێگەیان پێ نادرێت بچنە ناو یەکەی گاردی کۆماری. بە گوتەی پشکنەرێک، تیمی پشکنەرەکان کۆمەڵێک شت دەبینن کە بە سەر دیواردا، لە بارەگای گاردە کۆمارییەکەوە، ئاودیوی ڤیلای سەرۆککۆمار دەکرێن کە نزیک دەبێت لە بارەگای یەکەی گاردی کۆماری.[2]

* لە سێپتەمبەری ١٩٩٧دا، حکومەتی عێراق پێنجەم "ڕاپۆرتی دووردرێژ و کۆتایی و تەواوی ئاشکراکردن" دەربارەی بەرنامە بایۆلۆجییەکەی دەدات بە نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم ڕاپۆرتە ٦٣٩ لاپەڕە بوو و هیچ زانیاریی گرنگی لەچاو ڕاپۆرتەکەی پێشوودا تێدا

1 —"Chasing Iraq's Deadly Arsenal U.N. Is Seeking 25 Warheads With Some of the World's Most Virulent Germs, Outgrowth of Toxin Sent from U.S.," *Pittsburgh Post–Gazette*, 25 November 1997.

2 —"Chasing Iraq's Deadly Arsenal U.N. Is Seeking 25 Warheads With Some of the World's Most Virulent Germs, Outgrowth of Toxin Sent from U.S.," *Pittsburgh Post–Gazette*, 25 November 1997.

نەبوو. لیژنەیەک لە پسپۆڕانی نێودەوڵەتی بەم ڕاپۆرتەدا دەچنەوە و دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە لە هەموو بوارەکاندا کەموکورتیی تێدایە.[١]

* لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٧دا، ڕیچارد بوتلەر یەکەم ڕاپۆرتی خۆی دەدات بە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە دوای ڕاڵف ئیکیوس سەرۆکایەتیی لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەگرێتە دەست. بوتلەر دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە عێراق بەردەوامە لە شاردنەوەی زانیاری دەربارەی چەکە بایۆلۆجییەکانی و دەڵێت، "هیچ بەرەوپێشچوونێک" لە هەڵوەشاندنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراقدا ڕووی نەداوە.[٢]

* لە نۆڤەمبەری ١٩٩٧دا، فەرمانگەی هەواڵگریی فیدراڵیی ئەڵمانیا زانیارییان لا دەبێت کە عێراق پەرە بە "چەکی بایۆلۆجیی ئابووری" دەدات، دەگوترێت کە ئەم چەکە کەڕوو (fungus) بێت کە کار دەکاتە سەر دانەوێڵە و دەکرێت بۆ لەناوبردنی بەروبوومی دانەوێڵەیی بەکار بهێنرێت.[٣]

* لە ١٣ی نۆڤەمبەری ١٩٩٧دا، سەرۆککۆماری عێراق، سەددام حوسەین، چەند فەرمانێک دەردەکات بە دەرکردنی پشکنەرە ئەمەریکییەکان. ڕۆژی دواتر، ڕیچارد بوتلەر، هەموو پشکنەرەکانی تر لە عێراق دەکشێنێتەوە.[٤]

[1] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org

[2] Barbara Crossette, "New U.N. Monitor Says Iraq Is Still Hiding Data on Weapons," *Christian Science Monitor*, 8 October 1997

[3] Michael J. Inacker, "Bacteria–Saddam Is Building Missiles That Go As Far As Europe," *Welt am Sonntag*, 30 November 1997

[4] Barbara Crossette, "U.N. Council Gets Evidence of Iraqi Illicit Arms Buildup," *New York Times*, 20 November 1997.

* له شوباتی ١٩٩٨دا، ئەوە ئاشکرا دەبێت هەندێک کەلوپەل کە دەکرێت بۆ بەرهەمهێنانی بەکتریای پیسەکوان بەکار بهێنرێن، ساڵی ١٩٩٤ لە بەریتانیاوە بۆ عێراق هەنار دەکراون.[1]

* لە ئازاری ١٩٩٨دا، حکومەتی عێراق ئەوە ڕادەگەیەنێت کە ناسر ئەلهینداوی، بەڕێوەبەری پێشووی بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق، لە کاتی هەوڵدانی بۆ هەڵاتن لە بەغدا دەستگیر کراوە و گەلێک بەڵگەنامەی هەستیاری دەربارەی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق پێ بووە. بەرپرسانی کۆشکی سپی گومان لەوە دەکەن کە دەستگیردنی ناسر ئەلهینداوی شانۆگەرییەکی دروستکراوی عێراقی بێت، بۆ ئەوەی عێراق نەتەوە یەکگرتووەکان قایل بکات کە جدییە لەسەر لێکهەڵوەشاندنەوەی چەکە کۆکوژەکانی. ئەو بەڵگەنامانەی عێراق ڕادەستی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردن، چەندین دانەیان تێدا بوو کە ناوەڕۆکانیان پێشتر لە لایەن لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە زانراو بوون.[2]

* لە ٢٠ – ٢٧ی ئازاری ١٩٩٨دا، لەسەر داوای عێراق، کۆبوونەوەیەکی هەڵسەنگاندنی هونەری لە نێوان عێراق و تیمێکی پسپۆڕانی نێودەوڵەتی، کە لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆی کردبوونەوە، لە ڤیەننا ڕێک خرا، بۆ ئەوەی ڕێگە بە عێراق بدرێت کە کێشەکەی سەبارەت بە "ڕاپۆرتی سێپتەمبەری ١٩٩٧"، "ڕاپۆرتی دوورودرێژ و کۆتایی و تەواوی ئاشکراکردن" دەربارەی بەرنامە بایۆلۆجییەکەی، کە پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردبوو، بخاتە ڕوو.[3]

---

[1] Report: Germans Sold Weapons to Iraq," *United Press International*, 17 February 1998.
[2] Douglas Waller, "Iraq: Chemical Bothers," *Time Daily*, 30 March 1998
[3] UNSCOM Report to the Security Council, 25 January 1999, Annex C: Status of Verification of Iraq's Biological Warfare Programme, www.fas.org.

* له ٨ی نیسانی ١٩٩٨دا، ڕاپۆرتی تیمی هەڵسەنگاندنی هونەری پێشکەش بە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان کرا. پسپۆڕان بۆیان دەرکەوت "ڕاپۆرتی دووروودرێژ و کۆتایی و تەواوی ئاشکراکردن" کە عێراق لە سێپتەمبەری ١٩٩٧ پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردبوو، ڕاپۆرتێکی ناتەواوە و بەس نییە. ڕاپۆرتی تیمی هەڵسەنگاندنی هونەری دەڵێت ڕاپۆرتەکەی عێراق "گەلێک هەڵەی گەورە و دژبەیەک و کەلێنی زانیاریی تێدایە." سەبارەت بە بانگەشەکانی عێراق کە دەڵێت کڵاوە مووشەکییەکانی کە چەکی بایۆلۆجییان تێدا بووە لەناو براون، ڕاپۆرتەکەی تیمی هەڵسەنگاندنی هونەری دەڵێت، "ڕاپۆرتەکەی عێراق لەگەڵ بەڵگە ماددییەکان یەک ناگرێتەوە."[١]

* له ١٤ی تەمووزی ١٩٩٨دا، لەسەر داوای عێراق، لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان سێیەم کۆبوونەوەی پسپۆڕانی نێودەوڵەتی لە بەغدا ساز دەکات بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕاپۆرتی سێپتەمبەری ١٩٩٧ی عێراق، "ڕاپۆرتی دووروودرێژ و کۆتایی و تەواوی ئاشکراکردن"ی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق. تیمی پسپۆڕانی نێودەوڵەتی دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە ناتوانرێت ڕاستی و دروستیی تەواوی ڕاپۆرتەکە بسەلمێنرێت.[٢]

* له ٥ی ئابی ١٩٩٨دا، عێراق هەموو پشکنینەکانی لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕادەگرێت.

* له ١٦ی دیسەمبەری ١٩٩٨دا، سەددام حوسەین هەموو هاوکارییەکانی لەگەڵ پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەوەستێنێت. پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق دەکشێنەوە.

---

[1] UNSCOM: Chronology of Main Events, December 1999, www.un.org; Barbara Crossette, "Experts Deny Iraq Has Ended Its Germ Warfare Program," *New York Times*, 10 April 1998

[2] United Nations, UNSCOM report to the Security Council, s/1998/920 (1998), 6 October 1998, www.un.org

* لە ١٧ی دیسەمبەری ١٩٩٩دا، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بڕیاری ١٢٨٤ دەردەکات. بەپێی ئەم بڕیارە، لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNMOVIC)، جێگەی لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNSCOM) دەگرێتەوە.[1]

* لە ١٧ی ئایاری ٢٠٠٠دا، سەرۆکی هەواڵگریی بەرگریی شانشینی یەکگرتوو دەڵێت کە عێراق "دەتوانێت توانا جەنگییە بایۆلۆجییەکانی لە ماوەی چەند مانگێکدا نوێ بکاتەوە."[2]

* لە ٢٤ی ئایاری ٢٠٠٠دا، لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی گاردیان، باڵوێز ڕیچارد بوتلەر، سەرۆکی پێشووی لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان، دەڵێت لەو ماوەی لە بەغدا بووە، بەڵگەی لایە کە سەددام حوسەین چەکە کۆکوژەکانی لە نەتەوە یەکگرتووەکان شاردووەتەوە و لە ماوەی ١٨ مانگی ڕابوردوودا، سەددام ماوەی نەبوونی نەتەوە یەکگرتووەکانی لە عێراق قۆستووەتەوە بۆ دروستکردنەوەی جبەخانەکەی لە مووشەک و چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییەکان.[3]

* لە ١٩ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٠دا، ڕۆژنامەی سەندەی تێلیگراف بڵاوی کردەوە، بەگوێرەی ڕاپۆرتەکانی هەواڵگریی ڕۆژئاوایی، عێراق جبەخانەیەک لە چەکە کیمیایی بایۆلۆجییەکانی لە خوێندنگە و نەخۆشخانەکان عەمبار کردووە، لەوانە، بڕێکی زۆر لە ناوەندەکانی گەشەکردنن کە بۆ بەرهەمهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکان بەکار دەهێنرێن.[4]

---

[1] .https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

[2] "Gulf Weapons Proliferation Unstoppable", *Middle East Economic Digest*, 23 May 2000, p. 4.

[3] Ewen MacAskil, "Iraqi Nerve Gas 'Could Paralyse Western Cities'," *The Guardian*, 24 May 2000

[4] Christina Lamb, "Saddam Stockpiling Deadly Chemical Weapons," *Sunday Telegraph*, 19 November 2000

* له ٢٢ی كانوونی دووهمی ٢٠٠١دا، ڕۆژنامەی نیویورک تایمز بڵاوی کردەوە، بەپێی مەزەندەیەکی نوێی هەواڵگری، "عێراق کۆمەڵێک لە کارگەی بنیات ناوەتەوە کە دەمێکە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گومانی ئەوەی لێ کردوون چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی بەرهەم بێنن. دەست کراوەتەوە بە دروستکردنی دوو کارگە لە ناو کۆمەڵە خانوویەکی پیشەسازی لە فەللوجە، وێڕای بەرهەمهێنانی کلۆر لە کارگەی سێیەم لە ناو هەمان کۆمەڵە خانوو. بەرپرسە حکومییەکان دەڵێن ئەو سێ کارگەیە لەوەوپێش بۆ بەرهەمهێنانی هۆکارە کیمیایی یان بایۆلۆجییەکان بەکار هێنرابوون.[1]

* له ١٥ شوباتی ٢٠٠١دا، ڕۆژنامەی هێراڵد، کە ڕۆژنامەیەکی بەریتانییە، بڵاوی کردووەتەوە، بەپێی ڕاپۆرتێکی ناوخۆی نەتەوە یەکگرتووەکان، کارگەی بەرهەمهێنانی ڕۆنی گەرچەک کە لە نزیک فەللوجەیە، دروست کراوەتەوە. ئەم کارگەیە کە ساڵی ١٩٩٨ بە هۆی هێرشەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە کاول کرابوو، ئێستا دەتوانێت بڕێکی زۆر لە ڕایسین دروست بکات.[2]

* سەرەتای ئازاری ٢٠٠١، ڕاپۆرتێکی نهێنیی لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە پشتی بەستبوو بەو زانیارییانەی لە لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆی مابوونەوە، دەڵێت، "... دەشێت بەرهەمهێنانی هۆکاری B (سپۆرەکانی بەکتریای پیسەکوان) زۆر زیاتر بێت لەوەی باس کراوە و لە حاڵەتێکدا بەرهەمهێنانی بڕێکی ئاوا زۆر ڕووی دابێت، ئەوا ئەو

[1] Steven Lee Myers and Eric Schmitt, "Iraq Rebuilt Weapons Factories, Officials Say," *New York Times*, 22 January 2001.
[2] Ian Bruce, "Revealed: Saddam's Factory of Death; Iraq Uses Castor Oil By-Product to Make Biological Weapons," *The Herald*, 15 February 2001, p. 2.

بڕەی ماوەتەوە، هێشتا چالاکیی بەرچاوی دەبێت، ئەمەش جێگیریی ئەم هۆکارەی لێ دەکەوێتەوە.[١]

* لە نیسانی ٢٠٠١دا، محەمەد ئەلدوری، باڵوێزی عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان، لە نامەیەکیدا بۆ کۆفی عەنان، سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، داوای ڕازیبوونی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات کە پارە تەرخان بکات بۆ دروستکردنەوەی تاقیگەیەک بۆ دروستکردنی ڤاکسینی نەخۆشیی تەبەق، کە پێشتر ئەم تاقیگەیە لە لایەن پشکنەرانی لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە کاول کرابوو. ئەم پارەیەش لە داهاتی بەرنامەی نەوت بەرامبەر خۆراک دابین بکرێت.[٢]

* ساڵی ٢٠٠٢، شیکردنەوەیەکی دەزگای هەواڵگریی ناوەندی ئەمەریکا، بڕی هەڵگیراوی بەکتریای پیسەکوانی عێراق بە ٢٦٥٠ گاڵۆن مەزەندە دەکات.[٣]

* لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٢دا، پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان، وەک بەشێک لە لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان، دەگەڕێنەوە عێراق و لە ٢٢ی هەمان مانگ، پشکنینەکانیان دەست پێ دەکەنەوە.[٤]

* لە ٧ی دیسەمبەری ٢٠٠٢دا، عێراق ڕاگەیاندننامەیەکی دووروودرێژ و تەواوی نوێکراوە، وەک لە بڕیاری ١٤٤١دا داوا کرابوو، دەدات بە لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان. عێراق لەو ڕاگەیاندننامەیەدا باسی بەرنامەکانی چەکە قەدەغەکراوەکانی و بەرنامەکانی تری خۆی دەکات.

---

[1] "Missiles and Viruses Still Troubling U.N. UNMOVIC Report," *Financial Times*, 2 March 2001, p. 11.

[2] "Iraq Seeks Help Making Foot–and–Mouth Vaccine," *The Nando Times*, 8 April 2001.

[3] Graham T. Allison, "The View From Baghdad", *Washington Post*, 31 July 2002, p. 19.

[4] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf

ڕاگەیاندننامەکە لە ١٢٠٠٠ لاپەرە پێک هاتبوو. لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان، جگە لەو ڕاگەیاندننامە بایۆلۆجییانەی کە پەیوەندییان بە چەکەوە نەبوو و ڕاگەیاندننامەکانی پەرەپێدانی مووشەک، زانیاریی زۆر کەم لەو ڕاگەیاندننامەدا دەدۆزێتەوە.[1]

* لە ٢٤ی شوباتی ٢٠٠٣دا، دان ڕازەر (Dan Rather) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ سەددام حوسەین دەکات سەبارەت بە چەندین لایەنی بەرنامەکانی چەکە نایاساییەکانی عێراق و نزیکبوونەوەی ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی. سەددام نکۆڵی لەوە دەکات کە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی پێشێل کردبێت.[2]

* لە ٦ی ئازاری ٢٠٠٣دا، بەڵگەنامەیەکی گشتیی لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان، چەند ڕاپۆرتێکی لەسەر کۆمەڵێک لە کێشە چارەسەرنەکراوە ماوەکانی داماڵینی چەکی بایۆلۆجی تێدا بوو، لەوانە، ئەو کێشانەی تێدا بوو کە پەیوەندییان بە بەکتریای پیسەکوان، تۆکسینی بۆتولینوم، کەڕووە تۆکسینەکان، لەوانەش، ئەفلاتۆکسین و ترایکۆثیسین، خەڵووزەی گەنم و کلۆستریدیوم پێرفرینجز، ڕایسین، هۆکارەکانی چەکە بایۆلۆجییە ڕانەگەیەنراوەکان، وشکردنەوەی هۆکارەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان، بەرهەمهێنانی چەکە بایۆلۆجییە بەکترياییەکان، ئەندازەی بۆماوەیی و توێژینەوەی ڤایرۆسی و هاندەرەکانی هۆکاری چەکە بایۆلۆجییەکان، هەبوو.[3]

* لە ٧ی ئازاری ٢٠٠٣دا، هانز بلیکس ڕاپۆرتێک دەربارەی بەرەوپێشچوونی کاری لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و

---

[1] UN document S/2003/232, 28 February 2003, www.un.org.
[2] Dan Rather Interview with President Saddam Hussayn, 24 February 2003.
[3] An UNMOVIC working document reports on the clusters of remaining unresolved biological disarmament issues

چـاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکـان سـەبارەت بە چەکـداماڵین لە عێراقـدا پێشـکەش بە ئەنجـوومەنی ئاسایشـی نەتەوە یەکگرتووەکـان دەکـات. لە ڕاپـۆرتەکەدا، بلـیکس باسـی ئەوە دەکـات لە سـەرەتادا عێراقییەکان بە دووڵییەوە هاوکاریی لیژنەکەیان کردووە، بەڵام ئێستا وا دەردەکەوێت کە خێرابوونێک لە هاوکارییە دەستپێشـخەرییەکانیان هەبێت، لەوانە، چەکداماڵینی مووشەکانی ئەلسموود دوو.[1]

* لە ١٦ی ئـازاری ٢٠٠٣دا، ڕاگەیانـدننامەکەی عێـراق دەربـارەی چەکەکانی بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان، نـاوی کۆمپانیـای American Type Culture Collection of Manassas, VA و پەیمانگـەی Pasteur Institute دەهێنێت، وەک سەرچاوەکانی هەمـوو ئەو نمـوونە بەکتریایـانەی کە بـۆ دروسـتکردنی چەکە بایۆلۆجییەکـانی بەکـاری هێنـاون. بەپێـی ڕاگەیانـدننامەکە، ئەو دوو سـەرچاوەیەی دابینکردنـی بەکتریاکان، لە سـاڵانی ١٩٨٠کانـدا حەڤدە جۆر هۆکاری بایۆلۆجییـان بۆ عێراق ناردووە، لە ناویاندا بەکتریـای پیسـەکوان و ئەو بەکتریـایەی بۆ بەرهەمهێنانی تۆکسینی بۆتولینوم بەکار دەهێنرێت.[2]

* لە ١٨ی ئـــازاری ٢٠٠٣دا، پشـــکنەرانی لیـــژنەی پشـــکنین و لێکـــۆڵینەوە و چـــاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکـــان لە عێـــراق دەکشـــێنەوە، دوای ئاگـــادارکردنەوەیەک لە ئیـــدارەی ویـــلایەتە یەکگرتووەکان، کە هێرشبردنەسەر عێراق نزیک بووەتەوە.[3]

* لە ٢٠ – ٢٣ی ئـــــازاری ٢٠٠٣دا، هێزەکـــــانی ویـــــلایەتە یەکگرتووەکـان و هاوپەیمانـان لە ٢٠ی ئـازار، کـاژێر ٤ی بەیـانی بە کاتی بەغدا، دەست بە ئۆپەراسیۆنی ئازادیی عێراق، کە داگیرکردنـی سەربازییانەی عێراقە، دەکەن.[4]

---

1 —"United Nations Weapons Inspectors Report to the U.N. Security Council on Progress in the Disarmament of Iraq", United Nations, 7 March 2003.
2 Philip Shenon, "Iraq likes germs for weapons to US and France," *New York Times*, 16 March 2003, p. 18.
3 https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf
4 —"The war begins," *Economist*, 20 March 2003, www.un.org.

* له ٣٠ی ئایــاری ٢٠٠٣دا، لیــژنەی پشــکنین و لێکــۆڵینەوە و چــاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکــان (UNMOVIC)، ڕاپــۆرتی ٣ مـانگی دەربـارەی ئەنجامەکـانی پشـکنینەکانی لە عێراق پێشکەش بە نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات. ڕاپۆرتەکە چەندین خـاڵی گرنگی لە خۆ گرتبوو، لەوانە، لێکۆڵینەوەیەک لەسەر لەنـاوبردنی بۆمبەکانی R400، لێکـۆڵینەوەیەک لەســەر لەنــاوبردنی بەکتریــای پیســەکوان، تــاقیگە گەڕۆکەکـــانی بەرهەمهێنـــانی چەکە بایۆلۆجییەکـــان و کەرەســـتە بایۆلۆجییەکان. لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکـــان مەیـــدانی تـــاقیکردنەوەی مەودای چەکـــی، کە لە ئەلعەزیـزییە بـوو، پشـکنیبوو، عێراق ڕای گەیانـدبوو کە لەم شـوێنەدا، عێراق تاکلایەنە، ١٥٧ بـۆمبی R400ی پڕکراو لە هۆکاری بـایۆلۆجیی لەنــاو بــردووە. عێـراق بـۆ سـەلماندنی ئەوەی ئەو بۆمبـانەی لەنــاو بردووە، شوێنەکەی هەڵکەندەوە و بۆمبەکان و پارچەکانی بۆمبەکانی هێنایە دەرەوە. ژمارەی پلێتە بنچینەییەکانی بۆمبەکان و نووسینەکانی سەر پارچەکانیان و ئاستی داخورانیـان، لەگەڵ ڕاگەیاندنەکەی عێراق کـۆک بـوون. وەرگرتنـی نمـوونە لە دوو بـۆمبی پڕی سـاغ، هەبـوونی بەکتریــای پیســەکوان و بڕێکــی زۆری مەنگەنیــز و ترشـــی فۆرمیــک، لەگەڵ قســەکانی عێـراق دەهــاتنەوە کە بە پەرمەنگەنــاتی پۆتاسـیۆم و فۆرمەڵدیهاید، بە ڕێگەی کیمیـایی بەکتریـای پیسـەکوانەکەی ناچـالاک کردووە.

عێراق لێکۆڵینەوەیەکی دەربـارەی لەنـاوبردنی پیسـەکوان پێشکەش بە لیـــژنەی پشـــکنین و لێکـــۆڵینەوە و چـــاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکـان کردبـوو، بـۆ ئەوەی بیسـەلمێنێت کە پێشـتر تـاکلایەنە بەکتریـــا عەمبارکراوەکـــانی پیســـەکوانی لە ســـاڵی ١٩٩١دا، لە دامەزراوەی ئەلـــحەکەم لەنـــاو بـــردووە. لێکـــۆڵینەوەکەی عێـــراق نەیتوانیبوو ئەوە بسەلمێنێت کە بڕی چەند بەکتریای پیسـەکوانی لەناو بــردووە. لیــژنەی پشــکنین و لێکــۆڵینەوە و چــاودێریکردنی نەتەوە

یەکگرتووەکان چەندین دامودەزگای گەڕۆکی بەرهەمهێنانی چەکی بایۆلۆجیی گومانلێکراوی لە عێراق پشکنیبوو. ئەم پشکنینانە لەسەر بنەمای هەواڵگریی حکومەتانی تر کرابوون. چەندین شوێن کە ئامێری چارەسەرکردنی تۆویان لێ بوو، لە ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی چەکی بایۆلۆجی دەچوون، بەڵام هیچ بەڵگەیەک لەسەر چالاکیی گەڕۆکی بەرهەمهێنانی چەکی بایۆلۆجی نەدۆزرایەوە. لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای گەلێک ڕاگەیاندننامە و وێنەی هەموو دامودەزگا گەڕۆکەکانی لە عێراق کردبوو، عێراقیش هەموو ئەوانەی ڕادەستی لیژنەکە کردبوو. پاشان ئەم لیژنەیە لە ماوەی پشکنینە بەردەوامەکانیدا، بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ئەم دامودەزگایانەی دەپشکنی، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەسەر بەرهەمهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکان نەدۆزیبووەوە. سەرەڕای پشکنینەکانیش، ٢٤٤,٦ کیلۆگرام لە ناوەندەکانی گەشەکردن و ٤٠ شووشەی تۆکسینی پێوانەیی ماوەبەسەرچوو، لەژێر چاودێریی لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لەناو برابوون.[١]

* لە حوزەیرانی ٢٠٠٣دا، گرووپی ڕووماڵی عێراق پێک هێنرا بۆ بەدواداگەڕانی چەکە کۆکوژەکان لە عێراقدا. ئەم گرووپە لە نزیکەی ١٤٠٠ پسپۆڕی چەکە کۆکوژەکان پێک هاتبوو، دەیڤید کای، گەورە پشکنەری پێشووی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرۆکایەتیی دەکرد.[٢]

* لە ٢ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣دا، دەیڤید کای، ڕاپۆرتێک، سەبارەت بە یەکەم شەش مانگی بەرەوپێشچوونی کاری گرووپی ڕووماڵی عێراق ڕادەستی کۆنگرێس دەکات. کای لە ڕاپۆرتەکەدا ڕای دەگەیەنێت کە

---

[1] *Thirteenth quarterly report of the Executive Chairman of the United Nations Monitoring, Verification and Inspection Commission in accordance with paragraph 12 of Security Council resolution 1284 (1999)*, UN document S/2003/580, 30 May 2003, www.un.org.

[2] James Risen, "After the war: Illegal weapons; US asks ex-UN inspector to advise on arms search," *New York Times*, 11 June 2003, p. A18.

زانیاریی زۆر سەبارەت بە نیازی سەددام بۆ دەستپێکردنەوەی بەرنامە قەدەغەکراوەکانی دۆزراونەتەوە. هەروەها کای ڕای دەگەیەنێت کە هیچ جبەخانەیەکیان لە جبەخانەکانی چەکە بایۆلۆجییەکانیان نەدۆزیوەتەوە.[1]

* لە ١٠ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣دا، تاکە بەڵگە کە گرووپی ڕووماڵی عێراق لە عێراق بە دەستیان هێنابێت، شووشەیەک بوو کە کلۆستریدیوم بۆتولینومی جۆری بیی تێدا بوو و لەناو بەفرگرەی زانایەکدا بوو. کای وتی، ئەم شووشەیە بە مەبەستی پاراستنی، لە ساڵی ١٩٩٣وە لە ناو بەفرگرەکەی زانا عێراقییەکەدا هەڵگیرابوو.[2]

* لە ٢٦ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٣دا، لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕاپۆرتی پێداچوونەوەیەکی مێژوویی سەبارەت بە لەناوبردنی هەریەکە لە کەرەستەکانی چەکە بایۆلۆجییە قەدەغەکراوەکان و هۆکارە بایۆلۆجییەکان، کە لە ساڵی ١٩٩١ـەوە دەست بە لەناوبردنیان کرابوو، بڵاو دەکاتەوە. ڕاپۆرتەکە بە دوورودرێژی ڕاگەیاندننامە سەرەتاییەکانی عێراق سەبارەت بە توێژینەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لە ساڵی ١٩٩١ و ڕاگەیاندننامەکانی دیکەی عێراق لە ساڵی ١٩٩٥ بڵاو دەکاتەوە. ڕاپۆرتی لیژنەکە ئەمانەی تێدا بوو: عێراق ددان بە بەرهەمهێنانی بڕێکی زۆری هۆکارە بایۆلۆجییەکاندا دەنێت، بانگەشەکانی عێراق سەبارەت بە لەناوبردنی تاکلایەنەی چەکە بایۆلۆجییەکانی لە ساڵی ١٩٩١دا، لەناوبردنی چەکە بایۆلۆجییەکان و کەرەستەکانیان بە سەرپەرشتیی لیژنەیەکی تایبەت لە ساڵی ١٩٩٦دا، لەناوبردنی کەرەستە بایۆلۆجییەکان بە سەرپەرشتیی لیژنەی پشکنین و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە

[1] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf
[2] "Revelations Cast Doubt on Iraq Find," *The Guardian* (UK), 10 October 2003, www.un.org.

یەکگرتووەکـان لە سـاڵی ٢٠٠٣ و بـارودۆخی دامەزراوەکـانی چەکە بایۆلۆجییەکان دوای ساڵی ١٩٩٦.[1]

* لە ٣٠ی سێپتەمبەری ٢٠٠٤دا، گرووپی ڕوومـاڵی عێراق دوایین ڕاپـۆرتی خـۆی لەسـەر چەکە کۆکوژەکـانی عێـراق بـڵاو دەکـاتەوە. ڕاپـــۆرتەکە دەڵێـــت ســـەددام بە نیـــاز بـــووە بەرنامەکـــانی چەکە کۆکوژەکانی، دوای لابردنـی سـزاکانی نەتەوە یەکگرتووەکـان، دەسـت پـێ بکـاتەوە. بەگـوتەی گـرووپـی ڕوومـاڵی عێـراق، دەشـێت عێـراق لە سـاڵانی ١٩٩١ و ١٩٩٢دا، جبەخانەکـانی چەکە بایۆلۆجییەکـانی لەنـاو بردبێـت، بەڵام تـاکو ناوەڕاسـتی سـاڵانی ١٩٩٠ـەکان لە تـوێژینەوەی چەکە بایۆلۆجییەکـان بەردەوام بووبێـت. توێژینەوەکـان بەکارهێنـانی چەکە کۆکوژەکـانی بـۆ کوشـتنی بە نهێنـی و تـاقیکردنەوە لەسـەر مرۆڤیـان دەگـرتەوە. سـاڵی ١٩٩٦، دامودەزگـا و کەلوپەلەکـانی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق، بە سەرپەرشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، لەناو بران. عێراق توانیی بە خێرایی لە مـاوەی چەند هەفتەیەکدا، دووبـارە بەرنامەکانی چەکە بایۆلۆجییەکانی لەسـەر ئاسـتێکی بچووک، لە ڕێـی بەکارهێنانی ئەو دامەزراوە مەدەنییانەی کە دوو بەکارهێنانیان هەبوو، دابمەزرێنێـتەوە. لەگەڵ ئەوەشـدا، گـرووپـی ڕوومـاڵی عێـراق، هـیچ بەڵگەیەکـی نەدۆزیـیەوە کە عێـراق شـوێن ئەم بـڕاردەیە کەوتبێـت. سـەرەڕای ئەوەش، گـرووپـی ڕوومـاڵی عێـراق هـیچ بەڵگەیەکـی نەدۆزییەوە کە عێراق هیچ دەزگایەکی گەڕۆکی بەرهەمهێنـانی چەکی بایۆلۆجیی دروست کردبێت.[2]

---

[1] *Fifteenth quarterly report on the activities of the United Nations Monitoring, Verification and Inspection Commission in accordance with paragraph 12 of Security Council resolution 1284 (1999)*, UN document S/2003/1135, 26 November 2003, www.un.org.

[2] *Comprehensive report of the Special Advisor to the DCI on Iraq's WMD*, Central Intelligence Agency, 30 September 2004, www.cia.gov.

* له ١٥ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥دا، دەستووری هەمیشەیی عێراق له راپرسییەکی گشتیدا پەسەند دەکرێت. مادەی (٩)ی برگەی (هـ) دەڵێت، "حکومەتی عێراق رێز لەو پابەندبوونە نێودەوڵەتییانە دەگرێت که تایبەتن به نەهێشتن و بڵاوبوونەوە و گەشەکردن و بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی چەکی ناوکی و کیمیایی و بایۆلۆژی و جێبەجێیان دەکات و رێگە له هەر هەنگاوێک دەگرێت که پەیوەندیی به گەشەدان و دروستکردن و بەرهەمهێنان و بەکارهێنانیانەوە هەیە وەک ئامادەسازی و کەرەسە و تەکنۆلۆجیا و سیستەمی پەیوەندیکردن."[١]

* له ٢٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٧دا، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بریاری ١٧٦٢ پەسەند دەکات و بەپێی ئەم بریارە، "ئەنجوومەنی ئاسایش بریار دەدات دەستبەجێ کۆتایی بەو دەسەڵاتانە بهێنرێت که بەپێی بریارنامە پەیوەندیدارەکان درابوون به لیژنەی پشکنین و لیکۆڵینەوە و چاودێریکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNMOVIC) و ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی."[٢]

### ٧–٣ چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق

حکومەتی عێراق له ١١ی ئایاری ١٩٧٢دا، پەیماننامەی قەدەغەکردنی چەکە بایۆلۆجییەکانی واژۆ کردبوو،[٣] له ١٨ی نیسانی ١٩٩١دا، ناچار کرابوو ئەم پەیماننامەیە پەسەند بکات.[٤] رژێمی دیکتاتۆری بەعس، لەوەتەی له ساڵی ١٩٦٨ دەسەڵاتی عێراقی به دەستەوە گرتبوو، پابەند نەبووبوو بەو پەیماننامەیە و بەردەوام سەرگەرمی توێژینەوە و دروستکردن و عەمبارکردنی جۆرەها چەکی بایۆلۆجی بووە، بۆ ئەوەی دژی ئەو لایەنانەی که ئەو به دوژمنی

[1] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_1.pdf
[2] S/RES/1762 (2007), 29 June 2007, p. 2, www.un.org
[3] https://media.nti.org/pdfs/iraq_biological_[1].pdf
[4] UNSCOM: Chronology of Main Events, December 1999, www.un.org.

خۆی دەزانێت، هەڕەشەیان پێ بکات و بەکاریان بهێنێت و خۆی بەو چەکە بایۆلۆجییانە بکات بە ڕژێمێکی بەهەژموون لە ناوچەکەدا. عێراق لە جەنگی کەنداوی ساڵی ١٩٩١دا شکستی هێنا. لە ٣ی نیسانی ١٩٩١دا، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ٦٨٧ی دەرکرد و داوای لە عێراق دەکرد، بەبێ هیچ مەرجێک، هەموو چەکە نائاسایییەکانی لەناو ببات و هەروەها عێراق بەڵێن بدات کە ئەو جۆرە چەکانە، نە بەکار بهێنێت و نە پەرەیان پێ بدات، نە دروستیان بکات یان بە دەستیان بهێنێت.[1] عێراق لە ٦ی نیسانی ١٩٩١دا بڕیاری ٦٨٧ی قبووڵ کرد.[2] بەپێی بڕیاری ٦٨٧، نەتەوە یەکگرتووەکان چەند لیژنەیەکی دروست کرد بۆ پشکنین و دۆزینەوە و لەناوبردنی چەکە بایۆلۆجییەکان و دەزگا و کارگە و کەلوپەلی دروستکردنیان. بێگومان کاری لیژنەکان تاکو دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعسیش هەر بەردەوام بوو. لە کارەکانی ئەم لیژنانەدا دەرکەوت کە ڕژێمی بەعس بە نهێنی چەندین جۆر چەکی بایۆلۆجیی دروست کردووە و گەلێک جبەخانەی لەو چەکانە هەبووە و زۆر لەو چەکانەی لە لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان شاردبووەوە، بەڵام کە ڕووخا، بەشی هەرە زۆری ئەو چەکانە ئاشکرا بوون و لەناو بران. لێرەدا توانا بایۆلۆجییەکانی عێراق، کە دوای جەنگی کەنداو ئاشکرا بوو، دەخەینە ڕوو:

**هەندێک لە پسپۆڕە پێشەنگەکانی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق**

ئەوانەی خوارەوە هەندێک لەو پسپۆڕە عێراقییانەن کە لە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراقدا کاریان کردووە، ناوەکانیان بۆ لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاشکرا بووە و بە کورتی باسیان دەکەین، هەرچەندە زۆر لە پسپۆڕی تریش بەشدارییان لە

[1] U.N. Resolution 687.
[2] UNSCOM: Chronology of Main Events, December 1999, www.un.org.

بەرهەمهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکاندا کردووە، لەوانە، دکتۆر حازم عەلی و سامر عەبدولڕەحمان و دکتۆر ئەلمزیحی و هیی تریش، بەڵام زانیاریم دەربارەی ئەوانە دەست نەکەوت.

* ناسر ئەلهینداوی: زانایەکی عێراقییە و لە زانکۆی ئەلموستەنسیریە مامۆستا بووە، پسپۆڕە لە جەنگی بایۆلۆجی و بە باوکی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق دادەنرێت. ساڵی ۱۹۹۸ هەوڵی ئەوەی دا بە هەندێک بەڵگەنامەوە لە عێراق ڕابکات، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، لە لایەن ڕژێمەوە دەستگیر کرا و هەموو ئەو بەڵگانەی پێی بوون، ڕادەستی لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNSCOM) کران.[1]

* ڕیحاب ڕەشید تەها ئەلعەزاوی، پسپۆڕانی نەتەوە یەکگرتووەکان ناویان نابوو (دکتۆرە میکرۆب)، پسپۆڕێکی مایکرۆبایۆلۆجی بوو. ساڵی ۱۹۸٤ بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری تۆکسینی ڕووەک لە زانکۆی (East Anglia) لە بەریتانیا هێنابوو و لە بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراقیدا کاری دەکرد. لە ڕاپۆرتێکی ساڵی ۱۹۹۹ی سەرۆکایەتیی ئەرکانی سوپای ئەمەریکا و ئاژانسی هەواڵگریی بەرگری، وەک یەکێک لە مەترسیدارترین ژن لە جیهاندا باس کرابوو. ئەم ژنە ددانی بەوەدا نابوو کە هۆکارەکانی جەنگی میکرۆبی بەرهەم هێناوە، بەڵام لەناو براون. بە هۆی کارکردنی لە بواری چەکە بایۆلۆجییەکان، بە تایبەتی پەرەپێدانی چەکی پیسەکوان و بۆتولینوم، لە لایەن سەددامەوە خەڵات کرابوو.[2] دکتۆرە ڕیحاب سەرۆکی بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق بوو بۆ ماوەی ۷ ساڵ، تاکو ساڵی ۱۹۹۵. تیمەکەی دکتۆرە ڕیحاب ۱۹۰۰۰ لیتر تۆکسینی بۆتولینوم و ۲۰۰۰ لیتر ئەفلاتۆکسینی بەرهەم هێنابوو.[3]

---

[1] dition.cnn.com/WORLD/9803/25/iraq.hindawi/
[2] https://en.wikipedia.org/wiki/Rihab_Taha
[3] http://news.bbc.co.uk/2/hi/programmes/panorama/2734305.stm

* هـودا سـاڵح مەهـدی عەممـاش، زانـا و ئەکـادیمێکی عێـراقییە، هەندێک جار میدیا ئەمەریکی و ئینگلیزییەکان بە "خـاتوو پیسـەکوان" یان "سالی کیمیایی" ناویان دەبرد، چونکە وەک دەوترا، پەیوەندیی بە بەرنـامەی چەکـی بایۆلۆجییـەوە هەبـوو، لە ناوەڕاسـتی سـاڵانی ١٩٩٠ـەکان، دوای جەنگی کەنـداو، یـارمەتی بنیاتنـانەوەی بەرنـامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراقی دابوو. هودا بەکالۆریۆسـی لە زانکۆی بەغدا و ماسـتەری لە مایکرۆبـایۆلۆجی لە زانکـۆی Texas Woman's University لە تەکساس بە دەست هێنابوو. ساڵی ١٩٨٣ دکتۆرای لە مایکرۆبایۆلۆجی لە زانکۆی میسۆری (University of Missouri) لە ئەمەریکا بە دەست هێنابوو.[1]

**ئەو بەکتریا و ڤایرۆس و تۆکسینانەی عێراق دەیویست بیانکات بە چەکی بایۆلۆجی:**

بێگومان عێراق لە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکەیدا کاری لەسـەر چەندین بەکتریا و ڤایرۆس و تۆکسین دەکرد. هەندێک لەو بەکتریـا و ڤـایرۆس و تۆکسـینانە، لە ڕێـگەی زانکـۆ و پەیمانگـە و کۆمپانیـای دەرمـانی سـامەڕا و دامەزراوە زانسـتییەکان لە دەرەوە هـاوردەی دەکـردن. عێـراق لە ڕواڵەتـدا وای پیشـان دەدا کە ئەم بەکتریـا و ڤـایرۆس و تۆکسـینانە بـۆ تـوێژینەوەی زانسـتی سـوودیان لـێ وەردەگرێـت، بەڵام لە ڕاسـتیدا بـۆ ئەوە بـوون بیانکـات بە چەکـی بایۆلۆجی و جبەخانەیەکی لە چەکی بـایۆلۆجی هەبێت. ئەو بەکتریا و ڤـایرۆس و تۆکسـینانەی عێـراق کـاری لەسـەر دەکـردن و بەکـاری دەهێنان بۆ دروستکردنی چەکی بایۆلۆجی، ئەمانە بوون:

ا- بەکتریاکـان: پیسـەکوان (*Bacillus anthracis*)، کلۆسـتریدیوم بۆتولینـوم (*Clostridium botulinum*)، کلۆسـتریدیوم پێرفینجینـز (*Clostridium perfingenes*).

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Huda_Salih_Mahdi_Ammash

ب- ڤایرۆسەکان: ڕیخۆڵەڤایرۆس ١٧، ڕۆتاڤایرۆس، ڤایرۆسی ئاوڵەی وشتر، ڤایرۆسی خوێنبەربوونی لکێنەی چاو، ڤایرۆسی زەردەتا، ڤایرۆسی خوێنبەربوونی کۆنگۆ - کریمیان.

ج- تۆکسینەکان: تۆکسینی بۆتولینوم، ڕایسین، ئەفلاتۆکسین، کەڕووە تۆکسینەکان، تۆکسینی خەڵووزەی گەنم.[١،٢]

**شوێنە سەرەکییەکانی عێراق کە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییان تێدا جێبەجێ دەکرا:**

ئەو شوێنە سەرەکییانەی عێراق کە هەنگاوێک یان زیاتریان لە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانیان تێدا جێبەجێ دەکرا، ئەم شوێنانەی خوارەوە بوون:

١- سەلمان پاک، سەردەمێک ناوەندێکی سەرەکیی چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییەکانی عێراق بوو. شوێنی توێژینەوە و پەرەپێدان و بەرهەمهێنانی هۆکارە بایۆلۆجییەکان بوو.

٢- ئەلحەکەم، سەردەمێک پێشکەوتووترین و گەورەترین کارگەی بەرهەمهێنانی چەکە بایۆلۆجییەکان بوو، بەشێک بوو لە سەربازگەی گەورەی جورف ئەلسەخەر. شوێنی توێژینەوە، پەرەپێدان، بەرهەمهێنان و عەمبارکردنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان بوو.

٣- ئەلموثەننا، شوێنی توێژینەوە و پەرەپێدان و تێکردنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان لە چەکەکان بوو.

٤- فوزەیلییە (ئەلسەفا)، شوێنی توێژینەوە و پەرەپێدان و بەرهەمهێنانی هۆکاری بایۆلۆجی بوو.

٥- ئەلدۆرە (ئەلمەنال)، سەنتەری نەخۆشیی تەبەق بوو. کرابوو بە سەنتەری توێژینەوە و پەرەپێدان و بەرهەمهێنانی جەنگی بایۆلۆجیی ڤایرۆسی.

---

[1]https://en.wikipedia.org/wiki/Iraqi_biological_weapons_program#:~:text=After
[2]http://csis-website-prod.s3.amazonaws.com/s3fs-public/legacy_files/files/media/csis/pubs/iraq_bios.pdf

٦- ئەلریزوانییە، شوێنی عەمبارکردنی گەورەی چەکی بایۆلۆجی بوو، لە ساڵی ١٩٩١دا.

٧- شوێنەکانی دانانی کڵاوەکانی مووشەکەکانی ئەلحوسەین (بڵاوەپێکردنیان لەو شوێنانە):

ا- کەناری ڕووباری دیجلە. ب- تونێلی هێلی ئاسنی مەنسوورییە.

٨- شوێنی دانانی بۆمبە هەواییەکانی R400/ R400A:

ا- فرگەی ٣٧ (لێرەدا مەبەست لە فرگە، فڕۆکەخانەی بچووکی سەربازییە).

ب- ئەلعەزیزییە.

٩- ئەلکوت (کوت)، شوێنی دانانی تانکیی پرژاندنی فڕۆکەی میراجی ئێف-١ بوو لە فرگەی ئەبوعوبەیدە.

١٠- تووەیثە (سەنتەری تووێژینەوەی کشتوکاڵی و بایۆلۆجیی تووەیثە).[1]

هەروەها بەگوێرەی سەرچاوەیەکی تر، هەندێک شوێنی تریش بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراقیان تێدا جێبەجێ دەکرا:

١- دامەزراوەی ئەلتاجی.

٢- مەحمودییە، مەیدانی تاقیکردنەوە.

٣- جورف ئەلسەخەر، مەیدانی تاقیکردنەوە.

٤- بیابانی ئەلنیبا، شوێنی تاقیکردنەوە.

٥- فرگەی خان بەنی سەعد.[2]

---

[1] Comprehensive Report of special advisor to the Iraq's WMD, With Addendums, Volume III of III, Washington, 30th .Sept. 2004. P.123

[2] https://www.archives.gov/files/declassification/iscap/pdf/2014-011-doc02.pdf

بڕوانە وێنەی (٧–١).

وێنەی (٧–١): شوێنە سەرەکییەکانی پەیوەست بە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق لەسەر نەخشەی عێراق پیشان دراون.[1]

هەروەها لە ڕاپۆرتێکی ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندیی (CIA) ئەمەریکا کە لە ٢١ی نۆڤەمبەری ٢٠١٧ ئاشکرا کراوە، باسی ئەو شوێنانەی سەرەوە دەکات و وردتر کار و چالاکیی هەر یەکێک لەو شوێنانە دەخاتە ڕوو، بەگوێرەی ئەوەی کە عێراق ئاشکرای کردوون، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

---

[1] Comprehensive Report of special advisor to the Iraq's WMD, With Addendums, Volume III of III, Washington, 30th .Sept. 2004. P.123.

ا- ئەو دامەزراوە و دامودەزگــــا و شـــــوێنانەی تـــــوێژینەوە و پەرەپێدانی چەکە بایۆلۆجییەکانیان تێدا کراوە:

١- پەیمانگەی حەسەن ئیبن هەیسەم (١٩٧٤-١٩٧٨).

٢- زانکۆکان: زانکۆی بەغدا و موستەنسیرییە.

٣- دامەزراوەی گشتیی ئەلموثەننا: بەکتریاکان و تۆکسینەکان.

٤- سەلمان پاک: بەکتریاکان و تۆکسینەکان.

٤- ئەلمەنال: سەنتەری نەخۆشیی تەبەق و ڤاکسینەکان: ڤایرۆسەکان.

ب- ئەو دامەزراوە و دامودەزگـا و شـوێنانەی هۆکارەکـانی چەکە بایۆلۆجییەکانیان تێدا بەرهەم هێنراوە:

١- ئەلتاجی: تۆکسینی بۆتولینوم.

٢- سـەلمان پـاک: رایسـین، خەڵـووزەی گەنـم و لاسـاییکراوەکان (simulants). (مەبەسـت لە لاسـاییکراوەکان، ئەو ئاوێتە کیمیاییـانەن کە پێکهـاتە کیمیاییەکـان لە پێکهـاتی ژەهرێکـی بـایۆلۆجی نـزیکن، بەڵام ژەهر نین و بۆ توێژینەوە لەسەر کاری ژەهـرە بایۆلۆجییەکان لەسـەر لەشی گیانەوەران بەکار دەهێنرێن).

٣- ئەلسـەفا (سـەنتەری ئەلفوزەیلییەی تـوێژینەوەی کشـتوکاڵی و سەرچاوە ئاوییەکان): ئەفلاتۆکسین و خەڵووزەی گەنم.

٤- ئەلحەکەم: بەکتریای پیسەکوان (anthrax)، تۆکسـینی بۆتولینـوم و کلۆستریدیوم پێرفرینجنز.

٥- موسڵ: خەڵووزەی گەنم.

٦- ئەلمەنال: تۆکسینی بۆتولینوم.

ج- ئەو دامەزراوە و دامودەزگا و شوێنانەی چەکە بایۆلۆجییەکان و هۆیەکانی هاویشتن و بڵاوکردنەوەیانی تێدا تاقی کراوەتەوە:

١- نەهـــرەوان: لێکـۆڵینەوە لە تەقانــدنی ســـەرەتایی و بە زینـــدوویی مانەوەی هۆکارە بایۆلۆجییەکان.

٢- مەحموودییە: بۆمب و مووشەکی ١٢٢ میللیمەتر.

٣- جورف ئەلسەخەر: مەیدانی تاقیکردنەوەی، گوللەتۆپی ١٥٥ میللیمەتری.
٤- فرگەی خان بەنی سەعد: هێلیکۆپتەر.
٥- فرگەی ئەبوعوبەیدە؛ تانکیی ڕشتنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان.
د- شوێنی پڕکردنی چەکەکان لە هۆکارە بایۆلۆجییەکان:
١- دامەزراوەی گشتیی ئەلموثەننا: بۆمب، مووشەک و ئامادەکردنی کڵاوەی مووشەکەکان.
٢- ئەلحەکەم: بۆمب و مووشەک بۆ بەکارهێنانیان لە تاقیکردنەوەی مەیدانیدا.
٣- سەلمان پاک: بۆمب و گوللەتۆپ و مووشەک بۆ بەکارهێنانیان لە تاقیکردنەوەی مەیدانیدا.
هـ- ئەو شوێنانەی کە چەکە بایۆلۆجییەکانی تێدا هەڵگیرابوون:
١- ئەلعەزیزییە: بۆمبەکان.
٢- فرگەی بچووکی ٣٧ لە ئەلمەحموودییە: بۆمبەکان.
٣- تونێلی هێڵی ئاسنی ئەلمەنسوورییە: کڵاوەی مووشەکەکان.
٤- کەناری ڕووباری دیجلە: کڵاوەی مووشەکەکان.
و- شوێنی تێکشکاندن و لەناوبردن:
١- زەغاریت: ناچالاککردنی ئەو هۆکارە کیمیاییانەی لە کڵاوەی مووشەکاندا بوون.
٢- ئەلنبا (لە هەندێک سەرچاوەدا نووسراوە ئەلنیبا): لەناوبردنی کڵاوە مووشەکییەکان.
٣- ئەلعەزیزییە: لەناوبردنی بۆمبەکان.[1]

---

[1] https://www.archives.gov/files/declassification/iscap/pdf/2014-011-doc02.pdf
Iraq's biological warfare program: well positioned for the future

**بڕی ئەو بەکتریا و ڤایرۆس و تۆکسینانەی کە عێراق لە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکەیدا بەرهەمی هێناون و بڕی چەکە بایۆلۆجییەکانیشی**

ڕژێمی دیکتاتۆری سەددام هەمیشە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکانی بە نهێنی هێشتبووەوە، دوای جەنگی یەکەمی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١دا کە ئەم ڕژێمە شکستی هێنا، ناچار کرا بڕیاری ٦٨٧ی نەتەوە یەکگرتووەکان قبووڵ بکات و چەکە کۆکوژەکانی لەناو ببرێن. عێراق هەرگیز زانیاریی وردی دەربارەی چەکە کۆکوژەکانی، لەوانە، بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکەی، نەدابوو بە ئەو لیژنانەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە بەگوێرەی بڕیاری ٦٨٧، بۆ پشکنین و لەناوبردنی چەکە کۆکوژەکانی دروست بووبوون و زانیارییەکانی لەم لیژنانە دەشاردەوە، ئەوەیش بۆ ئەوەی هەندێک لەو چەکانە بۆ داهاتوو گل بداتەوە. لێرەدا، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی عێراق دەربارەی چەکە بایۆلۆجییەکانی بۆ لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئاشکرا کردوون و زانیارییەکانی لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و هەواڵگرییەکانی وڵاتانی زلهێز کە لە ڕاپۆرتەکانیاندا باسی چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراقیان کردووە، چەکە بایۆلۆجییەکانی عێراق دەخەینە ڕوو:

بەپێی ڕاپۆرتێکی سەنتەری لێکۆڵینەوە ستراتیجی و نێودەوڵەتییەکان، عێراق ددانی بەوەدا نابوو کە ئەو هۆکار و چەکە بایۆلۆجییانەی ئامادە کردبوون و هەیبوون:

* تەنها لە ساڵی ١٩٩٠دا، ٦٠٠٠ لیتر تۆکسینی بۆتولینومی خەست و ٨٤٢٥ لیتر لە بەکتریای پیسەکوانی لە دامەزراوەی ئەلحەکەم دروست کردووە.

* ٤٠٠ لیتر لە تۆکسینی بۆتولینومی خەست لە ئەلتاجی.
* ١٥٠ لیتر لە بەکتریای پیسەکوان لە سەلمان پاک.
* ١٨٥٠ لیتر لە ئەفلاتۆکسینی خەست لە ئەلفوزەیلییە.

* ١٦٦ بۆمبی پڕکراو لە بۆتولینوم.

* ٥٠ بۆمبی جۆری R400ی بەکتریای پیسەکوان تێکراو کە بە فڕۆکە ئاڕاستە دەکران.

* ١٠ کڵاوەی مووشەکی پڕکراو لە بەکتریای پیسەکوان بۆ مووشەکەکانی ئەلحوسەین.

* ١٦ کڵاوەی مووشەک کە ئەفلاتۆکسینیان تێ کرابوو. ئەفلاتۆکسین دەبێتە هۆی شێرپەنجە. ئەم کڵاوە مووشەکییانە بۆ مووشەکی جۆری سکاد (Scud) دروست کرابوون و لە ساڵی ١٩٩٠دا خرابوونە سەر مووشەکەکان، بۆ ئەگەری بەکارهێنانیان لە جەنگی کەنداودا.

* چەندین بۆمب و مووشەکی ١٢٢ میللیمەتر، کە پڕ کرابوون لە ١٠٠٠٠ لیتر لە تۆکسینی بۆتولینومی خەست و بە لایەنی کەمەوە لە ١٥٨٠ لیتر ئەفلاتۆکسینی خەست.

* چەندین تانکیی ڕشاندن یان پرژاندنی هۆکاری بایۆلۆجیی ئامادەکراو، بۆ ئەوەی بە هۆی هێلیکۆپتەر، فڕۆکەی جەنگی یان فڕۆکەی بێفڕۆکەوانەوە بەکاریان بهێنن.

* پەرەپێدانی فڕۆکەی ٢٠٠٠ لیتری یان تانکیی فڕێدانەخوارەوە کە بۆ بڵاوکردنەوەی بەکتریای پیسەکوان دروست کرابوون. لە کاتێکدا عێراق بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لە تاقیکردنەوەی ئەو تانکییانەدا بۆ پرژاندنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان سەرکەوتوو نەبووە، بەڵام عێراق ٣ لەو تانکییانەی هەڵگرتبوو کە لە حاڵەتی ئامادەکراودا بوون بۆ بەکارهێنانیان لە جەنگی کەنداودا.[1]

پشکنەران و چاودێریکەران و لێکۆڵەرانی لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕوایان بەو ڕاپۆرت و زانیارییانە نەبوو کە عێراق

---

[1] Cordesman, Anthony, H., Iraq past and Future Biological Capabilities, Center for Strategic and international Studies, Feb., 1998.

سەبارەت بە بەرنامەی چەکە بایۆلۆجییەکەی ئاشکرای دەکردن و دەیدا بە ئەوان.

بێگومان جبەخانەی چەکە بایۆلۆجییەکان و ئەو بڕە زۆرەی هۆکارە بایۆلۆجییەکان، کە لە چەند شوێنێک شارابوونەوە، لەناو نەبرابوون. دوو لە بەرپرسە گەورەکانی عێراق، بەرپرسیاریتیی ڕۆژانەی ئەم جبەخانە و هۆکارە بایۆلۆجییە شاراوانەیان لە ئەستۆدا بوو: دکتۆر بیلال بۆ بۆمب و مووشەکەکان، دکتۆرە ڕیحاب بۆ بڕە زۆرەکەی هۆکارە بایۆلۆجییەکان. دکتۆر بیلال عەمید بوو لە سوپای عێراق و ناوی تەواوی مەحمود فەرەج بیلال ئەلسامەڕائی بوو. بە گوتەی دکتۆر بیلال، جەنگی عێراق لەگەڵ ئێران، هاندەری چالاککردنەوەی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی عێراق بوو.[1]

هەروەها، ڕاگەیاندننامەیەکی عێراقی، دەربارەی ئاشکراکردنی ئەو بۆمبانەی هەیبووە، ئاماژەی بۆ ئەوانە کردبوو: ١٥٧ بۆمبی بایۆلۆجی (١٠٠ بۆمبی تۆکسینی بۆتولینوم، ٥٠ بۆمبی پیسەکوان و ٧ بۆمبی ئەفلاتۆکسین)، ٢٥ کڵاوەی بایۆلۆجیی مووشەکی ئەلحوسەین (٥ کڵاوەی پیسەکوان، ١٦ کڵاوەی تۆکسینی بۆتولینوم و ٤ کڵاوەی ئەفلاتۆکسین). لیژنەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNSCOM) و لیژنەی چاودێری و لێکۆڵینەوە و پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNMOVIC) و خودی عێراقییەکانیش، ئەم ژمارانەیان بە خەمڵاندنی نافەرمی دادەنا، چونکە بە بەڵگەنامە نەسەلمێنرابوون.

لیژنەی چاودێری و لێکۆڵینەوە و پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان، چاودێریی هەڵکۆڵینەکانی ئەلعەزیزییەیان کردبوو کە شوێنی لەناوبردنی بۆمبەکان بوو، بەڵگەی هەبوونی ١٠٤ بۆمبی R400یان بۆ ئاشکرا بووبوو، وێڕای ٢٤ بۆمبی R400ی تریش کە بە سەرپەرشتیی خۆیان لەو شوێنە دەرهێنرابوون. لە ئەنجامدا، لیژنەی

[1] Comprehensive Report of special advisor to the Iraq's WMD, With Addendums, Volume III of III, Washington, 30th .Sept. 2004. P.123.

چاودێری و لێکۆڵینەوە و پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان وایان دانا کە ١٢٨ بۆمبی R400 لە ئەلعەزیزییە هەبوون.[١] لێرەدا، لە جیاوازیی نێـوان ١٥٧ و ١٢٨، دەردەکەوێـت کە ٢٩ بـۆمبی R400ـەکە دیـار نەمابوون.

عێـراق لە ئایـاری ١٩٩٢ تـاکو سـێپتەمبەری ١٩٩٧، پێـنج "ڕاگەیاندننامەی دووروودرێژ و کۆتایی و تەواو" (FFCD)ی دەربارەی بەرنـامەی چەکە بـایۆلۆجییەکەی پێشـکەش بە لیژنەکـانی نەتەوە یەکگرتووەکـان کردبـوو. عێـراق بە مەبەسـت زانیـاریی هەڵە و نادروستی تێکەڵ بە زانیارییەکانی ناو ڕاگەیاندننامەکانی کردبوو، بۆ ئەوەی بتوانێـت زۆر زانیـاری دەربـارەی بەرنـامەی چەکە بـایۆلۆجییەکەی لە لیژنەکـانی نەتەوە یەکگرتووەکـان بشـارێتەوە و هەندێک کەلوپەل و ئامێر و دەزگا و بۆمب و مووشـەکی بایۆلۆجی و هۆکـارە بایۆلۆجییەکـان بـۆ داهـاتوو هەڵبگرێـت و ئەو لیژنـانە پێـی نەزانـن، بەڵام لیژنەکـانی UNSCOM و UNMOVIC هەمـوو جارێـک، دوای ئەوەی پشـکنینی مەیـدانییان لە عێراقـدا دەکـرد و زانیارییـان لە سـەرچاوەی تـرەوە دەسـت دەکەوت، زانیـارییە هەڵە و نادروست و دژبەیەکەکانیان لە ڕاگەیاندننامەکانی عێراقدا بۆ ئاشکرا دەبوو، لەبەر ئەوە، ئەو لیژنانە هەرگیز بڕوایان بە ڕاگەیاندننامەکانی عێراق نەبوو.[٢]

هەروەها عێراق زانیاریی نادروست و نـاورد و دژبەیەکی لە نـاو ڕاگەیاندننامەکانیـدا، دەربـارەی ئاشـکراکردنی بـڕی ئەو هۆکـارە بایۆلۆجییانەی کە بەرهەمی هێنابوون، بەکاری هێنـابوون یـان لەنـاوی بردبـوون، دەدا بە لیژنەکـانی نەتەوە یەکگرتووەکـان. عێـراق بـڕی

[1] Comprehensive Report of special advisor to the Iraq's WMD, With Addendums, Volume III of III, Washington, 30th .Sept. 2004. p. 167.

[2] https://www.un.org/Depts/unscom/s99–94.htm. Report of the UNSCOM and UNMOVIC to the United Nations, 280 pages, pp.186–188.

هۆکارە بایۆلۆجییەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە بە لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕاگەیاندبوو:

* **تۆکسینی بۆتولینوم**

١٩١٨٠ لیتر تۆکسینی بۆتولینومی بەرهەمهێنراو کە ١٠ بۆ ٢٠ ئەوەندە خەست کرابووەوە.

ئەو بڕانەشی لە تۆکسینی بۆتولینومەکە بەکار هێنابوو:

١٠٨٢٠ لیتری بۆ پڕکردنی ١٠٠ بۆمبی R400 (کە هەر بۆمبێک ٨٥ لیتری تێ کرابوو) و ١٦ کڵاوەی مووشەکی ئەحوسەین (کە هەر کڵاوەیەک ١٤٥ لیتری تێ کرابوو).

٤٩٩ – ٥٦٩ لیتری بۆ تاقیکردنەوەی مەیدانی بەکار هێنابوو (ژمارەی تاقیکردنەوەکان پشتڕاست نەکرابوونەوە).

١١٨ لیتر لە کاتی بەکارهێناندا بە فیڕۆ درابوو.

٧٦٦٥ یان ٧٧٣٥ لیتر لەناو برابوو (عێراق لەناوی بردبوو).

* **سپۆری پیسەکوان**

٨٤٤٥ لیتر سپۆری پیسەکوانی بەرهەمهاتوو، کە دە ئەوەندە خەست کرابووەوە.

٥٢,٥ لیتر سپۆری بە فیڕۆ درابوو.

٣٤١٢ لیتر سپۆر لەناو برابوو (عێراق لەناوی بردبوو).

* **ئەفلاتۆکسین**

٢٢٠٠ لیتر ئەفلاتۆکسین بەرهەم هێنرابوو.

١١٢٠ لیتر لە ئەفلاتۆکسین بەکار هێنرابوو، بۆ پڕکردنی ٧ بۆمبی R400 (هەر بۆمبێک ٨٠ لیتری تێ کرابوو) و ٤ کڵاوەی مووشەکی ئەلحوسەین (هەر کڵاوەیەک ١٤٠ لیتری تێ کرابوو).

٢٣١ – ٣٠١ لیتر ئەفلاتۆکسین بۆ تاقیکردنەوە بەکار هێنرابوو.

٣٠,٥ لیتر ئەفلاتۆکسین بە فیڕۆ درابوو.

٩٠٠ یان ٩٧٠ لیتر ئەفلاتۆکسین لەناو برابوو (عێراق لەناوی بردبوو).

*** کلۆستریدیوم پێرفرینجنز**

٣٤٠ لیتر کلۆستریدیوم پێرفرینجنز بەرهەم هێنرابوو.

٣٣٨ لیتر کلۆستریدیوم پێرفرینجنز لەناو برابوو (عێراق لەناوی بردبوو).

*** رایسین**

١٠ لیتر رایسین بەرهەم هێنرابوو.

١٠ لیتر رایسین لەناو برابوو (عێراق لەناوی بردبوو).

بێگومان پسپۆڕانی لیژنەکانی UNSCOM و UNMOVIC لە سەرجەم ئەم ژمارانەی عێراق بەگومان بوون، چونکە عێراق بەڵگەنامەی پێویستی سەبارەت بەم ژمارانە پیشانی ئەم لیژنانە نەدابوو. لیژنەکان لەو بڕوایەدا بوون کە عێراق ژمارەکانی بە جۆرێک رێک خستبوو کە لەگەڵ ئەوانەی پێشتر ئاشکرای کردبوون، بێنەوە.[١]

---

[1] https://www.un.org/Depts/unscom/s99–94.htm. Report of the UNSCOM and UNMOVIC to the United Nations, 280 pages, pp. 129–133.

له ڕابوردوودا، هەندێک ڕژێم لە جیهاندا بە شێوەیەکی بێبەزەییانە و دڕندانە چەکی بایۆلۆجی یان کیمیایی یاخود هەردووکیان لەسەر مرۆڤ تاقی کردووەتەوە و مافی مرۆڤیان پێشێل کردووە. نموونەی هەندێک ڕژێم کە لە ڕابوردوودا، دوور لە هەموو ویژدانێکی مرۆڤایەتی، ئەم چەکانەیان لەسەر هەزاران مرۆڤ تاقی کردووەتەوە: ژاپۆنییەکان، لەو ماوەیەی چینیان داگیر کردبوو لە پێش جەنگی دووەمی جیهان و لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، چەکی بایۆلۆجی و کیمیاییان لەسەر هاوولاتیانی سیڤیلی چینی و دیلەکانی جەنگ لە چینی و کۆری و ئەمەریکییەکان تاقی کردبووەوە. ڕژێمی نازی، لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، چەکی بایۆلۆجی و کیمیاییان لەسەر جوولەکەکان و ئەوانەی بە ڕەگەز ئاری نەبوون، تاقی کردبووەوە. ڕژێمی باشووری ئەفریقا چەکی بایۆلۆجیی لەسەر ڕەشپێستەکان تاقی کردبووەوە. ڕژێمی دیکتاتۆری سەددامیش چەکی بایۆلۆجی و کیمیایی لەسەر کوردە فەیلییەکان و وەک دەڵێن بارزانییەکان و کوردانی تر و زیندانیانی سیاسی و دیلەکانی جەنگی ئێران – عێراق تاقی کردبووەوە. لەوانەیە زۆر ڕژێمی تریش لە جیهاندا ئەنجامیان دابێت، بەڵام بە نهێنی بووە و لەسەر ئاستێکی بەرفراوان نەبووە، دەشێت تاکو ئێستا ئاشکرا نەبووبن. لەم بەشەدا، باسی ئەزموونی نامرۆڤانەی سێ ڕژێم لە بواری تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر مرۆڤ دەکەین. لێرەوە، باسی هەندێک لە کردارە نامرۆڤایەتییەکانی سێ ڕژێم دەکەین کە لە ڕابوردوودا چەکە بایۆلۆجییەکانیان لەسەر مرۆڤ تاقی کردووەتەوە.

## ٨–١ ژاپۆن و تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆجی لەسەر مرۆڤ

لە ماوەی نێوان سالانی ١٩٣٠یەکان و سەرەتای سالانی ١٩٤٠ـەکان کە ژاپۆن زۆرینەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیای داگیر کردبوو، بۆ ماوەی ١٣ سال حوکمڕانییەکی ئەوپەڕی دڕندانەی ئەم ناوچەیەی کرد و کوژران یان بریندااربوونی ملیۆنان ئاسیایی لێ کەوتەوە. هیچ شوێنێکی جیهان ئەوەندەی چین مردن و وێرانبوونی بە خۆیەوە نەدیبوو. لەو هەموو جۆرە ئەشکەنجەدانە زالمانەی کە سەربازە ژاپۆنییەکان دەرهەق بە خەلکی چین دەیانکرد، لەوانەیە هیچ لەو ئەشکەنجەدانانە، لەو تاقیکردنەوانەی چەکە بایۆلۆجییەکان کە سەربازە ژاپۆنییەکان لەسەر خەلکی مەنشووریا (Manchuria) لە سالی ١٩٣٢ تاکو سالی ١٩٤٥ دەیانکرد و ئەو تاقیکردنەوە مەیدانییانەی چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییەکان کە لە سەرتاپای ڕۆژهەلات و ناوەڕاستی چین لەسەر دانیشتوان دەکران، نامرۆڤانەتر نەبووبن. بە لایەنی کەمەوە، ١٠٠٠٠ کەس بە هۆی تاقیکردنەوە قێزەونەکانەوە کوژران، زۆر لەوانە هاوولاتیی سیڤیل یان سەربازی چینی بوون، لەژێر چاودێریی وردی زانا ژاپۆنییەکاندا بە دەست ئازارێکی زۆر و مردنی لەسەرخۆوە دەیانناڵاند. ئەو زانا ژاپۆنییانە مرۆڤی چینییان وەک مشکی تاقیگە بۆ تاقیکردنەوەکانیان بەکار دەهێنا، ژمارەیەکی زۆر لە ڤایرۆس و ڕیکێتسیا و کەڕوویان بە شێوەیەکی سەرجێیی (clinical) لە جەستەی مرۆڤەکاندا تاقی دەکردەوە و کاریگەرییەکانی ئەو نەخۆشخەرانەیان لەسەر مرۆڤەکان بە وردی دەپێوا و تۆمار دەکرد. پزیشکەکانی سوپای ژاپۆن و هاوکارەکانیان، بە پەرۆشی و وزەیەکی ئەوپەڕی زۆرەوە، خۆیان بۆ ئەو کارانەی سەبارەت بەو تاقیکردنەوانەی پێیان سپێرابوو، تەرخان کردبوو.

ئەوەی ژاپۆنییەکانی هان دا بۆ بەدەستهێنان و پەرەپێدانی چەکی بایۆلۆجی و بۆ باڵادەستبوونی ژاپۆن لە چەکی بایۆلۆجیدا، سێ هۆکار بوون:

١- ژاپۆنییەکان وڵاتەکەی خۆیان بە وڵاتێکی هەژار دەزانی.

٢- ژمارەی دانیشتوانی ژاپۆن لەچاو ژمارەی دانیشتوانی وڵاتە ڕکابەرە سەرەکییەکانی ژاپۆن، وەک چین و یەکێتیی سۆڤییەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، زۆر کەم بوو.

٣- سامانە سروشتییەکانی وڵاتی ژاپۆن ئەوپەڕی سنووردار بوون.

ژاپۆنییەکان وایان بیر دەکردەوە بە باڵادەستبوونی ژاپۆن لە چەکی بایۆلۆجیدا، ژاپۆن دەتوانێت چارەنووسی خۆی بە ڕوونی دیاری بکات و هەژموونیشی بەسەر ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا هەبێت. بەڵام هیچ لەوانە پاساو نین بۆ تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆجی لەسەر مرۆڤ، کە کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم) لە ساڵی ١٩٢٥ـەوە چەکی کیمیایی و ڕێگەکانی بەکارهێنانی بەکتریای لە جەنگدا قەدەغە کردبوو.

لە ١٨ی سێپتەمبەری ١٩٣١دا، سوپای ژاپۆن دەستی بەسەر هەموو مەنشووریادا گرت و سوپای ژاپۆن تێیدا باڵادەست بوو، ئەمەش ڕێخۆشکەر بوو بۆ سوپای ژاپۆن بۆ دامەزراندنی گەلێک تاقیگەی تاقیکردنەوەی جەنگی بایۆلۆجی لەو ناوچە دوورەدەستەی جیهان. ئەوەی زۆر بەرپرسیار بوو لە گۆڕینی مەنشووریا بۆ تاقیگەیەکی گەورەی جەنگی بایۆلۆجی، پرۆفیسۆر شیرۆ ئیشی (Shiro Ishii) بوو. شیرۆ ئیشی دکتۆرێکی لاوی سوپای ژاپۆنی بوو، پسپۆڕیی لە بەکتریاناسی و پەرەپێدانی زەرداو (serum) و خۆپاراستن لە پەتاکان بە دەست هێنابوو. ساڵی ١٩٣٢ لە سوپای کوانتونگ ئارمی (Kuwantung Army) دامەزرا. سوپای کوانتونگ ئارمی گەورەترین گرووپی سوپا بوو لە سوپای ئیمپراتۆرییەتی

ژاپۆن، دەستی بەسەر مەنشووریادا گرتبوو و دەوڵەتێکی کارتۆنیی سەر بە ژاپۆنی لە مەنشووریا دامەزراندبوو. شیرۆ ئیشی، لە ساڵانی ١٩٢٨–١٩٣٠ کە لە خولێکی خوێندن بوو لە ئەورووپا، بیرۆکەیەک مێشکی پڕ کردبوو، ئەوەیش ئەوە بوو دەبێت جەنگی بایۆلۆجی توانساگەلێکی جیاوازی هەبێت، ئەگەر نا، لە لایەن کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە قەدەغە نەدەکرا.

شیرۆ ئیشی، دوای ئەوەی ساڵی ١٩٣٢ لە شاری هاربین لە مەنشووریا دامەزرا، دەستبەجێ دەستی کرد بە جێبەجێکردنی ئەو پلانە گەورەیەی لە مێشکیدا بوو کە دروستکردنی چەکی بایۆلۆجی بوو. دواتر لە ساڵی ١٩٣٥دا، شیرۆ ئیشی هەموو دەسەڵاتێکی ڕەهای پێ درابوو، دەستکراوە بوو لەوەی لە مەنشووریا چیی بوێت بیکات بەبێ لێپرسینەوە، لەپێناو پەرەپێدانی چەکی بایۆلۆجیدا. لە ماوەی دە ساڵدا، ١٩٣٥–١٩٤٥، شێرۆ ئیشی تیمەکانی بە ناو مەنشووریادا بڵاو کردبووەوە، زۆر جاریش بە ناوەڕاستی چین و ڕۆژهەڵاتی چیندا دەسووڕانەوە. سوپای کوانتونگ ئارمی، بودجە و کەرەستەکانی توێژینەوەی بۆ شیرۆ ئیشی دابین دەکرد.

ژاپۆنییەکان ئەو کەسانەی دەستگیریان دەکردن و تاقیکردنەوەی بایۆلۆجییان لەسەر دەکردن، بە کۆلکەدار (کۆتەرەدار) ناویان دەبردن.

شیرۆ ئیشی کۆمەڵە خانوویەکی لە پینگ فان (Ping Fan) دروست کردبوو کە ژمارەیان نزیکەی ٥٠ خانوو دەبوو، ئەم خانوانە کرابوون بە گەلێک تاقیگە و سەربازگە و گەنجینە تا دەگاتە گەلێک گەوری ئاژەڵ. یەکێک لە خانووەکان کرابوو بە زیندان و وا دروست کرابوو کە جێگەی ٨٠ بۆ ١٢٠ زیندانی یان زیاتری تێدا ببێتەوە. هێڵێکی شەمەندەفەر ڕاستەوخۆ لە شاری هاربین بۆ دامەزراوەی پینگ فان ڕاکێشرابوو. ئەو زیندانییانەی کە دەبوو تاقیکردنەوەیان لەسەر بکرێت، بە شەو بە شەمەندەفەر لە هاربینەوە بە ناوی کۆلکەداری ڕاستەقینەوە دەگوێزرانەوە بۆ ئەم کەمپە. ئەم کەمپە،

شوێنی سووتاندنی لاشەی مرۆڤە مردووەکان و کەلاکی ئاژەڵەکانی لێ بوو، کە شیرۆ ئیشی تاقیکردنەوەی لەسەر دەکردن. هەموو ئەو تاقمانەی لە کەمپی پینگ فان کاریان دەکرد، لە یەکەی سەربازیی ٧٣١ تۆمار کرابوون. ئەم کەمپە تاقمێکی کارکردنی نزیکەی ٣٠٠٠ کەسیی تێدا بوو. نزیکەی ٢٠٠٠ تەکنیککار و سەرباز و زانا و پاسەوان لەژێر فەرمانی شیرۆ ئیشیدا بوون و لە ٦ سەنتەری توێژینەوە جێگیر کرابوون و ئەو سەنتەرانە لەژێر کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی ئیشیدا بوون. شیرۆ ئیشی لە کەمپی پینگ فان، هەموو چالاکییەکانی توێژینەوەکەی کردبوو بە چوار بەشی سەرەکییەوە: بەشی توێژینەوەکانی بەرگریزانی (نەخۆشییەکانی گرانەتا، سکچوونی خوێنی، پیسەکوان، ماشەرە، ڤایرۆسەکان و ڕیکێتسیا)، بەشی توێژینەوەی درمە دەردزانی، بەشی دابینکردنی ئاو و پاکژکردنەوەی، بەشی بەرهەمهێنانی ڤاکسین. سەرەڕای ئەوانەی سەرەوە، هەر لە سەرەتاوە چالاکییەکانی جەنگی بایۆلۆجیی نهێنی لە یەکەی ٧٣١ دەکران. ئەم توێژینەوە نهێنییانە دوو مەبەستیان لە خۆ دەگرت: ١- ڕێگەکانی چاندن (culture)ی هۆکارەکانی جەنگی بایۆلۆجی ٢- ڕێگەکانی بڵاوکردنەوەیان. شیرۆ ئیشی و هاوکارانی لەژێر ناوی "توێژینەوەی بەرگرییانە" ڤاکسینیان بۆ ١٨ جۆر نەخۆشی بەرهەم هێنابوو.

مرۆڤ وەک ئاژەڵ بۆ تاقیکردنەوە لەسەریان بەکار دەهێنران. دوانزە تاقیکردنەوەی مەیدانی بە چەکی بەکتریایی لەسەر سەربازە دیلە چینییەکان و دانیشتوانە سیڤیلە چینییەکان دەکرا. تاقیکردنەوەی مەیدانی بە بۆمبی هەوایی لەسەر مرۆڤ و ئاژەڵ دەکران. لەم تاقیکردنەوانەدا مرۆڤەکانیان بە چەند ستوونێکەوە دەبەستەوە، کڵاوی زرێیان لەسەر دەکردن و بە قەڵغان لەشیان دادەپۆشین، ئینجا بۆمبی میکرۆبییان بەسەردا بەردەدانەوە. ڕژێمی دیکتاتۆری سەددام هەمان بیرۆکەی لەسەر دیلەکانی جەنگی ئێران - عێراق تاقی کردبووەوە.

هەروەها ژاپۆنییەکان بۆمبی تاعوونیشیان لەسەر مرۆڤ تاقی کردبووەوە. لە قۆناغە سەرەتاییەکانی کارەکان لە کەمپی پینگ فان، یەکەی ٧٣١، تاقیکردنەوەی نەخۆشخەرەکانی سیل، دەردەکۆپان، گازەگانگرین، تولاریمیا، ئەنفلونزا و تای شەپۆلداری لەسەر دیلەکان یان گیراوەکان دەکرد.

لە ٨ی ئابی ١٩٤٥ کە ڕووسیا جەنگی دژی ژاپۆن ڕاگەیاند، سوپای ڕووسیا بە لێشاو بە سنووری سیبیریادا بەرەو مەنشووریا پێشڕەوییان کرد. شیرۆ ئیشی زانیی کە هێزەکانی ڕووسیا لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، ئەگەر لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا نەبێت، دەگەنە کەمپی پینگ فان. شیرۆ ئیشی فەرمانی بۆ یەکەی ٧٣١ دەرکرد کە هەموو زیندانییەکانی ناو کەمپەکە بکوژن، هەموو کەلوپەلەکان لەناو ببەن و خانووەکانیش برووخێنن. ئیشی لەگەڵ تاقمەکەی هەڵاتن بۆ کۆریا، دواتر گەیشتنەوە ژاپۆن. بێگومان خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆن لە جەنگی دووەمی جیهاندا، لە ٢ی سێپتەمبەری ساڵی ١٩٤٥ بوو.[1]

لە ڕاستیدا، چەند کەمپێکی تاقیکردنەوەی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی لە سەر خاکی مەنشووریا هەبوون کە چەند یەکەیەکی سەربازی ئەم کەمپانەیان دەپاراست، لەوانە، یەکەی ٧٣١، یەکەی ١٠٠، یەکەی ١٦٤٤، یەکەی ٥٦٥، یەکەی ٢٦٤٦. ئەمانە بە کارگەکانی مەرگ ناو دەبران. ساڵی ١٩٣٠، ژمارەی دانیشتوانی مەنشووریا بە ئاستەم دەگەیشتە ٣٠ ملیۆن کەس.

شیرۆ ئیشی تاقیکردنەوەی لەسەر سێ نەخۆشخەر دەکرد: تاعوون، پیسەکوان، مقاو. زۆر لەو کەسانەی تاقیکردنەوەیان لەسەر دەکرا، کە بە هۆکارە نەخۆشخەرەکە بێهۆش دەبوون، بە زیندوویی توێکارییان لەسەر دەکرا.

---

[1] Harris, Sheldon, Japanese Biological Warfare Experiments and Other Atrocities in Manchuria, 1932–1945, and the Subsequent United States Cover up: A Preliminary Assessment, Crime, Law and Social Change, 15: 179– 199, 1991.

هۆکاری کیمیایی وەک گازی فۆسجین، ڤی ئێکس، کارەبالێدان لەسەر دیل و گیراوەکان تاقی دەکرانەوە. مرۆڤیان لە ناو ئامێر یان ژووری ساردکردنەوەدا دادەنا تاکو دەیبەست، ئینجا لە ڕێی توێکارییەوە، کاریگەریی سەرمایان لەسەر ئەندامەکان دەخوێند. زیندانییان بە تەوردان لە سەری دەکوشت و یەکسەر مێشکەکەیان دەردەهێنا و تاقیکردنەوەیان لەسەر دەکرد.

لە کەمپی یەکەی ٧٣١، ٣٠٠٠ کەس کوژرابوون. لە کەمپەکانی تر، جگە لەوەی شیرۆ ئیشی، بە لایەنی کەمەوە ٥٠٠٠ بۆ ٦٠٠٠ کەس کوژرابوون.

ساڵی ١٩٤٧، کە ژاپۆنییەکان تاعوونیان لە ناوچەکەدا بڵاو کردەوە، مردنی ٣٠٠٠٠ کەسی لێ کەوتەوە. ساڵی ١٩٤٨، ٦٠٠٠٠ کەس بە تاعوون مردن. ئەم بڵاوبوونەوانەش بە هۆی ئەوەوە بوو کاتێک ژاپۆنییەکان کەمپەکانیان لە ساڵی ١٩٤٥دا چۆڵ کردبوو، ١٠٠٠ ئاژەڵی تووشبوو بە تاعوونیان بەڕەڵا کردبوو و بە ناوچەکەدا بڵاو ببوونەوە.[1]

ئەوانەی تاقیکردنەوەیان لەسەر دەکرا، ئەمانە بوون:

**یەکەم**، زیندانییەکان، ئەوانە دەرزیی نەخۆشخەریان لێ دەدرا و ژاپۆنییەکان وایان نیشان دەدا کە ڤاکسینیان لێ دەدەن. زیندانییە نێر و مێیەکان تووشی نەخۆشییەکانی ئاتەشەک (syphilis) و سووزەنەک دەکران، ئینجا زیندانییە تووشبووەکان ناچار دەکران سێکس لەگەڵ زیندانە ساغەکان بکەن، بۆ ئەوەی بزانرێت چۆن ئەم نەخۆشییانە لە نێوان مرۆڤەکاندا دەگوازرێنەوە.

**دووەم**، هەزاران پیاو و ژن و منداڵ و منداڵی شیرەخۆرە دەستگیر دەکران و لە کەمپەکانی جەنگ زیندانی دەکران، ئەوانە بە زیندوویی تاقیکردنەوەیان (توێکارییان) لەسەر دەکرا، بەبێ ئەوەی

---

[1] Harris, H. Sheldon, Factories of Death, Routledge, London, 1994, pp. 22--67.

بێهۆش بکرێن، بە شێوەیەکی ئاسایی توێکارییەکە کۆتایی بە ژیانیان دەهێنا. زیندانییەکان دوای ئەوەی تووشی نەخۆشییەک دەکران، توێکارییان لەسەر دەکرا یان ئەندامێکی جەستەی زیندانییە نەخۆشەکەیان (وەک پەلێک، گەدە، گورچیلە یان جگەر) لێ دەکردەوە بۆ ئەوەی کاریگەرییەکانی نەخۆشییەکە لەسەر جەستەکەی بزانن. جار هەبووە گەدە یان سوورێنچکی نەخۆشێکیان لێ کردووەتەوە و بە ڕێخۆڵەیانەوە نووساندووەتەوە.

یەکەی ٧٣١ و ئەو یەکانەی سەر بە ئەو بوون، وەک یەکەکانی ١٦٤٤ و ١٠٠، بە درێژایی ماوەی جەنگی دووەمی جیهان، بەشدارییان لە توێژینەوە و پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی ئەزموونیی ئەو چەکە بایۆلۆجییانەی کە پەتا بڵاو دەکەنەوە، لەسەر دانیشتوانی چین (سەرباز و سیڤیل) دەکرد.

یەکەی ٧٣١ و یەکەی ١٦٤٤، لە ساڵانی ١٩٤٠ و ١٩٤١دا، بە فڕۆکە کێچی هەڵگری نەخۆشیی تاعوونیان بە شارەکانی چیندا بڵاو دەکردەوە. ئەم بڵاوکردنەوانە کوشتنی دەیان هەزار چینیی بە نەخۆشیی تاعوون لێ کەوتەوە. هەندێک مەفرەزەی ژاپۆنی میکرۆبەکانی گرانەتا (تیفۆئید) و پاراتیفۆئیدیان لە ناو بیرەکانی ئاو و زەلکاو و ماڵەکانی شاری نانکینگ بڵاو کردەوە، وێڕای ئەوەش، میکرۆبەکانی گرانەتا و پاراتفۆئیدیان لە گەڵێک سووکەژەم کردبوو و بەسەر دانیشتوانی شارەکەدا دابەشیان کردبوو. دوای ماوەیەکی کورت، پەتا لە ناو دانیشتوانی شارەکەدا بڵاو بووەوە، ئەمەش بوو بە مایەی دڵخۆشیی زۆر لە توێژەرە ژاپۆنییەکان، چونکە بۆیان دەرکەوت کە میکرۆبی پاراتیفۆئید نەخۆشخەرێکی ئەوپەڕی کاریگەرە.

بە لایەنی کەمەوە، دوانزە تاقیکردنەوەی مەیدانیی بەرفراوان بە چەکە بایۆلۆجییەکان لە مەنشووریا جێبەجێ کرابوون. هەروەها هێرش بە هۆکارە بایۆلۆجییەکان، بە لایەنی کەمەوە بۆ سەر ١١

شاری چینییەکان کرابوون. هێرشێک بە چەکی بایۆلۆجی بۆ سەر شاری چانگدا، نزیکەی ١٠٠٠٠ تووشبووی چەکی بایۆلۆجی و ١٧٠٠ کوژراوی لە هێزەکانی چینی کە باش ئامادەنە کرابوون بۆ شەڕ، لێ کەوتەوە. زۆرینەی حاڵەتەکان بە هۆی نەخۆشیی کۆلێراوە بوون. توێژەرە ژاپۆنییەکان نەخۆشییەکانی وەک تاعوون، کۆلێرا، پیسەکوان و بۆتولیزم و نەخۆشیی تریان لەسەر زیندانییەکان تاقی دەکردەوە. ئەم توێژینەوانە پێشخستنی بۆمبی بەکتریای گەلاوەرێن و بۆمبی کێچیان، کە بۆ بڵاوکردنەوەی نەخۆشیی تاعوون بەکار دەهێنرا، لێ کەوتەوە. هەندێک لەو بۆمبانە قاوغەکانیان لە فەخفووری دروست کرابوون، چونکە ئەو قاوغانە بە ئاسانی دەشکان و کێچەکانیان بڵاو دەکردەوە.

ئەم بۆمبایانە وایان لە سەربازانی ژاپۆنی کرد بتوانن چەندین هێرش بە چەکە بایۆلۆجییەکان بکەن و کشتوکاڵ، سەرچاوەی ئاو، بیری ئاو و شوێنی تریش بە پیسەکوان، کێچی هەڵگری تاعوون، نەخۆشخەری گرانەتا و دیزانتری و کۆلێرا و نەخۆشخەری تری کوشندە پیس بکەن. بۆمبە پڕکراوەکان لە کێچی هەڵگری تاعوون، جلوبەرگ و خۆراکی پیسکراو بە نەخۆشخەرەکان، بەسەر ئامانجی جۆراوجۆردا بەردەدرانەوە. مەزەندە دەکرێت کە نەخۆشیی کۆلێرا و پیسەکوان و تاعوون کە لە ئەنجامی بەردانەوەی ئەم بۆمبانەدا بڵاو دەبوونەوە، بە لایەنی کەمەوە ٤٠٠٠٠٠ هاووڵاتیی سیڤیلی چینییان کوشتبێت. هەروەها ژاپۆنییەکان نەخۆشیی تولاریمیایان لەسەر هاووڵاتییە چینییە سیڤیلەکان تاقی کردبووەوە.

ساڵی ٢٠٠٢، لە چانگدا لە چین، شوێنی بۆمببارانکردن بە بۆمبی پڕ لە کێچی هەڵگری نەخۆشیی تاعوون، کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی لەسەر تاوانەکانی جەنگی بەکتریایی بەسترا. لەم کۆنفرانسەدا، ژمارەی ئەوانەی کە بە چەکی بایۆلۆجیی سوپای ئیمپراتۆرییەتی ژاپۆنی و بە تاقیکردنەوەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان لە چین

کوژرابوون، به ۵۸۰۰۰۰ کەس مەزەندە کرا. مێژوونووسی ئەمەریکی، شیلدۆن ئیچ. هاریس، دەڵێت زیاتر لە ۲۰۰۰۰۰ کەس کوژراون. وێڕای کوژراوە چینییەکان، ۱۷۰۰ سەربازی ژاپۆنی لە تشیجیانگ بە چەکە بایۆلۆجییەکانی خۆیان کوژرابوون، کاتێک چەکە بایۆلۆجییەکانیان لەو ناوچەیە بڵاو کردبووەوە.

تەنها لە کەمپی پینگ فان کە یەکەی ۷۳۱ی لێ بوو و شوێنی سەرەکیی تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆجی لەسەر مرۆڤ بوو، بە لایەنی کەمەوە، تاقیکردنەوە لەسەر ۳۰۰۰ پیاو و ژن و منداڵی چینی کرابوو، کە ساڵانە ٦۰۰ کەس لەوانە لە لایەن پۆلیسی سەربازیی ژاپۆنییەوە دەستگیر دەکران و ڕەوانەی ئەم کەمپە دەکران، بێگومان ئەم ژمارانە، ژمارەی ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە لە کەمپەکانی تر، وەک یەکەی ۱۰۰، تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆجییان لەسەر دەکرا.

شیرۆ ئیشی، کە تاوانباری سەرەکیی تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان بوو لەسەر مرۆڤ لە چین و تاوانباری جەنگ بوو، لە دادگای سەربازیی نێودەوڵەتیی ڕۆژهەڵاتی دوور، کە دوای جەنگی دووەمی جیهان دامەزرابوو، لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە پارێزبەندیی درایە، واتە هیچ تاوانێکی نەدرایە پاڵ، بەرامبەر بەوەی شیرۆ ئیشی زانیاری و زانیاریی توێژینەوەکانی چەکە بایۆلۆجییەکانی ڕادەستی بەرنامەی جەنگی بایۆلۆجیی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کردبوو!![1]

## ٨–٢ ئەڵمانیای نازی و تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر مرۆڤ

کورت بلۆم بەشداریی کردبوو لە کوشتنی بێئازار و تاقیکردنەوە لەسەر مرۆڤ. ئەو لە دادگای نۆرمبێرگ ددانی بە ئەوەدا نابوو کە ساڵی ١٩٤٣ فەرمانی پێ کرابوو ڤاکسینی تاعوون لەسەر

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/Unit_731#Other_units

زینـدانییەکانی سـەربازگەکانی گـرتن (concentration camps) تـاقی بکـاتەوە. (بەرامـبەر زاراوەی concentration camp، لە فەرهەنـگە عەرەبییەکاندا، معسكر الاعتقال دانراوە، لە فەرهەنگە کوردییەکانیشدا، هەر فەرهەنگە و زاراوەیەکی بۆ داناوە، فەرهەنگی ئـازادی، ئینگلیزی – کـوردی، زاراوەی ئۆردووگـای زۆرەملـێ، گرتووخـانەی بەرامـبەر داناوە، فەرهەنگی کورستانیکا، ئینگلیزی – کوردی – فارسی، کەمپی کاری زۆرەملێ، بێگاری و سەربازگەی گرتنی بەرامبەر دانـاوە، منیش زاراوەی 'سـەربازگەکانی گـرتن'م بەکـار هێنـاوە). نازییەکـان خەڵکیـان دەستگیر دەکرد و لەو سەربازگەیانەدا کۆیان دەکردنەوە. لە ڕاستیدا، لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٣، بلۆم بەرپرسی هەموو توێژینەوەی جەنگی بـایۆلۆجی بـوو، کە هێـزە چەکدارەکانی ڕایخـی سـێیەم و هێزەکـانی ئاسایشی تایبەت (S.S) سەرپەرشتییان دەکرد. کورت بلۆم بە کردار، بەشـداریی لە تاقیکردنەوەکـانی چەکـی کیمیـایی و بـایۆلۆجی لەسـەر زینـدانییەکانی سـەربازگەکانی گـرتن کردبـوو. ئەو لە لایەن ڕایخـی سێیەمەوە دەسەڵاتی پێ درابوو توێژینەوە لەسـەر شێرپەنجە بکات و مـاوەیەکی درێـژ بـوو بـایەخی بە "بەکارهێنـانی سـەربازییانەی مـادە شێرپەنجەدروسـتکەرەکان" و "ڤایرۆسـە شێرپەنجەدروسـتکەرەکان" دابوو. بلۆم لە ساڵی ١٩٤٢دا ببوو بە بەڕێوەبەری یەکەیەکی سـەر بە پەیمانگەی ناوەندیی شێرپەنجەی زانکۆی پۆزین (Posen). هەرچەنـدە بلۆم بانگەشـەی ئەوەی دەکرد کە کـارکردن لەم پەیمانگـەیە، تەنهـا بۆ گـرتنەبەری ڕێکـارە بەرگرییەکـانی دژی چەکە بایۆلۆجییەکـانە، بەڵام سـەرۆکی بەشـی زانسـتیی هێـزە چەکـدارەکانی ئەڵمانیـای نـازی، بە توندی پشتیوانیی لەوە دەکرد کە چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییەکان بۆ هێرشـکردن لە دژی بەریتانیـا و یەکێتیـی سـۆڤییەت و ویـلایەتە یەکگرتووەکان بەکار بهێنرێن. سـاڵی ١٩٤٣، ئێریش شـومان، ئەندامی سـەرۆکایەتیی بەشـی زانسـتیی هێـزە چەکـدارەکانی ئەڵمانیـای نـازی، نـامەیەکی بـۆ دکتـۆر هـاینریش کلیـو نووسـیبوو کە یەکێـک بـوو لە

پسپۆڕانی جەنگی بایۆلۆجیی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیای نازی و چاودێریی چەکە بایۆلۆجییەکانی هێزەکانی هاوپەیمانانی دەکرد، لە نامەکەدا نووسیبووی "بە تایبەتی، دەبێت لە یەک کاتدا، بە نەخۆشخەرە پەتاییە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ و ئاژەڵ، وێڕای ئافاتی دەغڵودان، هێرش بکرێتە سەر ئەمەریکا." بە گوتەی کلیو، هۆکارەکانی تاعوون، گرانەتا، کۆلێرا و پیسەکوان کراون بە چەکی بایۆلۆجی، وێڕای ئەوەش، ناوەندی نوێی دەستکرد بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم بەکتریایانە دروست کرابوون کە وا لەو نەخۆشخەرانە دەکات بتوانن بۆ ماوەی ٨ بۆ ١٢ هەفتە بە چالاکی بمێننەوە و مرۆڤ یان ئاژەڵ تووشی نەخۆشی بکەن. پەیمانگەکەی بلۆم، کە وەک بەشێک لە بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی نازی بوو، ناوی نهێنیی "بەربەستکەری هەورەتریشقە"ی لێ نرابوو. لەم پەیمانگەیەدا، هۆکارەکانی چەکە بایۆلۆجییەکان بەرهەمەم دەهێنرا. کارل ئای. گرۆس، ئەفسەری هێزەکانی ئاسایشی تایبەت (S.S) و پسپۆڕ لە نەخۆشییەکانی گەرمەسێر، کە سەرپەرشتیی پێکهێنانی ئەم پەیمانگەیەی دەکرد، گەلێک تاقیکردنەوەی کوشندەی لەسەر ١٧٠٠ زیندانیی سەربازگەی گرتنی ماوتهاوزن کردبوو. لە ئایاری ساڵی ١٩٤٤، ئەم پەیمانگەیە گەلێک بەشی لێ کرابووەوە کە تەرخان کرابوون بۆ فیسیۆلۆجی - بایۆلۆجی، بەکتریاناسی، ڤاکسینەکان، تیشکزانی، دەرمانزانی، ئاماری شێرپەنجە و چاندنی لوو.

بلۆم کاری لەسەر عەمبارکردن و بڵاوکردنەوەی هۆکارە بایۆلۆجییەکانی وەک تاعوون، کۆلێرا، پیسەکوان و گرانەتا دەکرد و زیندانییەکانی تووشی نەخۆشیی تاعوون دەکرد، بۆ ئەوەی کاریگەریی ڤاکسینەکانی تاعوونیان لەسەر تاقی بکاتەوە. یەکەیەکی تایبەت لە زانکۆی ستراسبۆرگ، هۆکارەکانی نەخۆشیی گرانەتا، هەوکردنی جگەر، هەوکردنی گورچیلە و هۆکاری کیمیایی و بایۆلۆجیی تریان لەسەر زیندانیانی سەربازگەکانی گرتن تاقی

دەکردەوە. توێژەر گوتسایت و هاوکارەکانی، کە خودی گوتسایت بەرپرسی توێژینەوەی هەوکردنی جگەر بوو لە سوپای ئەڵمانیا، تاقیکردنەوەی ڤایرۆسییان لەسەر نەخۆشانی دەروونی، جوولەکە، دیلە ڕووسییەکانی جەنگ و قەرەجەکان کە لە سەربازگەکانی گرتن لە زاخنهاوزن و ئاوشڤیتز و شوێنانی تر زیندانی کرابوون، دەکرد. هاینریش هیملەر، کە سەرکردەیەکی هێزی ئاسایشی تایبەتی پارتی نازی و ئەندازیاری جینۆسایدی جوولەکەکان بوو، لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٤دا فەرمانی بۆ بلۆم دەرکرد کە تاعوون لەسەر زیندانیانی سەربازگەکانی گرتن تاقی بکاتەوە.

ساڵی ١٩٤٣، بلۆم پێشنیازی بڵاوکردنەوەی دەستکردی مەلاریای لە ڕێی مێشوولەوە کرد، هەروەها تاقیکردنەوەی بەکارهێنانی ئەسپێی لەسەر زیندانیانی سەربازگەکانی گرتن لە داخائۆ و بوخنڤاڵد کرد، بۆ ئەوەی پەتای گرانەتا لە ناویاندا بڵاو بکاتەوە. ئیدوارد مای یارمەتیی بلۆمی دابوو بۆ گواستنەوەی بەکۆمەڵی مشەخۆری مەلاریا بۆ ناو لەشی مرۆڤ، ئەوەیش بە بەردانەوە و بڵاوکردنەوەی مێشوولەی هەڵگری مەلاریا لە ڕێگەی فڕۆکەوە. بەشی ڤێتەرنەری هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیای نازی، پەرەیان بە هۆکارەکانی نەخۆشییەکانی ئاژەڵ دەدا، بۆ ئەوەی لە ڕێی فڕۆکەوە ئەم هۆکارانە لە ناو خاکی بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤییەتدا بڵاو بکەنەوە. پەیمانگەی توێژینەوەی نیشتیمانی لە ئیسل ڕیمس، وەک پەیمانگەی توێژینەوەی شێرپەنجەی کورت بلۆم، لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، دامەزراوەیەک بوو دوو کاری پێ سپێررابوو، لەو پەیمانگەیە هەندێک تاقیکردنەوەی جەنگی بایۆلۆجی دەکران، لەوانە، بەکارهێنانی نەخۆشییەکانی ئاژەڵ و مێرووەکان وەک چەکی بایۆلۆجی.

لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، ئاڵوگۆڕی زانیاری، نموونە، ئامێر و کەلوپەل لە نێوان بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی ئەڵمانیا و

بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی ژاپۆندا هەبووە و ئەو ئامێر و کەلوپەل و نموونانەیان لە ڕێی ژێردەریاییەوە بۆ یەکتر دەنارد. ئەڵمانیا نموونەی زەردەتای بۆ ژاپۆن ناردبوو، چونکە ژاپۆن لە ڕێی ئەمەریکاوە دەستی نەکەوتبوو. پێکهاتەی پەیمانگەی تایبەتی بلۆم لە پۆزین، هاوشێوە بوو لەگەڵ پێکهاتەی یەکە بەدناوەکەی ٧٣١ی ژاپۆنی کە لە پینگ فان لە مەنشووریا بوو. بڕوا وایە کە ئەمەریکا کورت بلۆمی لە لەسێدارەدان ڕزگار کردبێت، بەرامبەر بەوەی بلۆم زانیاری دەربارەی جەنگی بایۆلۆجی و دەمارەگاز و ڕاوێژی پیشکەش بە بەرنامەکانی چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییەکانی ئەمەریکا کردبێت. ئەمەش وەک هەمان حاڵەتی شیرۆ ئیشی، باوکی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی ژاپۆن وابوو، کە ئەمەریکا بەرامبەر وەرگرتنی زانیاریی چەکە بایۆلۆجییەکانی ژاپۆن لە شیرۆ ئیشی، ئەوی لە مردن ڕزگار کرد.[١]

لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا، لە هۆلۆکۆستدا (جینۆسایدی جوولەکەکان) ٦ ملیۆن جوولەکە لەناو بران[٢]، لەگەڵ زیاتر لە ٥ ملیۆن مرۆڤی تر کە جوولەکە نەبوون، لەوانە، دیلەکانی جەنگ، چالاکوانانی سیاسی، چەپڕەوان، سلاڤی و پۆڵەندی و ئۆکرانی و سلاڤیی ڕووسی و ڕۆمانی، کەمئەندامان، کاسۆلیکی، ئاییینزای بەهایی و پرۆتستانت.[٣] گومان لەوەدا نییە زۆر لەو قوربانییانە، پێش کوشتنیان، لە سەربازگەکانی گرتن هۆکارە بایۆلۆجییەکانیان لەسەر تاقی کراوەتەوە، یان بە هۆی ئەو تاقیکردنەوانەوە مردوون، یان دوای تاقیکردنەوەکان ئەگەر بە زیندوویی مابنەوە، ئەوا ڕەوانەی

[1]https://en.wikipedia.org/wiki/Kurt_Blome
[2]https://en.wikipedia.org/wiki/Kurt_Blome
[3] a. https:// en.wikipedia.org/wiki/Holocaust_victims
b.https://www.socialstudies.org/sites/default/files/publications/se/5906/590606.html

ژوورەکانی گاز کراون و بە گاز کوژراون یان بە ڕێگەی تر کوژراون.[1]

دەڵێن هیتلەر چەند فەرمانێکی قەدەغەکردنی پەرەپێدانی چەکە بایۆلۆجییەکانی دەرکردبوو، بە هۆی ئەو ئەزموونە جەرگبڕەی کە لەگەڵ کاریگەریی چەکە کیمیاییەکان لە جەنگی یەکەمی جیهاندا هەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە پشتیوانیی بەرپرسە باڵاکانی نازییەکان، زانا ئەڵمانییەکان دەستیان بە توێژینەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان کردبوو. هەرچەندە زانا ئەڵمانییەکان هەوڵێکی زۆریان دا بۆ پێشخستنی بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی ئەڵمانی، بەڵام بەرنامەکەیان لەچاو بەرنامەی چەکی بایۆلۆجیی وڵاتانی تر دواکەوتووتر بوو و بەرنامەی پەلاماردان بە چەکی بایۆلۆجیی ئەڵمانی هەرگیز جێبەجێ نەکرا.[2]

نازییەکان لە ڕێی جینۆساید، کوشتنی دەستگیرکراوان، گازی ژەهراوی، بێگاری، کوشتنی بەبەزەییانە، برسیکردن، تاقیکردنەوەی پزیشکی و بۆمباران، هەروەها لە سەربازگەکانی گرتن و کوشتن، لە ١٥,٠٠٣,٠٠٠ بۆ ٣١,٥٩٥,٠٠٠ کەسیان کوشتبوو (نزیکەی ١٥ ملیۆن بۆ ٣١ ملیۆن). ئەگەری ئەوە زۆرە کە لەو ژمارە کوژراوانە، ٢٠,٩٤٦,٠٠٠ (نزیکەی ٢١ ملیۆن) کەسیان پیاو، ژن، کەمئەندام، پیر، نەخۆش، دیلی جەنگ، بێگارییپێکراو، زیندانیانی سەربازگەکان، ڕەخنەگران، هاوڕەگەزبازەکان، جووەکان، سلاڤییەکان، سربەکان، ئەڵمانییەکان، چیکەکان، ئیتالییەکان، فەرەنسییەکان، ئۆکرانییەکان و زۆری تریش بووبن. لەو ژمارەیە، ٢٠,٩٤٦,٠٠٠، یەک ملیۆن منداڵی

---

[1] a. https:// en.wikipedia.org/wiki/Holocaust_victims
b.https://www.socialstudies.org/sites/default/files/publications/se/5906/590606.html

[2] Riedel, Stefan, Biological warfare and bioterrorism: a historical review, Proc (Bayl Univ Med Cent). 2004 Oct; 17(4): 400–406.

خوار تەمەن هەژدە ساڵی تێدا بوو. ئەم ژمارە تۆقێنەرە کوژراوانی جەنگ و ئەو سیڤیل و چەکدارانەی شەڕیان کردووە، ناگرێتەوە.[1]

دەبێت لەو ٢٠,٩٤٦,٠٠٠ کوژراوانە، چەندیان بە هۆکارە بایۆلۆجییەکان مردبن کە لەسەریان تاقی کراونەتەوە!

کتێبەکەی پوڵ ویندلینگ، زۆر بە وردی و دووردرێژی، باسی هەموو ئەو تاقیکردنەوە نامرۆڤانە جۆراوجۆرانە دەکات کە لە سەردەمی حوکمڕانیی نازیدا، لە سەربازگەکانی گرتن، لەسەر گیراوەکانی ئەم سەربازگانە کراون. ناوی پزیشک و زانا ئەڵمانییەکان و زانکۆ و پەیمانگە و دامەزراوە زانستییەکانی تری ئەڵمانیای ئەو کاتەی تێدایە، لەگەڵ زۆر لە ناو و تەمەن و ڕەگەزی قوربانییەکان. باشترین سەرچاوەیە بۆ زانینی ئەو تاقیکردنەوانەی کە لەسەر قوربانییەکان کراون، لەو تاقیکردنەوانەدا مرۆڤیان وەک بەرازی غینیا (guinea pig) تەماشا کردووە.[2]

### ٨-٣ عێراق و تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆجی لەسەر مرۆڤ

لە ماوەی پشکنینەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق لە ساڵی ١٩٩٨دا، دەرکەوت کە ڕژێمی سەددام زیندانیانی بە ستوونی چەقێنراوەوە بەستووەتەوە، ئینجا بە بەکتریای پیسەکوان و چەکی کیمیایی بۆردوومانی کردوون، بە مەبەستی تاقیکردنەوەی ئەو بەکتریا و چەکە کیمیاییانە. ئەم تاقیکردنەوانە، لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا لە ماوەی جەنگی ئێران - عێراقدا کراون، ئەوەیش دوای چەند تاقیکردنەوەیەکی سەرەتایی ئەم چەکانە لەسەر مەڕ و وشتر. بەگوێرەی ڕۆژنامەی لەندەن سەندەی تایمز، بڕوا وایە کە دەیان زیندانی بە ئازارێکی بێپایانەوە بەو تاقیکردنەوانە مردبن.

---

[1] https://www.hawaii.edu/powerkills/NAZIS.CHAP1.HTM

[2] Weindling, Paul, Victims and Survivors of Nazi Human Experiments, BLOOMSBURY and the Diana logo are trademarks of Bloomsbury Publishing Plc, New York, 2015.

لە یەک ڕووداودا، دەوترێت دیلە ئێرانییەکان بەستراونەتەوە و بە هـۆی تەقانـدنەوەی گوللەتـۆپێکی پـڕ لە هۆکـاری بـایۆلۆجی لە نزیکیانەوە، کوژراون. زیندانیی ئیرانیی تر لە ژوورێک دانراون و بە پـرژەی بەکتریـای پیسـەکوان ڕشـێنراون، پزیشـکەکانیش لە پشـت شووشـەی پەنجەرەی ژوورەکەوە چاودێرییـان کـردوون. بەگـوێرەی سـەرچاوەکانی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل، دیلی ئێرانی براون بـۆ شـوێنێک کە نزیـک بـووە لە سـنووری عێـراق لەگەڵ عەرەبسـتانی سعودی. لەوێ بە چەند ستوونێکەوە بەستراونەتەوە، ئینجا بۆمبێکی بەکتریـای پیسـەکوان، لە دووری ١٥ یـاردەوە، بە هـۆی ڕیمـۆت کۆنترۆڵەوە تەقێنراوەتـەوە. هەمـوو ئەو دیلە ئێرانییـانە بە ئازارەوە و بە هۆی خوێنبەربوونی ناوەکییەوە مردوون.

لە تـاقیکردنەوەیەکی تـردا، ١٥ زینـدانیی کوردیـان لە کێڵگەیەکـدا بەستووەتەوە و بۆمبێک کە ڤایرۆسـی ئاوڵەی وشتری تێدا بـووە، بە فڕۆکەیەکـی بچـووک بە سـەریاندا بەردراوەتەوە. ڤایرۆسـی ئـاوڵەی وشـــتر کـــاریگەرییەکی مامناوەنـــدیی هەیە. ئەنجامەکـــانی ئەم تـاقیکردنەوەیە بە هێواشـی دەرکەوتـوون، بەڵام تـاقیکردنەوەکە بـۆ پیـاوانی ڕژێـم سـەرکەوتوو بـووە. لە مـاوەی هەفتەیەکـدا، زینـدانییە کوردەکـان تووشـی نەخۆشـی بـوون. سـەرچاوە عێراقییەکـان دەڵـێن هەندێک لە بێبەزەییترین توێژینەوەکان لە دامەزراوەیەکی ژێرزەمینیی نزیک سەلمان پاک کراون. لێرەدا، هەندێک سەرچاوە دەڵێن، یەکەم جار تاقیکردنەوەکانی هۆکارە کیمیایی و بایۆلۆجییەکان لەسەر سەگ و پشیلە کراون، پاشان لەسەر دیلەکانی ئێران کراون. دیلە ئێرانییەکان لە سـەر جێگـەی نوسـتن لە ژوورێکـدا دانـراون، ژوورەکە بـۆ ئەم مەبەستە دروست کرابوو، پاشان بە هۆی ئامێرێکی ڕشاندنی خێرا کە لە بنمیچی ژوورەکە قایم کرابوو، دیلە ئێرانییەکان بە چەند هۆکارێکی کوشـندە ڕشـێنرابوون، لەوانە، بەکتریـای پیسـەکوان. وردەکـاریی تاقیکردنەوەکـان تەنهـا بە سـەددام و بـازنەیەکی نـاوخۆی

گەورەبەرپرسـانی حکـومەت و ئەو زانـا عێراقییـانەی لە ڕۆژئـاوا خوێنـدبوویان، ڕاگەیەنرابـوو. بەگـوێرەی سـەرچاوەکانی سـوپای ئیسـرائیلی، ئەم دامەزراوە ژێـرزەمینییە، کە لە سـاڵانی ١٩٨٠کانـدا ئەندازیارانی ئەڵمانی دروستیان کردبوو، بۆ ماوەی زیاتر لە دە ساڵ ناوەنـدی تاقیکردنەوەکـانی چەکە کیمیـایی و بایۆلۆجییەکـانی عێـراق بووە لەسەر مرۆڤ.[1]

پشـکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکـان، لە مـاوەی پشـکنینەکانیان لە عێـراق، چەنـد سـەرەداوێکیان لەسـەر بەکارهێنـانی مـرۆڤ بـۆ تـاقیکردنەوەی چەکە کیمیـایی و بایۆلۆجییەکان دۆزییەوە. بە گـوتەی سپێرتزل (Spertzel) کە سـەرۆکی لیژنەی تـایبەتی پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان بووە، پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان دوو "ژووری بەکارهێنـانی پرژە"یـان لە نـاو کۆگاکـانی زبـڵ لە نزیـک دامەزراوەی ئەلموثەننـا و سـەلمان پـاک دۆزیبـووەوە. قەبـارەی ئەم دوو ژوورە ئەوەندەی قەبارەی مرۆڤ بوون و بۆ تاقیکردنەوەی چەکی کیمیایی و بـایۆلۆجی دروسـت کرابـوون. عێراقییەکـان دەیـانگوت کە چەکە بایۆلۆجی و کیمیاییەکانیان لەسەر گوێدرێژ تاقی کردووەتەوە.

بەڵگەنـامەیەکی تیمـی پشـکنینی نەتەوە یەکگرتووەکـان کەیسـێکی زۆر سـەرنجڕاکێش پیشـان دەدا سـەبارەت بەو دەنگـۆیەی کە تاقیکردنەوەکـانی چەکە بایۆلۆجییەکـان، لە لایەن یەکەی ٢١٠٠ی نادیار، لەسەر زیندانیانی سیاسیی شیعە کرابوون.

بەگـوێرەی ئەم بەڵگەنـامەیە، لە سـاڵی ١٩٩٥دا، بە لایەنـی کەمەوە ٥٠ زینـدانی لە زینـدانی ئەبووغرێـب کە دەکەوێـتە ڕۆژئـاوای بەغـدا، ڕەوانەی دامەزراوەیەکی تـاقیکردنەوەی نهێنـی لە ئەلحەدیثە کرابـوون، ئەلحەدیثە شوێنێکی زۆر دوورە لە بیابانی ڕۆژئاوای عێراق.

---

[1] a. Colvin, Marie and Uzi Mahnaimi (1998), "Saddam Tested Anthrax on Human Guinea Pigs", *London Sunday Times* (18 Jan issue).
b.https://en.wikipedia.org/wiki/Iraqi_biological_weapons_program#Human_experimentation

له بەڵگەنـامەکەدا هـاتووە، بە پشتبەسـتن بە زانیـاریی هەواڵگریـی هەڵگەڕاوەیەکـی دیـاری عێـراق، "یەکەی ٢١٠٠ ڕاسـتەوخۆ سـەر بە وەزارەتـی پیشەسـازیی سـەربازی بـوو کە حوسـەین کـامیلی زاوای سەددام حوسەین سەرۆکی بوو."

بەڵگەنـامەکە باسـی ئەوە دەکـات یەکەی ٢١٠٠ تـاقیکردنەوەی هۆکـاری کیمیـایی و بـایۆلۆجیی لەسـەر مـرۆڤ کردبـوو. ئەو زیندانییانەی بۆ یەکەی ٢١٠٠ نێررابوون، هەرگیز نەگەڕانەوە.

پسـپۆڕانی نەتەوە یەکگرتووەکـان هەوڵیـان دا لە سـاڵی ١٩٩٨دا تۆمارەکانی زیندانی ئەبووغرێب بپشکنن، بەڵام پاسەوانانی زیندانەکە چوونەژوورەوەیـان بـۆ نـاو زیندانەکـە دوا خسـت. لە کۆتاییـدا کە ڕێگەیان پێ درا بچنە ژوورەوە، سەرچاوەیەکی ئاگادار لە کەیسەکە ڕای گەیاند کە هەموو تۆمارە سەرەکییەکانی کەیسەکە نەمابوون.

کۆلۆنێلی خانەنشینکراو، عەبد عەبدولحەمید، دەڵێت لەو ماوەیەدا هەمـوو کاتێـک دەنگۆکـانی تـاقیکردنەوەی چەکە کیمیـایی و بایۆلۆجییەکان لەسەر زیندانییەکان دەبیستران، بەڵام باسکردنیان زۆر مەترسیدار بوو. ئەم کۆلۆنێلە لەو بڕوایەدا بووە کە خەزووری یەکێک بووە لە زیندانییەکانی ئەبووغرێب کە تاقیکردنەوەی لەسەر کراوە.

عەبدولحەمید وتی، خەزووری، عەدنـان عەبـاس، کە کۆلۆنێل بـووە لە سوپادا، سزای کوشتنی بۆ بڕابووەوە. لەسەر ئەوەی ڕەخنەی لە سـەددام حوسـەین گرتبـوو. کاتێـک خێـزانەی تەرمەکەیـان وەرگرتبـووەوە، هـیچ شـوێنی گوللەی ئاسـایی بە جەسـتەیەوە نەبـوو. هـیچ نیشـانەیەک بە جەسـتەیەوە نەبـوو. عەبدولحەمیـد بە دڵپـڕییەوە بیری دێتەوە و دەڵێت، هـیچ نیشـانەیەک بە جەسـتەیەوە نەبوو، هیچ. پێیان وتین دەست نەخەنە جەستەکەی و بە زووترین کات بینێژن.[1]

---

[1] a. https://www.chicagotribune.com/news/ct-xpm-2003-07-16-0307160258-story.html
b. Betsy Pisik, "Chemical Arms Tests on Inmates Suspected," *Washington Times*, 15 January 1998, p. 1

لێرەدا، دەقی ئەو نووسینەی کە بەڕێز دکتۆر حوسەین جاف بۆ بەندەی ناردووە، سەبارەت بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر گەنجانی کوردی فەیلی، وەک خۆی دەخەمە ڕوو:

ڕۆماننووس شاکر ئەلمەیاح، کە خەڵکی قەزای ئەلحەیی لە پارێزگای واسط بووە، دەرچووی خولی هونەریی سەربازی (لقی فڕۆکەوانی)ی مۆسکۆ بوو لە کۆتایی سالآنی ١٩٦٠. ئەو هەڵگری باوەڕی مارکسی بوو، گەیشتبوو بە پلەی رائید لە هێزی ئاسمانیی عێراقدا، پاشان بەرزکردنەوەی پلە سەربازییەکەی وەستێنرابوو، چونکە ڕژێمی بەعس دڵنیا نەبوو لەوەی کە دڵسۆزیی تەواوی بۆ ئەوان هەبێت، دواتر لە سەرەتای سالآنی ١٩٩٠دا خانەنشین کرابوو. شاکر ئەلمەیاح خۆی ئەم ڕووداوە دڵتەزێنەی بۆ گێڕامەوە (واتە بۆ دکتۆر حوسەین جاف) کە پەڵەیەکی ڕەشە بە تەوێڵی ڕژێمی فاشیستی بەعسی پێشووەوە، ڕژێمێک بۆ زیاتر لە ٣٥ ساڵ بە زوڵم و جەوروستەمەکەی سواری سەر سنگی عێراقییەکان بووبوو. شاکر دەڵێت، لە ناوەڕاستی سالآنی ١٩٨٠کاندا، لە خولێکی سەربازی بووم، لە خاڵێکی سەربازیی زۆر دوور لە قەزای سەلمان سەر بە پارێزگای موثەننا (ئەلسەماوە). خاڵە سەربازییەکە چەند کیلۆمەترێک لە زیندانی نوگرە سەلمانی ترسناک دوور بوو. بە هۆی توندبوونی بارودۆخەکانی جەنگ لەگەڵ ئێران، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک خواردەمەنیی وشکە و تەڕە بۆ خاڵە دوورە سەربازییەکەمان نەهات، ئەو کاتە ئازووقەمان لە ئاو و خۆراک کەم بووبووەوە و پاکەتی جگەرەمان نەمابوو. ژمارەمان لەو خاڵە سەربازییە لە ٥٠ کەس زیاتر دەبوو، لە کاتێکدا کە ئێمە ئالوودەی جگەرە بووین و گەنجینەی جگەرەکانیشمان بە تەواوی کۆتایی هاتبوو، بە ٥ کەس خۆمان بە کێشانی جگەرەیەکەوە خەریک دەکرد. من بەرپرسی ئەو یەکە سەربازییە ماندوو و نیمچەدوورخراوەیە بووم بۆ ئەو بیابانە وشکە

که نه ئـاو و نه دار و نه مرۆڤـی لـێ بـوو. یەکێک لە یاریـدەدەرەکانم ئامـاژەی بـۆ خاڵێک یـان بینـایەک کـرد کە نـزیکەی دوو کیلـۆمەتر لە ئێمەوە دوور بوو، کە بچم بۆ ئەوێ، بەبێ ئەوەی سروشتی کار یان وەزیفەی ئەوانەی لەوێ کار دەکەن یان بەرپرسی ئەوێن، بزانم، بۆ ئەوەی چەنـد پاکەتێـک جگەرەمـان دەسـت بکەوێـت کە ئەوپەڕی پێویسـتمان پێـی بـوو، تـا ئەو کـاتەی سـەرلەنوێ لە کـاروانە دواکەوتـووەکەوە ئازووقەکەمـان پـێ دەگـات. کاتێـک گەیشـتمە بەر دەرگای ئەو بینا نەزانراوە، ئەفسەرێکی پۆلیس بە پلەی نەقیب، زۆر بە لالووتی پێشوازیی لێ کردم کە لە تەوقی سەریەوە تاکو بنی پێی داپۆشـرابوو، هەتـا چاوەکانیشـی بە چـاویلکەیەکی ئەسـتووری ڕەنگتاریـک داپۆشـرابوون. بە مەیلەقێژانـدن و تـوورەییەوە وتـی، چـی تـۆی هێنـاوە بـۆ ئێـرە؟ بـۆچی هـاتووی بـۆ ئێـرە؟؟ منـیش بە هەمـان قیژانـدن و تـوورەییەوە پێم وت، ڕێـز لە پلەکەم بگـرە، مـن ڕائیـدم لە سوپا و تۆش نەقیبی لە پۆلیس، ڕێزگرتن لە نێوانمانـدا زۆر پێویسـتە، هەردووکمـان لە ڕۆڵەی هێـزە چەکدارەکانی عێـراقین... لێـرەدا تـۆنی دەنگی ئەفسەرە پۆلیسە بەرپرسەکە نزم بووەوە و وتـی: گەورەم مـن ئەوە دەڵێم، چونکە ئەم بینایە هەمووی گازی کیمیاییە و لەوە دەترسم کە ئەو گـازە کیمیاییـانە زیانـت پـێ بگەیەنێـت. ژمـارەیەکی زۆری گەنجانی کورد، کوردە فەیلییەکان، تووشی نەخۆشیی کۆلێرا بـوون و ئیدارەی زیندانی نوگرە سەلمان تەمبەڵیی کردووە لەوەی بە خێرایی چارەسەری پێویستیان بۆ دابین بکـات، وێڕای ئەوەش، حکـومەت و وەزارەتـی تەندروسـتی خۆیـان نەبـان کـردووە لە داواکارییەکـانی زیندانەکە و نەخۆشیی کۆلێراش، بە شێوەی پەتـا، لە نـاو هەزاران لە گەنـجە فەیلییەکانـدا بـڵاو بـووەتەوە و هەموویـان تووشـی نەخۆشـیی کـۆلێرا بـوون. ئینجـا بـۆ کوشـتنی دوو چـۆلەکە بە بەردێـک، ئیـدارەی زیندانی نوگرە سەلمان، ناوبەناو کۆمەڵ کۆمەڵ، ئینجـا لە مردووەکـان بێـت یـان لە تووشـبووەکان، بـۆ ئێـمە دەنێرێـت بـۆ سـووتاندنیان یـان

سووتاندنی لاشەکانیان و ڕزگاربوون لێیان لە ڕێی ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەریان... بەم جۆرەش ڕزگارمان دەبێت لەوانەی کە کوردن و شیعەن و لە بەرهەڵستکارانی ڕژێمیشن.

لێرەدا خوا دەکەم بە شاهید بۆ ئەوانەی کە دەیانڵێم، ئەوانەشم لە ڕائیدی خوالێخۆشبووی خانەنشین لە سوپای عێراقی پێشوو، شاکر ئەلمەیاح بیستووە و داوای لێ کردم ئەم بابەتە بۆ کۆمەڵەی کوردە فەیلییەکان باس بکەم، کە پیاوێکی ئایینی بە ناوی ئەلنوعمانی سەرۆکایەتیی ئەم کۆمەڵەیەی دەکرد، بۆ ئەوەی کۆڕێکی بۆ ببەستن و لەو کۆڕەدا تاوانبارێتیی بەعس دەرحەق بە لاوانی تازەپێگەیشتووی ئەوان ئاشکرا بکات، بەڵام، ئەلنوعمانی و ئەوانی تریش لە بانگەشەکەرانی بەرگریکردن لە زوڵموزۆری فەیلییەکان، بە پیر داواکارییەکەوە نەهاتن و وەڵامی داواکارییەکەیان نەدایەوە.

خوا لە ڕائیدی نووسەر خۆش بێت کە چەند ساڵێک پێش ئێستا کۆچی دوایی کرد و ڕۆیشتەوە بەر دلۆڤانیی خوا، وەک دۆستێک داوای لێ کردم کە ئەمە بگەیەنم بەوانەی گرنگی بەم بابەتە دەدەن، وەک شایەتییەک بۆ مێژوو.

حوسەین ئەلجاف، جێگری یەکەمی ئەمینداری گشتیی یەکێتیی ئەدیبانی عێراق، بەغدا، کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٢٠.

**بڕیاری شوومی ٦٦٦ی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی لەناوچووی بەعس لە ساڵی ١٩٨٠ و شەرعییەتدان بە جینۆساید و کۆچپێکردنی زۆرەملێی کوردە فەیلییەکان و چەند بەڵگەنامەیەک**

ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی لەناوچووی بەعس لە ساڵی ١٩٨٠دا، بڕیاری ٦٦٦ی دەکرد و لە ١٩٨٠/٥/٢٦ لە وەقائیعی عێراقی بڵاو کرایەوە و کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە. ڕژێمی بەعسی لەناوچوو، بەپێی ئەم بڕیارەی، شەرعیەتی دا بە جینۆساید و

کۆچپێکردنی زۆرەملێی کوردە فەیلییەکان و ڕەوانەکردنەوەیان بۆ ئێران و لێسەندنەوەی ڕەگەزنامەی عێراقی لێیان. جێبەجێکردنی بڕیاری ٦٦٦ کە بڕیارێکی زاڵمانە و نامرۆڤانە بوو دەرحەق بە کوردانی فەیلی، بۆ ماوەی ٢٤ چوار ساڵ بەردەوام بوو، لە ساڵی ٢٠٠٦ هەڵوەشێنرایەوە.[1]

بەپێی سەرچاوەکانی پارت و دامەزراوەکانی سەر بە کوردانی فەیلی، ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس، دوای ئەوەی ڕەگەزنامەی عێراقیی لێ سەندنەوە و دەستی بەسەر هەموو ماڵومولکیاندا گرت، نیو ملیۆن کوردی فەیلیی لە عێراق دەرکرد و ڕەوانەی ئێرانی کردن. ئەوانەشی لە عێراق مابوونەوە، ڕەوانەی زیندانی نوگرە سەلمانی تۆقێنەر و زیندانەکانی تری کردن و زۆر لەوانە تاکو ئەمڕۆش چارەنووسیان دیار نییە، لەوانە، ١٧٠٠٠ گەنجی کوردی فەیلی. وەک لە قسەکانی شاکر ئەلمیاحدا دەردەکەوێت، عێراق چەکە کیمیایی و بایۆلۆجییەکانی لەسەر ئەو گەنجە کوردە فەیلییە شوێنبزرکراوانە تاقی کردووەتەوە و پاشان لەناوی بردوون.[2]

لێرەدا چەند بەڵگەنامەیەکی سەردەمی ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس دەخەینە ڕوو کە چیرۆکی قێزەونی جینۆسایدکردنی کوردە فەیلییەکان لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە دەسەلمێنن. ژمارەی بەڵگەنامەکان ٥ بەڵگەنامەیە و یەک بە یەک هەڵوەستەیان لەسەر دەکەین و باسیان دەکەین. کۆپیی ئەم بەڵگەنامانەم لە بەڕێز 'عیصام ئەکرەم فەیلی' دەست کەوتووە کە لە ئەرشیفی خۆیدا پاراستوونی. بەڕێز عیصام ئەکرەم لە لای خوارەوەی بەڵگەنامەکان ژمارەی داناوە لە ١ تا ٧. ئەم ژمارانە، زنجیرەی لاپەڕەکانی بەڵگەنامەکانن، منیش لە

---

[1] https://www.sotaliraq.com/ 2017/05/25/ذكرى-قرار-مجلس-قيادة-الثورة-رقم-666 لسنة ١٩٨٠،

[2] a. http://basrayatha.com/faily462/
b. https://www.refworld.org/docid/5a056c397.html

سەرەوەی هەر بەڵگەنامەیەک ژمارەیەکم بۆ بەڵگەنامەکە داناوە و لە کۆتایی ئەم بەشەدا دانراون.

١- بەڵگەنـــــــامەی یەکەم (دوو لاپەڕەیە، لاپەڕەی ١ و ٢): ئەم بەڵگەنامەیە نووسراوێکی فەرماندەی گشتیی جەیشی شەعبییە، ژمارە حـق/١٦٢٤/٦ لە ١٩٨٧/٨/٢٩ دەرچـووە و ئاڕاسـتەی سـەرۆکایەتیی دیـوانی سـەرۆکایەتیی کۆمـاری کـردووە و لیسـتێکی لەگەڵ هـاوپێچ کراوە. بابەتی نووسراوەکە مافی خانەنشینییە بۆ چەکدارانی مردوو. ئەم لیستە ناوی دە شەهیدی تێدایە کە پێنجیان خوێندکار بوون و دیارە ڕژێم شەهیدی کردوون. لە نووسراوەکەدا دەڵێت ئەم ناوانەیان لە لایەنە ئەمنییەکانەوە/ (کەرتی تایبەت)ـەوە بۆ هاتووە و ئەفرادی حیزبی دەعوەی بەکرێگیراون. لە نووسراوەکەدا ناوی کەرتی تایبەتی (القطاع الخاص) هاتووە، وشەی تایبەت (الخاص)، ئاماژەیەکە بۆ هەموو ئەو کردارانەی تایبەتن بە تاقیکردنەوەی چەکە بایۆلۆجی و کیمیاییەکان. دیارە ئەم ناوانەی لە نووسراوەکەدا هاتوون، بە چەکی بایۆلۆجی یان کیمیایی شەهید کراون. ڕژێمی بەعسی لەناوچوو، لە نووسراوەکانیدا لەجیاتیی چەکی کیمیایی، زاراوەی (چەکی تایبەتی)ی بەکار دەهێنا.

٢- بەڵگەنــامەی دووەم (لاپەڕە ٣)، نووسـراوێکی سـەرۆکایەتیی دیـوانی سـەرۆکایەتیی کۆمـارە، ژمـارە ق/١٠/٣٨٦٠٤ کە لە ١٩٨٧/٩/٧ دەرچـووە و ئاڕاسـتەی بەڕێـوەبەرایەتیی ئاسایشـی گشـتی (مدیریـة الامـن العـام) کـراوە بـۆ ئەوەی ڕای بەڕێـوەبەرایەتییەکە لەسـەر نووسـراوەکەی فەرمانـدەی گشـتیی جەیشـی شـەعبی دەرببـڕن و ئاگاداریان بکەنەوە. ئەم نووسراوەش لیستی ناوەکانی لەگەڵدایە.

٣- بەڵگەنــامەی سـێیەم (لاپەڕە ٤، ٥) وەڵامـی بەڕێـوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتییە (مدیریة الامن العام)، ژمارەکەی ٣٢/م٦/٦٣٢٤٢ـە، لە ١٩٨٧/٩/١٥ دەرچـووە و بـۆ سـەرۆکایەتیی دیـوانی سـەرۆکایەتیی کۆمـار نێرراوە. وەڵامـی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشـی گشتی ئەوەیە کە

ناوەکانی ناو لیستەکە بە ڕەگەز ئێرانین (من التبعیة الایرانیة) و لە (قلعة السلمان) دەستگیر کرابوون و ئەفرادی حیزبی دەعوەی بەکرێگیراو نین. پێشنیازی کردووە کە وا دابنرێن لە کاتی خزمەتکردندا مردوون و فەرماندەی گشتیی جەیشی شەعبی مووچەی خانەنشینی ببڕێتەوە بۆ ئەو خزمانەیان کە ماون.

٤- بەڵگەنامەی چوارەم (لاپەڕە ٦)، نووسراوی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتییە بە ژمارە /س.ش.ش٧١٩١/٥ کە لە ١٩٨٦/٥/٢١ دەرچووە، وەڵامی نووسراوی ژمارە /ق١٩٠٢٣/١٠ی سەرۆکایەتیی دیوانی سەرۆکایەتیی کۆمارە کە ڕێکەوتی ١٧/ئایار/١٩٨٦ی لەسەرە و بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتییان ناردووە. وەڵامی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتی، هەمان وەڵامی بەڵگەنامەی ژمارە سێیەمە.

٥- بەڵگەنامەی پێنجەم (لاپەڕە ٧)، نووسراوێکی دیوانی سەرۆکایەتییە، ژمارە/ق٤٢٢٤١/١٠ کە لە ١٩٨٧/١٠/١ دەرچووە و ئاڕاستەی وەزارەتی دارایی عێراق کراوە. بەپێی ئەم نووسراوە، سەرۆکایەتیی دیوان بڕیاری داوە مووچەی خانەنشینیی مانگانە بە بڕی ٥٤ دینار بۆ هەر خێزانێکی ئەو ناوانەی لیستە دە کەسییەکە ببڕێتەوە.

ئەگەر سەرنج بدەینە بەڵگەنامەکان، بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتی، ئەو دە کەسە بە ڕەگەز ئێرانی دادەنێت و دوو ناویان نازناوی فەیلییان پێوەیە، پێم وایە ئەو دە ناوە هەموویان کوردی فەیلین. هەر وەک لە گێڕانەوەی شاکر ئەلمیاحدا هاتووە، ئەوانەش لە (قلعة السلمان) بوون. (قلعة السلمان) قەڵایەکی سەربازییە و دەکەوێتە ناحیەی سەلمان و ئەو شوێنەیە کە چەکە بایۆلۆجییەکان لەسەر گەنجە فەیلییەکان تاقی کراونەتەوە و شەهید کراون.

لێرەدا، پرسیارێک دێتە پێشەوە، ئەگەر ئەو کەسانە بە ڕاستی خۆبەخش بوون لە جەیشی شەعبی و کوژراون، ئایا پێویستی بەو

هەموو نووسراوانەی نێوان دیوانی سەرۆکایەتی و فەرماندەی گشتیی جەیشی شەعبی و بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتی دەکرد؟ بێگومان نەخێر. ئەوەش دەری دەخات کە ئەو کەسانە لە بارێکی نائاساییدا و بە ناحەق شەهید کراون.

بەلگەنامەی دووەم




الجمهورية العراقية
ديوان الرئاسة

رقم الهاتف ٢٢٩٩ / القصر



سري

الرقم / ٢٨٦٠٩
التاريخ / ١٩٨٧/٩/٧

الى / مديرية الامن العامة

م / بيان رأي

نرفق بطيه صورة كتاب القيادة العامة للجيش الشعبي المرقم ح ق/٦/١٦٢٤ في ١٩٨٧/٨/٢٩ مع صورة مرفقه . راجين الاطلاع وبيان الرأي بما ورد فيه واعلامنا ..

مع التقدير .

عبد الهادي محمد علي
د/ رئيس ديوان الرئاسة

المرفقات
صورة كتاب مع مرفقه .



3

# بەڵگەنامەی سێیەم



((سري وشخصي ويفتح بالذات))

الجمهورية العراقية
وزارة الداخلية
مديرية الامن العامة

العدد ٣٢م/٦/ ٦٢٤٤٢
التاريخ ١٥/٩/١٩٨٧

رئاسة ديوان الرئاسة

م / اجابة

كتابكم المرقم ق/١٠/٤/٣٨٦٠٤ في ٧/٩/١٩٨٧

نود اعلامكم بان موضوعي بحث مرفق كتابكم اعلاه هم من (( التبعية الايرانية )) المحجوزين في ( قلعة السلمان ) وليس من عناصر حزب الدعوة العميل . نقترح اعتبارهم متوفين اثناء القادسية من جرائها وتتولى القيادة العامة للجيش الشعبي صرف رواتب القادسية لمن تبقى من ذويهم .

ونرجو التفضل بالاطلاع .. مع التقدير .

مدير الامن العام
١٢/٩

الاسماء

١) هادي محمد كاظم علي الشادة .

٢) جواد محمد كاظم علي الشادة .

— يتبع ورقة —



# تەواوکەری بەڵگەنامەی سێیەم







الجمهورية العراقية
وزارة الداخلية
مديرية الامن العامة

العدد
التاريخ / /

٣) مسلم هادي صفي عزيز ولي ( علي ) .

٤) طارق ستار عسكر الزنكناوي

٥) اكرم حسن ناصر العيلـــي

٦) فالح مجيد عبد الحسين الساله

٧) عامر رسول محمد الصــداف

٨) عماد رسول محمد الصــداف

٩) قحطان رسول محمد الصــداف

١٠) طارق اسماعيل قاسم سليم البيلـي

## بەڵگەنامەی چوارەم



رئاسة الجمهورية
السكرتير
مديرية الامن العامة
العدد / ق س ٥ / ش٥ / ١٩٦١
التاريخ / شوال / ١٤٠٩هـ
/ ٥ / ١٩٨٩ م

(( سري ))

الى / رئاسة ديوان الرئاسة

م/ حقوق تقاعدية لمقاتلين متوفين

كتابكم ق/ ١٠/ ١٩٠٢٢ في ١٧/ايار/١٩٨٩

نود اعلامكم بان الاسماء الواردة بذيل كتابكم اعلاه هم من التبعية الايرانية الذين كانوا محجوزين في قلعة السلمان وليس من عناصر حزب الدعوة العميل .. نقترح اعتبارهم متوفين اثناء الخدمة ومن جرائها وتتولى القيادة العامة للجيش الشعبي صرف رواتب التقاعدية لمن تبقى من ذويهم .

راجين التفضل بالاطلاع ... مع التقدير.

السيد م ج [illegible] ديوان الرئاسة

مدير الامن العام

الاسماء:

١) موسى جعفر شاكر العبادي | تم اجابتكم عليهما بموجب كتابنا ٨٨٩٢
٢) علي اسماعيل قاسم الكليسي | في ١٠/٢/١٩٨٩ الفقرة ( ٩ و ١٠ )

وقد حصلت موافقة ديوان الرئاسة الموقر

6

لە ڕابوردوودا، لە چەند حاڵەتێکی کەمدا چەکە بایۆلۆجییەکان لە لایەن تاقم یان ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانەوە بەکار هێنراون، لەوانە، تاقمی ئایینیی ڕاجنیشییەکان و ئوم شینریکیۆ. یەک بە یەک باسی ئەو ڕێکخراو یان تاقمانە و چۆنێتیی هەوڵەکانیان بۆ بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆجی دژی خەڵکی سیڤیل دەکەین.

## ٩-١ تاقمی ئایینیی ڕاجنیشییەکان - Rajneeshees

با لە سەرەتادا، باسی تاقمی ئایینی ڕاجنیشییەکان و دروستبوونیان بکەین. بهاگوان شری ڕاجنیش مامۆستایەکی ڕۆحی بوو، ژمارەیەک شوێنکەوتوانی نێودەوڵەتیی لە شاری پوونە (Pune) لە هیندستان لە خۆی کۆ کردبووەوە. شاری پوونە دووەم گەورەترین شارە لە ویلایەتی ماهاراشترا لە هیندستان. ساڵی ١٩٨١، بهاگوان بڕیاری دا هیندستان بەجێ بهێڵێت، بڕوات بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و لەوێ نیشتەجێ بێت. کاتێک بهاگوان و جێگرە سەرەکییەکەی لە ویلایەتی ئۆریگۆن لە شوێنێک دەگەڕان بۆ نیشتەجێبوون، سەردانی Muddy Ranchیان کرد کە ڕووبەرەکەی ٦٤٠٠٠ ئەیکەر بوو لە باشووری ناوچەی واسکۆ (ئەیکەر پێوانەیەکی ڕووبەرە، یەکسانە بە ٤٣٥٦٠ مەتر دووجا) کە شوێنی بەخێوکردنی ڕەشەوڵاخ بوو. بڕیاریان دا کە ئەم شوێنە شوێنێکی زۆر باشە بۆ ئەو کۆمەڵگەیەی کە پلانیان بۆ دانابوو دروستی بکەن، بە بڕە پارەیەکی زۆر ئەو شوێنەیان کڕی. ئەم شوێنی نیشتەجێبوونە نوێیە، سەدان و پاشان هەزاران شوێنکەوتووی بۆ لای خۆی ڕاکێشا – بەشی زۆری شوێنکەوتووەکان خەڵکی ئەمەریکای باکوور بوون،

لەگەڵ زۆر خەڵکی ئەورووپایی. کۆمەکی دارایی شوێنکەوتووەکان یارمەتیی فراوانکردنی شوێنەکەی دا. لە ماوەی دوو ساڵدا، ئەم کۆمەڵگەیە نزیکەی ۷۰۰۰ دانیشتووی هەبوو، لەگەڵ سیستەمی ئاو و هێزی پۆلیس. هەروەها، ڕاجنیشییەکان ئوتێلێکی پێشووی مانەوەی ژنانیان لە ناوەڕاستی شاری پۆرتلاند کڕی. دانیشتوانی ویلایەتی ئۆریگۆن بە سەرسوورمانێکی زۆر و هەندێک پشتیوانی و زیادبوونێکی خێرای ڕقلێبوونەوە، پێشوازییان لەو پێشکەوتنە کرد. هەڵوێستی ڕقهەستێنی زۆر لە شوێنکەوتوان و سەرکەوتنی هەوڵەکانیان تا ڕادەیەکی زۆر بۆ داخستنی کۆمەڵگەکەیان بەرامبەر میدیا و نمایشکردنی زۆری چەک و جلەوبۆخۆشلکردنی دیاریی بهاگوان بە شێوەی دەیان ئۆتۆمبێلی ڕۆڵز ڕۆیس، هەستی خەڵکی ئۆریگۆنی بەرامبەر بەو کۆمەڵگەیە بەرەو خراپتر برد. ئەم کۆمەڵگەی نیشتەجێیە، بۆ ئەوانەی دەرەوەی کۆمەڵگەکە، وا دەردەکەوت کە تێکەڵەیەکی نائاسوودەی ئایینیی ترسناک و تاقمێکی ئایینیی فریودەر و کەمپێکی هاوینەی گەورە بێت بۆ کەسانی بەتەمەن.

دانیشتوانی شارۆچکەی ئەنتیلۆپ، کە ۱۸ میل لە Muddy Ranch دوور بوو، لە پەیوەندیی بەردەوامدا بوون لەگەڵ ڕاجنیشییەکان. شوێنکەوتوانی بهاگوان بە ژمارەیەکی زۆر ڕوویان لە ئەنتیلۆپ کرد بۆ نیشتەجێبوون، بۆ ئەوەی لەوێش کۆمەڵگەیەکی سەر بە Muddy Ranch دروست بکەن. لە نیسانی ۱۹۸۲دا، کەسە بەتەمەنەکانی شارۆچکەی ئەنتیلۆپ هەوڵیان دا شارۆچکەکە لە Muddy Ranch جیا بکەنەوە، بەڵام هەوڵەکەیان سەرکەوتوو نەبوو، چونکە ژمارەی دەنگدەرانی ڕاجنیشییە نوێیەکان زۆرتر بوون و زۆرینە نوێیەکە شارەکەیان ناو نا ڕاجنیش. ڕاجنیشییەکان هەوڵیان دا Muddy Ranch بە فەرمی بکەن بە شارێک، بە ناوی ڕاجنیشپورام Rajneeshpuram، بەڵام هەوڵەکەیان بۆ بە فەرمی ناساندنی ڕاجنیشپورام وەک شارێک سەری نەگرت، چونکە ئەم شوێنە

شوێنێکی کشتوکاڵیی دوورەدەست بوو لە ناوچەی واسکۆ. هەروەها، ڕاجنیشییەکان هەوڵیان دا لە ڕێی تۆمارکردنی خەڵکانی بێلانە وەک دەنگدەرانی ناوچەی جیفرسۆن و واسکۆ، دەسەڵاتی سیاسیی خۆیان فراوان بکەن. ئەم هەوڵەی ڕاجنیشییەکان سەرنجی وەزیری دەرەوەی ویلایەتی ئۆریگۆنی ڕاکێشا و نەیهێشت هەوڵەکەی ڕاجنیشییەکان کاریگەریی لەسەر هەڵبژاردنەکانی ناوچەی واسکۆ هەبێت. ئینجا ڕاجنیشییەکان بۆ بردنەوەی هەڵبژاردنەکان لە ناوچەی واسکۆ، پەنایان بۆ کاری تیرۆریستی برد.[1]

با بزانین کارە تیرۆریستییەکەیان چی بوو.

ساڵی ١٩٨٤، ٧٥٠ کەس لە شاری دالاس لە ویلایەتی ئۆریگۆن لە ئەمەریکا، تووشی ژەهراویبوون بە خۆراک بوون، لە ڕێی ژەهراویکردنی زەڵاتەی مەیخانەکانی ١٠ چێشتخانەی خۆجێیی بە سالمۆنیلا. گرووپێکی دیاری شوێنکەوتوانی بهاگوان شری ڕاجنیش (دواتر بە ئۆشۆ ناسرا) کە ما ئاناند شیلا سەرکردایەتیی دەکردن، بەتەمای پەکخستنی دەنگدەرانی دانیشتوانی دالاس بوون، بۆ ئەوەی کاندیدەکانی ئەوان لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٤ی ناوچەی واسکۆ براوە بن. ئەم ڕووداوە، یەکەم ڕووداو و گەورەترین هێرشی تیرۆریستیی بایۆلۆجی بوو لە مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا.

شوێنکەوتوانی ڕاجنیشی کە لە نزیک شاری ڕاجنیشپورام نیشتەجێ ببوون و پێشتر دەسەڵاتی سیاسییان بەسەر شارۆچکەی ئەنتیلۆپدا سەپاندبوو، هەوڵی ئەوەیان دەدا کە دوو کورسی لە سێ کورسییەکەی بازنەی هەڵبژاردنی دادگای ناوچەی واسکۆ کە لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨٤دا بۆ هەڵبژاردن ئامادە کرابوو، بە دەست بهێنن. هەندێک لە بەرپرسانی ڕاجنیشپورام، لە ترسی ئەوەی کە لەو هەڵبژاردنەدا دەنگی تەواو بە دەست نەهێنن، هەوڵی پەکخستنی

[1] https://www.oregonencyclopedia.org/articles/rajneeshees/#.YAVRkugzbIV

دەنگـدەرانی دالاس (Dallas)یـان دا. دالاس گەورەتـرین سـەنتەری دانیشـتوان بـوو لە نـاوچەی واسـکۆ. ئەو هۆکـارە بـایۆلۆجییەی بـۆ پەکخسـتنەکە هەڵیـان بژاردبـوو، بەکتریـای سـالمۆنیلا بـوو (Salmonella enterica Typhimurium). یەکەم جـار ئەم بەکتریایەیان کردە ناوی پەرداخی ئاوی دوو کۆمیسیاری نـاوچەکە و پاشان لە زەڵاتەی مەیخانەکان و ساسی زەڵاتەیـان کرد. لە ئەنجامدا، ٧٥٠ کەس تووشـی ژەهراویبـوونی خـۆراک بـوون و ٤٥ کەسـیان ڕەوانەی نەخۆشـخانە کـران، بەڵام کەسـیان نەمـردن. بەشـی تەندروسـتیی گشـتی و سـەنتەری کۆنترۆڵکردنی نەخۆشیی ویلایەتـی ئۆریگـۆن، ژەهراویکردنـی بەمەبەسـتیان بە دوور نەزانـی، بەڵام دوای سـاڵێک لە ژەهراویکـردنەکە، هۆکـاری ژەهراویکـردنەکە و مەبەسـتی ژەهراویکردنەکەیـان بـۆ ڕوون بـووەوە و بۆیـان دەرکەوت کە بەمەبەسـت بـووە. لە ٢٨ی شـوباتی ١٩٨٥دا، ئەنـدامی کـۆنگرێس، جەمـیس ئیچ. ویـڤەر، وتەیەکـی لە ئەنجـوومەنی نـوێنەرانی ئەمەریکـا پێشـکەش کـرد، لە وتەکەیـدا ڕاجنیشـییەکانی تاوانبـار کـرد بەوەی کە بەکتریـای سـالمۆنیلایان بەسـەر زەڵاتەی مەیخانەکـانی هەشـت چێشتخانەدا پرژاندووە.

لە کۆنفرانسـێکی ڕۆژنامەوانیـدا، لە سـێپتەمبەری ١٩٨٥، ڕاجنـیش چەنـدین لە شـوێنکەوتووەکانی تاوانبـار کـرد کە بەشـدارییان لەم ڕووداوە و تاوانی تر کردووە، لەوانە، پلانێکی سەرنەکەوتوو لە سـاڵی ١٩٨٥ بـۆ کوشـتنی داواکـارێکی گشـتیی ویلایـەتە یەکگرتووەکـان و داوای لە دەسـەڵاتدارانی ویلایـەتەکە و حکـومەتی فیـدراڵی کـرد لێکۆڵینەوە بکەن.

داواکـاری گشـتیی ویلایەتـی ئۆریگـۆن، تیمێکـی هاوبەشـی لێکۆڵینەوەی لە پۆلیسی ویلایەتەکە و نووسینگەی هەواڵگریی فیدراڵی پێـک هێنـا و چەنـد پشـکنینێکیان لە ڕاجنیشـپورام کـرد. ئەم تـیمە هاوبەشە، لە تاقیگەی پزیشکیی ڕاجنیشپورام، نموونەی بەکتریایەکیان

دۆزییەوە کە وەک هەمان ئەو مادە ژەهراوییە بوو کە زەڵاتەکانی پێ ژەهـراوی کرابـوو. دوان لە بەرپرسـە گەورەکـانی ڕاجنیشـپورام بە تاوانەکانی هەوڵی کوشـتن تاوانبـار کران و ٢٩ مانگیـان لەو ٢٠ سـاڵە زیندانییەی بۆیان بڕابووەوە، لە زیندانێکی فیدراڵی بەسەر برد.[١]

لە کۆتاییدا، بهاگوا ڕاجنیش کارەکانی جێگرەکەی، ما ئاناند شـیلا و چەنـد لە سـەرکردەکانی تـاقمەکەی ئیـدانە کـرد و کۆمەڵگـەی بەجـێ هێشت و ڕازی بوو بەوەی ئەمەریکا بەجێ بهێڵێت.[٢]

### ٩–٢ تاقمی ئایینی ئۆم شینریکیۆ

پـێش ئەوەی باسـی هێرشـە تیرۆریسـتییەکانی تـاقمی ئـایینی ئـۆم شـینریکیۆ بە هۆکـاری بـایۆلۆجی لە ژاپـۆن بکەیـن، باشـتر وایە لە سەرەتادا هەندێک زانیاری دەربارەی ئەم تاقمە ئایینییە بخەینە ڕوو.

ئـوم شـینریکیۆ کە بە مانـای "ڕاسـتیی بـاڵا " دێـت، لە سـاڵانی ١٩٨٠کانـدا وەک گرووپێکـی ڕۆحیـی تـێکەڵ لە بـاوەڕە ئایینییەکـانی بوودایی و هیندۆسی سـەری هەڵدا و دواتر کاری لەسـەر بابەتەکانی پێشبینییە کارەساتئامێزەکانی ئـایینی کریسـتیانی سـەبارەت بە کۆتـایی جیهـان کـرد. دامەزرێـنەری ئەم گـرووپە، شـۆکۆ ئاسـاهارا، خـۆی وا ڕاگەیانـــدبوو کە حەزرەتـــی مەســـیحە و "یەکەم ڕۆشـــنبیر"ی دوای بـوودایە. ئەم گـرووپە لە سـاڵی ١٩٨٩دا وەک ڕێکخراوێکـی ئـایینی لە ژاپۆن بە فەرمی ناسرا. دوای ئەوەی ئاسـاهارا لە زانکۆکـان وتـاری دا و زۆر کتێبـی دەربـارەی گرووپەکەیـان نووسـی، ژمـارەیەکی زۆر لە شوێنکەوتوانی جیهـانیی بۆ گـرووپەکەی پەیدا کـرد. ژمـارەی ئەنـدامی گـرووپەکە، لە لـوتکەدا، گەیشـتە دەیـان هەزار ئەنـدام لەسـەر ئاسـتی جیهـان. بۆ نمـوونە، ژمـارەی ئەنـدامانی تـاقمەکە لە ڕووسـیا دەشـێت گەیشتبێتە ٣٠٠٠٠ کەس.

---

[1] https://en.wikipedia.org/wiki/1984_Rajneeshee_bioterror_attack#:~:text
[2] https://www.oregonencyclopedia.org/articles/rajneeshees/#.YAVRkugzbIV

ئەندامی پێشووی ئەم تاقمە ئایینییە، لە شایەتیدانیان لە بەردەم دادگای ژاپۆندا، بێگومان دوای دەستگیردنیان و درانیان بە دادگا، باسی ئەوەیان کردبوو کە بڕە پارەیەکی زۆریان بۆ ڕێوڕەسمە ئایینییەکانی تاقمەکە دابوو، لەوانە، بۆ قژ و گەرماوی ئاساهارا. یەکێک لە شاهیدەکان باسی ئەوەی کردبوو کە ساڵی ١٩٨٨، زیاتر لە ٨١٠٠ دۆلاری بۆ ڕێوڕەسمی "دەستپێکی خوێن" دابوو، کە بریتی بوو لە خواردنەوەی خوێنی سەرۆکی تاقمەکە.

زۆر لە شوێنکەوتوانی ئاساهارا خوێندکارانی زانکۆ دەستبەژێرەکانی ژاپۆن بوون. ئەم خوێندکارانە گەنجانێک بوون کە گوشاری ئەکادیمییان لەسەر بووە و بە هەمان شێوە، بۆ ئاییندەشیان گوشاری پیشەیان لە پێش بوو و تاقمەکە بەڵێنی ژیانێکی خۆشتر و گرنگتری پێ دابوون.

وردەوردە تاقمی ئایینی ئوم شینریکیۆ بوون بە تاقمێکی بەدگومانی ڕۆژی زیندووبوونەوە (ڕۆژی قیامەت)، لە بڕوایەدا بوون کە جیهان لە دارمان لە جەنگی سێیەمی جیهاندا نزیک بووەتەوە و تەنها ئەندامانی ئەوان بە زیندوویی دەمێننەوە.

تاقمەکە وردەوردە بوو بە تاقمێکی توندوتیژ و کەوتە ڕفاندن، بریندارکردن و کوشتنی بەرهەڵستکارەکانی، تەنانەت بەکارهێنانی هۆکارە کیمیایی و بایۆلۆجییەکان لە هەندێک هێرشی دیکەیاندا.[1]

## هێرشەکانی تاقمی ئوم شینریکیۆ بە گازی ژەهراوی لە ژاپۆن

ڕۆژی دووشەممە، ڕێکەوتی ٢٧ی حوزەیرانی ١٩٩٤، تاقمی ئوم شینریکیۆ لە شاری ماتسومۆ لە ژاپۆن، ئۆتۆمبیلێکی بەفرگرە کە گۆڕانکارییان تێدا کردبوو بۆ پرژاندنی دەمارەگازی سارین، لە گەڕەکێکی ئەو شارە لە گەراجێکی پشت کۆمەڵە درەختێکی شارەکەدا ڕادەگرن. ئینجا سیستەمی کۆمپیوتەری بەفرگرەکە ئیش پێ دەکەن و

[1] https://www.bbc.com/news/world-asia-35975069

هەورێک لە دەمارەگازی سارین بەسەر کۆمەڵێک ماڵی تایبەت و شوقەکانی تەلارێک و چەند ماڵێک و خانوویەک کە شوێنی مانەوەی دادوەران بووە، بڵاو دەبێتەوە. ئەو خانووەی کرابوو بە ئامانج، شوێنی مانەوەی ٣ دادوەر بووە. ئامانجی تاقمەکە لەم کارەدا، کوشتنی ئەم ٣ دادوەرە بوو، چونکە تاقمەکە لەوە ترساون کە ئەم ٣ دادوەرە لە کەیسێکی موڵکداریدا لە دادگا، بڕیار دژی تاقمەکە بدەن. گازە کوشندەکە لە ڕێی دەرگا و پەنجەرەوە، بە ناو ژووری شوقە و خانووەکاندا بڵاو بووبووەوە، چونکە ئەو شەوە گەرما بووە و خەڵک دەرگا و پەنجەرەی کردبووەوە. لە ماوەیەکی کورتدا ٧ کەس مردن و ٥٠٠ کەسیش بۆ چارەسەرکردن ڕەوانەی نەخۆشخانە کران و ٢٠٠ کەسیان شەوێک لە نەخۆشخانە مانەوە.

هەروەها تاقمی ئوم شینریکیۆ، سەرلەبەیانیی ڕۆژی ٢٠ی ئازاری ١٩٩٥، لە کاتی ئەوپەڕی قەرەباڵغیی میترۆی تۆکیۆدا، پێنج کیسی پلاستیکی پڕ لە شلەی دەمارەژەهری سارین کە بە کاغەزی ڕۆژنامە پێچابوویاننەوە، لە ناو پینج فارگۆنی شەمەندەفەری پێنج وێستگەی لێکدووری تۆڕی میترۆی تۆکیۆ دانابوو و بە نووکی تیژی چەتر، کیسە پلاستیکییەکانیان کون کردبوو و سارینە شلە ژەهراوییەکە بە ناو فارگۆنەکاندا بڵاو بووبووەوە و بووبوو بە هەڵم و بە ناوی هەوای فارگۆنەکاندا بڵاو بووبووەوە. ئەوانەی ئەو کارەیان کردبوو، بە خێرایی لە فارگۆنەکان هاتبوونە دەرەوە و وێستگەکانی میترۆیان بەجێ هێشتبوو. لە ئەنجامی هەڵمژینی هەڵمە (گازە) ژەهراوییەکەی سارین، ١٢ کەس مردبوون و نزیکەی ٣٨٠٠ کەسیش بریندار ببوون و هەزار کەسیان ڕەوانەی نەخۆشخانە کرابوون.

### هێرشەکانی ئوم شینریکیۆ بە چەکی بایۆلۆجی

تاقمی ئوم شینریکیۆ، بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆریستی، تەنها بژاردەی بەردەستیان چەکی کیمیایی نەبوو، بەڵکو پەنایان بۆ چەکی

بـــایۆلۆجییش بردبـــوو. ســـاڵی ١٩٩٠، تـــاقیگەیەکی بەرهەمهێنـــانی تۆکسینیان هەبوو، پاشان لەجیاتیی ئەم تـاقیگەیە، دوو تـاقیگەی تریـان دانـابوو، یەکێکیـان لە گونـدی کامیکیوشـیکی و ئەوی تریـان لە تۆکیـۆ. ئەم تاقمە چەند هۆکارێکی بایۆلۆجییان چاندبوو و تـاقی کردبـووەوە، لەوانە، تۆکسـینی بۆتولینـوم، پیسـەکوان، کـۆلێرا و زەردەتـا. سـاڵی ١٩٩٣، گرووپێکی تاقمەکە کە پێک هـاتبوون لە ١٦ دکتـۆر و پەرسـتار، بـۆ کـارێکی پزیشـکی چووبـوون بـۆ وڵاتـی زائیـر، بەڵام ئامـانجی ڕاستەقینەی گرووپەکە ئەوە بوو کە زانیاری لەسـەر ڤایرۆسـی ئیبۆلا پەیدا بکەن و چەند نموونەیەکی ڤایرۆسەکەش لەگەڵ خۆیان بهێننەوە بۆ ژاپۆن. لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٤دا، ڕادیـۆی ڕووسـیا باسـی ئەوەی کردبـوو کە پزیشـکەکانی تـاقمی ئـوم شـینریکیۆ گفتوگۆیـان لەسـەر ئەگەری بەکارهێنـانی ڤایرۆسـی ئیبـۆلا وەک چەکێکـی بـایۆلۆجی کردبوو.

ئەم تـاقمە لە نێوان سـاڵانی ١٩٩٠–١٩٩٥دا چەنـد هەوڵێکـی کـاری تیرۆریسـتیی بایۆلۆجییـان دا، بەڵام لەو هەوڵانەیانـدا سـەرکەوتوو نەبـوون. لە سـەرەتای سـاڵی ١٩٩٠دا، تـاقمەکە لە ڕێـگەی لێخـوڕینی ئۆتۆمبیلێکەوە، بە دەوری تەلاری پەرلەمانی ژاپۆن و تەلارەکانی تـری حکومەتـدا لە ناوەڕاسـتی تۆکیـۆ، هەوڵـی دا تۆکسـینی بۆتولینوم بـڵاو بکاتەوە.

لە سـەرەتای حـوزەیرانی ١٩٩٣دا، هەوڵێکـی تریـان دا بـۆ بڵاوکردنەوەی تۆکسینی بۆتولینوم، ئەم جارەیان هاوکات بوو لەگەڵ ئـاهەنگی هاوسـەرگیریی جێگـری ئیمپراتـۆری ژاپـۆن. ئۆتۆمبیلێک کە ئامێری پرژاندنی تۆکسینی بۆتولینومیان پێوە قایم کردبوو، بە دەوری کۆشـکی ئیمپراتـۆری و تەلارە حکـومییە سـەرەکییەکان کە لە ناوەڕاستی تۆکیۆدا بوون، سووڕێنرایەوە.

دواتـر لە هەمـان حوزەیراندا، بە بەکارهێنـانی تەکنۆلۆجیایەکی تـر، تاقمەکە هەوڵی بڵاوکردنەوەی سپۆرەکانی پیسەکوانیان لە نـاو تەلاری

نووسینگەی تاقیگەی تۆکیۆدا دا. ئەو کاتە دەزگای پۆلیس و میدیا هەواڵی بۆنێکی ناخۆش، هەڵمێکی قاوەیی، مردنی هەندێک ئاژەڵی ماڵی و بوونی پەڵەی زۆر لەسەر ئۆتۆمبیل و شۆستەکانیان بڵاو کردەوە. پاشان لە ئازاری ١٩٩٥دا، پێش هێرشەکەی سەر میترۆی تۆکیۆ، ئەندامێکی تاقمەکە دەستپێشخەریی کردبوو و هەوڵی دابوو تۆکسینی بۆتولینوم لە ویستگەی میترۆی شاری کاسوماگاسیکی بڵاو بکاتەوە، ئەو ئەندامە تۆکسینی بۆتولینومی راستەقینەی لە ئامێرەکانی پرژاندنەکەدا بەکار نەهێنابوو.

هیچ هەواڵێکی برینداربوون لەم هەموو رووداوە بایۆلۆجییانە بڵاو نەکرایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم تاقمە مامەڵەیان لەگەڵ مادەی زۆر ژەهراویدا دەکرد. شکستهێنانی تاقمەکە، لەو هەولانەی سەرەوەیاندا، بۆ چەند هۆیەک دەگەڕایەوە، لەوانە، دەشێت تاقمەکە هۆکاری بایۆلۆجیی گونجاو یان دەزگای تەکنۆلۆجیی گونجاویان بۆ ئامادەکردنی هۆکارە بایۆلۆجییەکان نەبووبێت. نەیانزانیبێت هۆکارە بایۆلۆجییەکە بەکار بهێنن، یان هۆکارە بایۆلۆجییەکەیان زیاد لە پێویست گەرم کرابێت. هەرچەندە تاقمەکە دەوڵەمەند بوو، بەڵام نەیتوانیبوو پسپۆڕ یان زانای بایۆلۆجی لە ناو ریزەکانی خۆیدا دابمەزرێنن. لەوانەیە قوربانییەکانی ئەو هێرشە بایۆلۆجییانەیان نەدۆزرابنەوە یان درابنە پاڵ هۆگەلێکی تر.[1]

### ٩-٣ تیرۆریزمی بایۆلۆجی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ڕێی چەند نامەیەکی بە پۆست نێرراو کە پیسەکوانیان تێ کرابوو.

کاتێک تیرۆریزمی بایۆلۆجی (bioterrorism) لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠١ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕووی دا، هەموو کەسێک وای بیر دەکردەوە کە ئەم کارە تیرۆریستییە پەیوەندیی بە

[1] Olson Kyle B, Aum Shinrikyo: Once and Future Threat?, Emerging Infectious Diseases, Vol. 5, No. 4, July–August, 1999, pp. 509–512

تیرۆریستانی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ـەوە هەبێت، چونکە ئەم ڕووداوە، چەند هەفتەیەکی کەم، دوای ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ ڕووی دابوو. دواتر دەرکەوت کە ئەم تیرۆریزمی بایۆلۆجییە تیرۆریستێکی ناوخۆ کردوویەتی. هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەشداریی لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهاندا کردبوو، بەڵام ئەم جەنگانە دوور لە ئەمەریکا ڕوویان دابوو و هەرگیز خاکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەبووبوو بە مەیدانی جەنگ. لێرەدا بە درێژی باسی ئەو ڕووداوەی تیرۆریزمی بایۆلۆجی لە ئەمەریکا دەکەین.

### مردنی ڕۆژنامەنووسێک

لە ٢ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠١دا، ڕۆژنامەنووس ڕۆبەرت ستیڤنس کە لە دەزگای ئەمەریکان میدیا (American Media) لە فلۆریدا کاری دەکرد، لەناکاو تووشی نەخۆشیی پیسەکوان بوو و لە ٥ی ئۆکتۆبەردا مرد. لەو کاتەدا ئەمە بوو بە هەواڵێکی سەرەکی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەوەیش لەبەر چەند هۆیەک:

١- نەخۆشیی پیسەکوان نەخۆشییەکی باوە لە ئاژەڵاندا و لە مرۆڤدا دەگمەنە. حاڵەتەکانی تووشبوون بەم نەخۆشییە، بە شێوەیەکی ئاسایی، لە ناو ئەوانەدا ڕوو دەدات کە بەرکەوتنی بەردەوامیان لەگەڵ ئاژەڵدا هەبێت، وەک گۆشتفرۆش، پزیشکی ئاژەڵ یان ئەوانەی کێڵگەی بەخێوکردنی ئاژەڵیان هەبێت.

٢- ستیڤنس بە نەخۆشیی پیسەکوان مرد، کە نەخۆشییەکە بە هەوادا دەگوازرێتەوە، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە ستیڤن بە هۆی هەڵمژینی بەکتریا یان سپۆری پیسەکوانەوە مردبێت. بەکتریا یان سپۆرەکانی پیسەکوان بە چەند ڕێگەیەک دەچنە ناو لەشی مرۆڤەوە: لە ڕێی سییەکانەوە (نەخۆشیی پیسەکوانی سییەکان)، لە ڕێی دەمەوە

(نەخۆشیی پیسەکوانی ڕیخۆڵە)، لە ڕێی برینی پێستەوە (نەخۆشیی پیسەکوانی پێست)ی لێ دەکەوێتەوە.

٣- ستیڤن چەند ڕۆژێکی کەم پێش مردنی، نامەیەکی بە دەست گەیشتبوو کە هاڕاوەیەکی سپیی تێدا بوو.

لە ٨ی ئۆکتۆبەردا، کەسێکی تر لە دەزگای ئەمەریکان میدیا (American Media) تووشی نەخۆشیی پیسەکوان بوو. لە دوای ١٢ی ئۆکتۆبەر، ئەم نەخۆشییە لە نیویۆرک و واشنتۆن دی.سیی پایتەخت بڵاو بووبووەوە، ئەوانەی تووشی ئەم نەخۆشییە بووبوون، بە هۆی وەرگرتنی نامەکانی پۆستەوە بوو. لێرەدا ئەگەرەکان بە لای ئەوەدا شکانەوە کە ئەم حاڵەتانە بە هۆی تیرۆریزمی بایۆلۆجییەوە ڕوویان دابێت.

نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی (FBI) بۆی دەرکەوت کە ئەو نامانەی هاڕاوەی پیسەکوانیان تێدا بووە، لە ترینتۆن، نیوجێرسییەوە بەسەر دەزگاکانی پۆست لە هامیلتۆن و کارتەریت و نیوجێرسی دابەش کراون و پاشان بۆ دواشوێنی مەبەست نێرراون کە شاری نیویۆرک و ناوچەی واشنتۆن دی.سیی پایتەخت بووە.

چەند ڕۆژێکی کەم، دوای دڵنیابوون لەوەی کە ئەوانەی تووشی ئەم نەخۆشییە بووبوون نەخۆشیی پیسەکوانە، نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەوەی بڵاو کردەوە کە ئەو هاڕاوە سپییەی لە نامەکاندا بووە، لە ڕاستیدا پیسەکوان بووە. بێگومان هاڕاوە سپییەکە سپۆرەکانی پیسەکوان بووە، نەوەک خودی بەکتریای پیسەکوان، چونکە بەکتریاکە خۆی دەگۆڕێ بۆ سپۆر کاتێک ژینگەی دەوروبەری دەگۆڕێت. سپۆرەکانی پیسەکوان بە بەرگێکی ڕەق دەورە دراون و بەرگەی گەرما و مادە کیمیاییەکان دەگرن و لە گەرمایەکی زۆریشدا بە زیندوویی دەمێننەوە.

پیسەکوان بەکتریایەکە لە دۆخی ئاساییدا لە ناو گڵدا گەشە دەکات و سێ جۆری هەیە. جۆری یەکەمیان تیرەی ئامسە (Ames strain)،

نزیکەی سەد ساڵ لەوەوپێش لە ئامس لە ویلایەتی ئایوا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا جیا کراوەتەوە و بە دەست هێنراوە. تیرەی دووەمیان ڤۆلوم (Vollum strain)ـە، لە ساڵی ۱۹۳۵ لە سکۆتلەندا جیا کراوەتەوە و بە دەست هێنراوە و لە شانشینی یەکگرتوو (United Kingdom) و عێراق بۆ دروستکردنی چەکی بایۆلۆجی بەکار هێنراوە. جۆری سێیەمیان تیرەی ستێرن (Sterne strain)ـە، لە باشووری ئەفەریقا جیا کراوەتەوە و بۆ بەرهەمهێنانی پێکوتە بەکار هێنراوە. لەبەر ئەوەی تیرەی ستێرن بەرگێکی پارێزەری نییە، کاتێک دێتە ناو لەشی مرۆڤەوە، لە لایەن خانە بەکتریاخۆرەکانەوە (macrophages) تێک دەشکێنرێت. تیرەی (strain) ستێرن هەموو ئەو پرۆتینانەی تێدایە کە لە تیرەکانی تردا هەن، هەر لەبەر ئەوەشە بۆ بەرهەمهێنانی پێکوتە بەکار دەهێنرێت.

بۆ ئەوەی بەکتریای پیسەکوان بکرێت بە چەکی بایۆلۆجی، هاڕاوەی سپۆرەکانی پیسەکوانەکە لەگەڵ مادەیەکی تر تێکەڵ دەکرێت کە پێی دەوترێت جێگیرکەر، ئینجا تێکەڵەکە دەکرێت بە هاڕاوەیەکی زۆر ورد، بۆ ئەوەی بە هەڵواسراوەیی لە ناو هەوادا بە شێوەی پرژە (aerosol) بمێنێتەوە. ئەگەر یەکێک ئەو هەوایەی کە ئەو هاڕاوە وردەی تێدایە هەڵبمژێت، ئەوا تووشی نەخۆشیی پیسەکوانی سی دەبێت. بۆ چەکی پیسەکوان، عێراق بینتۆنایتی (bentonite) وەک مادەی جێگیرکەر بەکار هێنا و سوپای ئەمەریکا لە سەرەتادا تالک (talc)ی وەک مادەی جێگیرکەر بەکار دەهێنا. تالک هاڕاوەیەکی سیلیکاتی مەگنیسیۆمە. کاتێک هاڕاوەیەکی پیسەکوان بکرێتە ناو زەرفی نامەوە و کەسێک زەرفەکە بکاتەوە، ئەوا ئەو کەسە هاڕاوەی پیسەکوانەکە هەڵدەمژێت. تەنانەت ئەگەر زەرفی نامەکەش نەکرێتەوە، هاڕاوەی پیسەکوانەکە لەو کونە وردانەی لە زەرفەکەدان، دێتە دەرەوە. هەر لەبەر ئەوەش بوو تۆماس مۆریس، کە کارمەندێکی نووسینگەی پۆست بوو لە نووسینگەی پۆستی ( Brentwood

Station) لە ناوچەی واشنتۆن دی.سی، مرد، چونکە مۆریس ئەو هاڕاوە وردەی پیسەکوانی هەڵمژیبوو کە لە کونە وردەکانی زەرفی نامەکانەوە هاتبوونە دەرەوە.

## شیکردنەوەی DNAی پیسەکوان

ئەو نامانەی هاڕاوەی پیسەپکوانەکەیان تێدا بوو، لە نیوجێرسی خرابوونە ناو سندووقەکانی پۆستەوە و ناونیشانی نیویۆرک و واشنتۆن دی.سییان لەسەر بوو، واتە بنێررێن بۆ ئەم دوو شوێنە، لەبەر ئەوە، نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی بیری لەوە کردبووەوە کە دەبێت تاوانبارەکە نیشتەجێی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بێت. نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو پیسەکوانەی لە ڕێی نامەوە بۆ فلۆریدا و نیویۆرک و واشنتۆن دی.سی و نیوجێرسی نێررابوو، هەمان پیسەکوانە، واتە لە یەک تیرەن؛ لەبەر ئەوە، لێکۆڵەران لەو بڕوایەدا بوون کە پیسەکوانەکە لە هەمان ئەم ناوچانە دروست کرابێت و نێررابێت. بەم جۆرە، چەندین کۆمپانیای دەرمانسازی و تاقیگەکانی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکان بوون بە جێی گومانی سەرەکی. زۆر لە کۆمپانیاکانی دەرمانسازی بە ویستی خۆیان ڕایان گەیاند کە ئامادەن بپشکنێرین و سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانیش ڕای گەیاند کە تەواو هاوکاریی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی دەکات. نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی لەو بڕوایەدا بوو کە نزیکەی ١٠٠ تاقیگە پیسەکوانیان هەیە و ١٢ تاقیگەش لەو کاتەدا بە شێوەیەکی چالاک توێژینەوەیان لەسەر پیسەکوان دەکرد.

وا دانرا کە تیرەی پیسەکوانەکە تیرەی ئامس بێت، چونکە ئەم تیرەیە سەرچاوەکەی لە بنەڕەتدا ئەمەریکییە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە تاوانبارەکە ئەمەریکی بێت، چونکە پیسەکوان بەسەر تاقیگە و سەنتەرەکانی توێژینەوەی سەرانسەری جیهاندا دابەش کرابوو. لەو

کاتەدا هیچ یاسایەک نەبوو ڕێگری لە گواستنەوەی پیسەکوان بکات و هەر کەسێک پیسەکوانی ویستبێت، نامەیەکی نووسیوە و توانیویەتی بە خۆڕایی پیسەکوانەکەی دەست بکەوێت. خەسڵەتێکی بەکتریای پیسەکوان ئەوەیە کە چەندین بەشی DNAیەکەی بۆ تیرە جۆراوجۆرەکانی هەڵدەگیرێت و ئەم تیرانە بە ڕێژەی ٩٠٪ وەک یەکن. خەسڵەتێکی تری پیسەکوان ئەوەیە کە DNAیەکەی چەندین poly(A) tract و چەندین poly(AT) tractی تێدایە. نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی نموونەی DNAی پیسەکوانی لەم چەند نموونانەی خوارەوەدا شی کردەوە:

نموونەی پیسەکوانی وەرگیراو لەو کەسەی بە نامەی پیسەکوانەکە لە فلۆریدا مردبوو.

نموونەی پیسەکوانی بەدەستهێنراو لە زانکۆی کالیفۆرنیا – بێرکلی.

نموونەی پیسەکوانی بەدەستهێنراو لە پۆرتۆن داون لە شانشینی یەکگرتوو.

نموونەی پیسەکوانی وەرگیراو لە گایەک کە ساڵی ١٩٢٥ بە نەخۆشیی پیسەکوان مردبوو.

نموونەی پیسەکوانی وەرگیراو لە گایەک کە ساڵی ٢٠٠١ بە نەخۆشیی پیسەکوان مردبوو.

نموونەیەکی پیسەکوانی بەدەستهێنراو لە سوپای ئەمەریکا.

نموونەی پیسەکوانی پۆرت داونی شانشینی یەکگرتوو، لە بنچینەدا، لە لایەن سوپای ئەمەریکاوە بۆ پۆرت داون دابین کرابوو. نموونەی پیسەکوانی زانکۆی کالیفۆرنیا لە لایەن پۆرت داونەوە بۆ زانکۆکە دابین کرابوو. بەم جۆرە، ئەو نموونانەی لە پۆرت داون و زانکۆی کالیفۆرنیا وەرگیرابوون، لە بنچینەدا وەک یەک بوون، چونکە لە یەک سەرچاوەوە دابین کرابوون.

شـــيكردنەوەی ئەم نموونـــانەی پیســـەکوان، دەری خســـت کە نمـوونەکەی سـوپای ئەمەریکـا، بە نزیکەیـی چـوونیەک بـوو لەگەڵ نمـوونەکەی فلۆریـدا، کە لە نـامەکەدا بـوو و ستیڤنسـی کوشـتبوو. دوانزە جیاوازی هەبوو لە نێوان نمـوونەی ئەو پیسـەکوانەی لەو گـایە وەرگیرابـوو کە سـاڵی ١٩٢٥ پێـی مردبـوو لەگەڵ ئەو پیسـەکوانەی لە فلۆریدا لە ستیڤنس وەرگیرابوو. هەروەهـا پانزە جیـاوازی هەبـوو لە نێوان ئەو نموونە پیسـەکوانەی لەو گـایە وەرگیرابـوو کە سـاڵی ٢٠٠١ پێـــی مردبـــوو لەگەڵ ئەو پیســـەکوانەی لە فلۆریـــدا لە ســـتیڤنس وەرگیرابـــوو. لە شـــیکردنەوەکانی نموونەکـــانی پیســـەکواندا، بـــۆ نووســـینگەی لێکـــۆڵینەوەی فیـــدراڵی ڕوون بـــووەوە کە دەبێـــت سەرچاوەی ئەو پیسەکوانەی بۆ تیرۆریزم لە نامەکاندا بەکار هێنراوە، سـوپای ویـلایەتە یەککرتووەکـانی ئەمەریکـا بێـت. ئەگەر سـەرچاوەی پیسەکوانەکە سوپای ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا بێت، ئەگەری ئەوە زۆرە کە سەرچاوەکانی ئەمانە بن:

١- ســـــەنتەری بـــــایۆلۆجیی کیمیـــــایی ئێجـــــوود لە ئێجـــــوود (Edgewood)، ماریلاند (Maryland).

٢- پەیمانگەی توێژینەوەی پزیشکیی نەخۆشییە درمەکانی سـوپای ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا (USAMRIID) لە فۆرت دیتریـک (Fort Detrick)، ماریلاند.

٣- دەگـوەی پروڤینـگ گراونـد، دەگـوەی (Dugway)، لە ویلایەتـی ئوتا (Utah). بێگومان دەگوەی پروڤینگ گراونـد دامەزراوەیەکی سـەر بە ســوپای ئەمەریکـایە، بـۆ تـاقیکردنەوەی چەکە کیمیـایی و چەکە بایۆلۆجییەکان بەکار دەهێنرێت.

**دکتۆر ستیڤن هاتفیل: گومانلێکراوی بەهەڵە**

دکتـۆر سـتیڤن هاتفیـل (Dr. Steven Hatfill) گومـانلێکراوی سـەرەکیی تیرۆریزمـی پیسـەکوان بـوو. بـۆچی گومانیـان لەو کـرد؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەمانەی خوارەوەیە:

١- دکتۆر هاتفیل توێژەر بوو لە پەیمانگەی توێژینەوەی پزیشکیی نەخۆشـییە درمەکـانی سـوپای ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا (USAMRIID). دکتـۆر هاتفیـل وتبـووی کە ئەو لە تـاقیگەی ڤایرۆسـزانی (USAMRIID) کـاری کردبـوو، نەک لە بەشـی بەکتریازانی. پیسەکوان بەکتریایە، نەک ڤایرۆس.

٢- دەرمـانی سـیپرۆ (Cipro) کە دەرمـانێکی باشـە بـۆ چارەسـەرکردنی نەخۆشـیی پیسـەکوان، دکتـۆر هاتفیـل هەنـدێکی لەو دەرمـانە هەبـوو. ئەمەش بە ڕێـکەوت بـوو، چـونکە ئەم دەرمـانە بـۆ چارەسەری سەرما بۆ دکتۆر هاتفیل نووسرابوو.

٣- ئەو نامەیەی کە پیسەکوانی تێدا بوو، نێررابوو بۆ سیناتۆری ئەمەریکی تۆماس داشل، ناونیشانی قوتابخانەیەکی سـەرەتایی لەسـەر بوو وەک نێرەری نامەکە. نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی بۆ نـاوی ئەم قوتابخـانەیە گەڕا، بەڵام قوتابخـانەیەکی بەو نـاوە لە ویلایـەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا بـوونی نەبـوو. نووسـینگەی لێکـۆڵینەوەی فیدراڵی قوتابخانەیەکی بەو ناوەوە لە ڕۆدیسیای پێشوو لە ئەفەریقا دۆزیبـووەوە. هاتفیـل پـێش ئەوەی بێـتە ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکا، لە ڕۆدیسیا ژیابوو.

٤- بەڕێـوەبەری پێشـووی دکتـۆر هاتفیـل، گرێبەسـتێکی لەگەڵ حکومەت کردبوو، بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەگەری ڕوودانی هێرش بە چەکی بـایۆلۆجی لە ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا. هاتفیـل یـارمەتیی ئەنجامـدانی ئەم پـرۆژەیەی دابـوو و لێکـۆڵینەوەکە گەیشـتە ئەو ئەنجامەی کە دەشـێت تیرۆریسـتێک هـاڕاوەی بەکتریـا لە نـاو نـامەدا

بنێرێت. ئەمەش دەقاودەق ئەو دۆخی تیرۆریزمی پیسەکوانە بوو کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕووبەڕووی ببووەوە.

دوای پێنج ساڵ لە لێکۆڵینەوە، ڕاگەیەنرا کە هاتفیل بێتاوانە. لە کۆتاییدا، حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بە بڕی ٥,٨ ملیۆن دۆلار، قەرەبووی دکتۆر هاتفیلی کردەوە.

**دکتۆر بروس ئیڤینس: گومانلێکراوە نوێیەکە**



دوای بێتاوان دەرچوونی دکتۆر هاتفیل، نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵیی ئەمەریکا، لیژنە کۆنەکەی لێکۆڵینەوەی هەڵوەشاندەوە و لێژنەیەکی لێکۆڵینەوەی نوێی پێک هێنا. ئەندامانی لیژنە نوێیەکە دووبارە لە هەموو بەڵگەکانیان کۆڵییەوە، بەبێ ئەوەی ئەنجامەکانی لیژنەکەی پێشوو کاریان تێ بکات. ئەندامانی لیژنەکە لە هەموو وردەکارییە بچووکەکانی ئەم ڕووداوەیان کۆڵییەوە و گومانیان لە دکتۆر بروس ئیڤینس (Bruce IVINS) کرد. دکتۆر بروس ئیڤینس بەرپرسی چاککردنی پێکوتەی پیسەکوان بوو لە پەیمانگەی

تــوێژینەوەی پزیشــکیی نەخۆشــییە درمەکــانی ســوپای ویــلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (USAMRIID). نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی دەستی بەوە کرد کە گومانی لە دکتۆر ئیڤینس هەبێت و ئەو کەســە بێـت کە نامەکـانی پیسـەکوانی ناردبێـت، لەبەر ئەو هۆیـانەی خوارەوە:

١- کاتێک ڕوون بووەوە کە ئەو هاراوە سپییەی لە نامەکاندا بوو، پیســەکوانە، نووســینگەی لێکـۆڵینەوەی فیـدراڵی دکتــۆر ئیڤینســی بانگهێشت کرد،بۆ ئەوەی لە پیسـەکوانەکە بکۆڵێتەوە. ئەو کـاتە دکتۆر ئیڤینس شایەتیی دا کە هاراوە سپییەکە سپۆرەکانی پیسـەکوانی لەگەڵ مادەی بینتۆنایتی جێگیرکەری تێدایە. ئەمەش ئاماژە بوو بۆ ئەو چەکە بــایۆلۆجییەی پیســـەکوان کە عێــراق دروســـتی کردبــوو. دواتــر نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی بۆی دەرکەوت کە هـاراوە سـپییەکە سپۆرەکانی پیسەکوان و تالکی تێدایە وەک مـادەی جێگیرکەر، ئەمەش ئامــاژەیەک بــوو بــۆ پیســـەکوانی دروســـتکراو لە لایەن ویــلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە. چۆن دەبێت پسپۆڕێکی وەک ئیڤینس ئەم هەڵەیە بکات؟ دەشێت ئیڤینس ویستبێتی لێکۆڵینەوەکە بە لاڕێدا ببات، بەوەی بڵێـــت کە ئەو نامـــانەی پیســـــەکوانەکەیان تێـــدا بـــووە، سەرچاوەکەیان عێراقە.

٢- ڕۆژێــک تەکنیککارێــک، لە تـاقیگەکەی ئیڤینس لە پەیمـانگەی تــوێژینەوەی پزیشــکیی نەخۆشــییە درمەکــانی ســوپای ویــلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا (USAMRIID)، کەمـوڵەیەکی فـرێ دابـوو (یـان لە دەسـتی کەوتبووە خـوارەوە) کە پیسـەکوانی تێدا بـووە، بەڵام ئیڤینس ئەم ڕووداوەی بە USAMRIID ڕانەگەیاندبوو. نووسینگەی لێکـۆڵینەوەی فیـدراڵی گومـانی لەوە کـرد کە دەشـێت ئیڤینس شـتێکی هەبووبێت و ویستبێتی بیشارێتەوە.

٣- بە هـۆی ئەوەی تەکنیکەکـانی شـیکردنەوەی DNA زۆر بەرەو پــێش چووبــوون، نووســینگەی لێکــۆڵینەوەی فیــدراڵی تــوانیی ئەو

پیسەکوانە دەستنیشان بکات کە لەنامەکاندا بوو، بۆی دەرکەوت کە هەمان ئەو پیسەکوانەیە کە USAMRIID چاندبووی (cultured) و ناوە نهێنییەکەی RMR–1029 بوو. ئیڤینس لێپرسراوی بەرهەمهێنانی ئەو بڕەی RMR–1029 بوو، هەروەها لێپرسراوی چاندنی ئەو پیسەکوانە بوو، کە بۆ بەرهەمهێنانی پێکوتە بەکار دەهێنرا.

٤– نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی، پشکنینی بۆ تۆمارەکانی پێش ئەو دوو هەفتەیەی کاری ئیڤینس لە USAMRIID کرد کە نامە پیسەکوانەکانی تێدا بە پۆست نێررابوون. لەو تۆمارانەدا دەرکەوت کە ئیڤینس نزیکەی هەموو ڕۆژێک تا درەنگانی شەو کاری کردبوو. نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی لە ئیڤینسیان پرسیبوو کە ئەو ماوەیە چیی کردووە. ئیڤینس نەیتوانیبوو بە دروستی وەلامیان بداتەوە و وتبووی بە بیری نایەت چیی کردووە.

٥– نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی بە نهێنی لە ژیانی ئیڤینسی کۆڵییەوە.

لە کۆتاییدا، نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە ئیڤینس تاوانبارەکەیە و ئاگاداریان کردەوە کە حکومەت پلانی داناوە تاوانی کوشتنی بەکۆمەڵی ئاراستە بکات. لە ٢٧ی تەمووزی ٢٠٠٨، ئیڤینس خۆی کوشت. ئەوانەی خوارەوە شوێنپێهەڵگرتنەکانی پرۆسەی لێکۆڵینەوە لە ئیڤینس نیشان دەدەن تاکو خۆکوشتنی.

### کورتەی ژیاننامەی دکتۆر بروس ئیڤینس

هەرچەندە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی لەو بڕوایەدا دابوو ئیڤینس ئەو کەسە بوو کە پەرەی بە پیسەکوانەکە دابوو و بە نامەش پیسەکوانەکەی ناردبوو کە ببوو بە هۆی کوشتنی پێنج کەس و بریندارکردنی ١٧ کەس، بەلام کەس ئەوی نەدیبوو کە هاڕاوە سپییەکان لە زەرفی نامەکان بکات یان نامەکان بخاتە ناو

سندووقەکانی پۆستەوە. بە واتایەکی تر، بەڵگەی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی بەڵگەیەکی ناڕاستەوخۆ بوو و لەسەر بنچینەیەکی بەهێز دانەنرابوو. لەبەر ئەوەی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی دەربارەی دکتۆر هاتفیل هەڵەی کردبوو، ئەندامانی کۆنگرێس بەگومان بوون لەوەی کە ئایا ئیڤینس تاوانبارە و بە تەنها ئەو کارەی کردووە یاخود نا.

نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی، بۆ ئەوەی بەڵگە کۆ بکاتەوە و بیسەلمێنێت کە ئیڤینس تاوانبارە بە تیرۆریزم، لێکۆڵینەوەی تەواوی بۆ تۆمارەکانی ڕابوردووی ئیڤینس کرد، نووسینگەکە زۆر شتی بۆ دەرکەوت، لەوانە:

١- ئیڤیس نەخۆشیی لاوازیی دەروونی هەبووە و بۆ چارەسەرکردن، ڕاوێژی بە پزیشکێکی دەروونی کردووە.

٢- ئیڤیس بەردەوام بیری لای کچە دۆستەکەی کۆلێجەکەی بووە و تەلەفۆنی بۆ کردووە و بە ئیمەیل نامەی بۆ ناردووە. هەندێک جار واژۆی ناوی خۆی لەسەر نامەکان داناوە. هەروەها کچە دۆستەکەی، ڕەفتارە نائاساییەکەی ئیڤینسی بە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ڕاگەیاندبوو.

٣- خولیای ئیڤینس کردنەوەی کۆد (code) بووە و زۆر جار نامەی بە کۆدکراوی بۆ هاوڕێکانی ناردووە.

### پشکنینی زبڵ و نامەی پیسەکوانی کۆدکراو

نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی، بە شەو و ڕۆژ، بە نهێنی چاودێریی ئیڤینسی دەکرد. لە شەوی ٧ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٧، ئیڤینس زبڵی لە ماڵەکەی هێناوەتە دەرەوە، بۆ ئەوەی زبڵکۆکەرەوەکان زبڵەکە هەڵبگرن و بیخەنە ناو ئۆتۆمبێلی زبڵەوە. ئیڤینس چاوەڕوانی کردووە تاکو ئۆتۆمبێلی زبڵەکە کاژێر یەکی بەیانی هاتووە. دوای ئەوەی ئۆتۆمبێلی زبڵەکە زبڵی ئیڤینسی بار کردبوو، ئیڤینس

ڕۆیشتبوو بۆ بەردەمی هەشت ماڵە هاوسێیەکانی بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی کە ئۆتۆمبێلی زبڵەکە زبڵی ئەو ماڵانەشی بار کردووە.

نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ڕێککەوتنێکی پێشەکیی پلانبۆدانراوی لەگەڵ کۆمپانیای زبڵکۆکردنەوەکە هەبوو و زبڵی ئیڤینسی دەپشکنی. نووسینگەکە دوو شتیان لە زبڵەکەی ئیڤینسدا دۆزییەوە کە پەیوەندییان بە زانیاریی کۆدەوە هەبوو. یەکێکیان 'زمانی DNA' بوو و ئەوی تریان کتێبێک بوو پەیوەندیی بە کۆدەوە (code) هەبوو. ناوی زانستی DNA بریتییە لە ناوکەترشی ڕایبیی کەمئۆکسجین (deoxyribonucleic acid). یەکبەدواییەکداهاتنی تفتە نایترۆجینیەکان لە DNAدا، لە کۆتاییدا یەکبەدواییەکداهاتنی ترشە ئەمینییەکان لە DNAدا دیاری دەکات. بەم جۆرە، DNA ئەو زمانەیە کە پرۆتینە جیاوازەکان دیاری دەکات.[1]

لە وێنەی (٩-١)، ئەو تفتە نایترۆجینییانەی لە پێکهاتەی DNAدان، نیشان دراون کە بریتین لە ساتیۆسین (C)، سایەمین (T)، ئەدینین (A) و گوانین (G).[2]




وێنەی (٩-١): ئەو تفتە نایترۆجینییانەی لە پێکهاتەی DNAدان.

پێکهاتەی DNA کە لە دوو تاڵی (strand) لوولپێچ و تێکئاڵاو پێک هاتووە، لە وێنەی (٩-٢)[1]دا پیشان دراوە.

---

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, pp. 101–108.

[2] https://courses.lumenlearning.com/microbiology/chapter/structure–and–function–of–dna/




وێنەی (٩-٢): پێکهاتەی DNA.

بەگوێرەی کتێبەکە، هەندێک جار، گەلێک نامە لە ناو تابلۆ هونەری و مۆسیقا و دەربڕینە بیرکارییەکاندا دەشاررێنەوە. هەروەها کتێبەکە زانیاریی تێدا بوو دەربارەی ئەوەی کە چۆن نامە کۆدکراوەکان بدۆزرێنەوە:

١- بە تەماشاکردنی پەیامێک (نامەیەک)، هیچ شتێکی نائاسایی تێدا نابینرێت، بەڵام زۆر جار نووسەری پەیامەکە هەندێک ئاماژە لە پەیامەکەدا دادەنێت کە ئەو پەیامە پەیامێکی کۆدکراوە.

٢- دوای ئەوەی مرۆڤ دەرەوەی پەیامەکە دەبینێت، بە ڕاستی دەتوانێت ناوەوەی پەیامەکە بخوێنێتەوە.

٣- دوای ئەوەی مرۆڤ دەرەوەی پەیامەکە دەبینێ، بە ڕاستی دەتوانێت کۆدی پەیامە شاراوەکە هەڵبهێنێ (کۆدی پەیامە شاراوەکە بکاتەوە).

[1] https://www.chemguide.co.uk/organicprops/aminoacids/dna1.html

ئەو نامانەی کە بۆ ڕۆژنامەنووسی تەلەفزیۆنی، تۆم برۆکاو و بۆ نیویۆرک پۆست نێررابوون، مێژوویەکەیان دەگەڕایەوە بۆ ٢٠٠١/١١/٩، دەقی نامەکان بەم جۆرە بوو:

THIS IS NEXT
TAKE PENACILIN NOW
DEATH TO AMERICA
DEATH TO ISRAEL
ALLAH IS GREAT

(تێبینی: سەرنج بدە، پیتێکی زۆرینەی وشەکانی ئەم دەقە، بە تۆخی نووسراون). نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی لەو نامە پیسەکوانەی کۆڵییەوە کە بۆ نیویۆرک پۆست نێررابوو، بۆی دەرکەوت کە ئەم نامەیە لەگەڵ سێ لەو زانیارییانەی کە لە کتێبەکەدا باس کراون، لەیەک دەچن.

١- وشەی penicillin بە ئەنقەست سپێڵەکەی بە هەڵە نووسرابوو، بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەری نامەکە ڕابکێشێت و ئاماژەیەکیش پیشان دەدات کە نووسەری نامەکە ویستبێتی بە خوێنەری نامەکە بڵێت کە نامەکە نامەیەکی کۆدکراوە.

٢- هەندێک لە پیتەکانی T و A بە تۆخی نووسرابوون، ئەمەش ئاماژە بوو بۆ خوێنەرانی نامەکە کە نامەکەیەکی کۆدکراو بووە.

٣- نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی، پیتە تۆخەکانی A و Tی نامە کۆدکراوەکەی، بەگوێرەی بەدوای یەکداهاتنیان بەم جۆرە ڕێک خست TTTAATTAT

نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی هەستیان بەوە کرد کە دەبێت TTTAATTAT بەشێکی DNA بێت و جۆرێک لە زانیاریی بۆماوەیی (genetic information) دەرببڕێت. ئەگەر ئەمە ڕیزبوونی تفتە نایترۆجینییەکانی DNA بێت، ئەوا دەبێت تاڵەکەی (strand) تری DNA ڕیزبوونی تفتە نایترۆجینییەکانی، بەم شێوەیە بێت: AAATTAATA. ئەگەر ئەوانە ڕیزبوونی تفتە نایترۆجینییەکانی

DNA بن، ئەوا دەبێت زانیارییە بۆماوەییەکە بۆ messenger RNA بگوازرێتەوە و بەدوایەکداهاتنی تفتە نایترۆجینییەکانی messenger RNA بەم شێوەیەی لێ دێت: UUUAAUUAU. لەبەر ئەوەی سێ پیتی تفتی نایترۆجینی لە mRNA ئاماژەن بۆ یەک ترشی ئەمینی (amino acid)، وێنەی (٩-٣)[1]، کەواتە دەبێت، بە هۆی ئەو سێ پیتەی تفتی نایترۆجینییەوە، ترشە ئەمینییەکان بەم جۆرەی خوارەوە بزانین:

UUU ترشی ئەمینی فینایل ئەلانین بێت Phenyalanine

AAU ترشی ئەمینی ئەسپەراجین بێت Asparagine

UAU ترشی ئەمینی تایرۆسین بێت Tyrosine




وێنەی (٩-٣): پێکهاتەی mRNA و پیشاندانی ئەوەی کە هەر سێ دانە تفتی نایترۆجینی پێی دەڵێن کۆدۆن (codon)، ئاماژەن بۆ یەک ترشی ئەمینی.

ئەگەر پیتی یەکەمی ناوە ئینگلیزییەکەی هەریەکە لەم سێ ترشە ئەمینییە وەربگرین، ئەوانە وشەی (PAT)مان بۆ دروست دەبێت. ئەمەش ناوی کچەدۆستە کۆنەکەی ئیڤینسە.

---

[1] http://www.differencebetween.net/science/biology-science/difference-between-dna-and-mrna

دەتوانرێت ترشە ئەمینییەکان بە هێمای یەک پیتی دەرببڕین، بەم شێوەیە:

Phenylalanine F
Asparagine N
Tyrosine Y

ئەگەر ئەم سێ پیتانە کۆ بکەینەوە، دەبنە (FNY) کە بە مانای Fuck New York دێت، واتە نیویۆرک ڕیسوا بێت.

بە هۆی هەڵهێنانی کۆدی نامەیەکی بە ڕواڵەت بێتاوان، شیکردنەوەی ژیاننامەی ئیڤینس لە لایەن نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵییەوە کارێکی زۆر سەرکەوتوو بوو.

بۆچی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەو هەموو ڕەنجەی دا، بۆ ئەوەی ژیاننامەیەک بۆ ئیڤینس دروست بکات و خولیای ئیڤینس دەربارەی کۆدهەڵهێنان شی بکاتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە لە ڕێی هەڵهێنانی نامەی پیسەکوانە کۆدکراوەکە، نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی بەو هیوایە بوو ئەوە بسەلمێنێ کە تەنها ئیڤینس توانیویەتی ئەم جۆرە ئیشە بکات.

١- تیرۆریستێکی ئاسایی نەیدەتوانی نامەی کۆدکراو بنووسێت. ئەم کۆدکردنەی لە نامەکەدا کراوە، تەنها بە یەکێک دەکرا کە زانیارییەکی قووڵی لە زیندەکیمیا (biochemistry) و زیندەزانیی گەردی (molecular biology) و وردەزیندەوەرزانی (microbiology)دا هەبێت. دکتۆر ئیڤینس دکتۆرای لە وردەزیندەوەرزانیدا هەبوو.

٢- خولیای دکتۆر ئیڤینس هەڵهێنانی کۆد بووە و لە ڕابوردوودا گەلێک نامەی کۆدکراوی نووسیوە. سۆزێکی قووڵی بۆ کچەدۆستە کۆنەکەی هەبووە، هەرچەندە کچەکە گوێی پێ نەداوە. ئەنجامەکانی شیکردنەوەی ئەم نامەی پیسەکوانە، جەختیان لە ژیننامەی ئیڤینس کردەوە.

## بەڵگەی ناڕاستەوخۆ

نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی هەوڵی دا هەموان بەوە قایل بکات، لەوانە ئەندامانی کۆنگرێس، کە ئیڤینس تاوانبارەکەیە، بەڵام زۆر کەس لەسەر ئەو بڕوایە بەردەوام بوون کە ئەو بەڵگەیەی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی بەڵگەیەکی ناڕاستەوخۆیە و لەوانە نییە لە دادگا قبووڵ بکرێت. نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی شوێنی ژیان و ئۆتۆمبیلەکەی ئیڤینسی پشکنی، بەڵام شکستی هێنا لەوەی هیچ شوێنەوارێکی پیسەکوان یان بەڵگەیەکی مادیی گرنگ بدۆزێتەوە. دوای خۆکوشتنی ئیڤینس، کەیسی پیسەکوانەکە داخرا. لەوانەیە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەوپەڕی ئاسوودە بووبێت، چونکە پێویستی نەدەکرد کە هەوڵی تر بدات بۆ ئەوەی بەڵگەی گرنگتر کۆ بکاتەوە.

وا دەردەکەوت کە تاوانەکە یەک کەس کردبێتی، بەڵام زۆر قورس بوو ئەوە بسەلمێنرێت. دکتۆر دیڤید فرەنسیس، سەرۆکی پێشووی پەیمانگەی توێژینەوەی پزیشکیی نەخۆشییە درمەکانی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (USAMRIID)، چەند شتێکی دەربارەی ئیڤینس بۆ ئەنتۆنی تو، کە پسپۆڕێکی هاوڕێی بوو، باس کردبوو. دکتۆر فرەنسیس باسی ئەوەی کردبوو کە ئیڤینس کەسێکی زۆر خۆشەویست بووە و گونجاو بووە لەگەڵ هاوپیشەکانی. کاتێک ئەو هەواڵە بڵاو بووەوە کە ئیڤینس گومانلێکراوی سەرەکیی زیندەتیرۆریزمە (bioterrorism)، هەموو هاوپیشەکانی تووشی سەرسوورمان بوون و نەیاندەتوانی بڕوا بەوە بکەن کە ئیڤینس بتوانێت کارێکی لەو جۆرە بکات. سەبارەت بەو هاندەرەی کە پاڵی بە ئیڤینسەوە نابێت کارێکی وا بکات کە بە خەیاڵدا نایەت، هیچ کەس لەو هاندەرە دڵنیا نەبوو، چونکە ئیڤینس هەرگیز ددانی بەوەدا نەنابوو کە تاوانێکی لەو جۆرەی کردبێت. بەڵام پێشبینیی ئەوە کرابوو کە ئیڤینس نیگەران بووە لەوەی پارەی تەرخانکراو بۆ توێژینەوەی پێکوتەی

پیسەکوانەکەی دەشێت ببڕێت. لەبەر ئەوە، ئیڤینس وای زانیوە بە خولقاندنی ترسێک لە پیسەکوان، دەشێت پارەی زیاتر بۆ توێژینەوەکەی تەرخان بکرێت. ئەگەر ئەوە هاندەری ئیڤینس بووبێت، ئەوا سەرکەوتوو بووە، چونکە پارەیەکی زۆرتر هەڵرژا بۆ بواری توێژینەوەی پیسەکوان و بەرهەمهێنانی ڤاکسینەکەی.

ئەو پەندەی لەو تیرۆریزمە ناوخۆییەی ئەمەریکا فێری دەبین، ئەوەیە تیرۆریزم هیچ سنوورێکی نییە. دەشێت هێرشێکی تیرۆریستی لە لایەن کەسێکەوە بکرێت کە لە دەرەوەی یان لە ناوەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بژی. دەشێت کەسێک، لە یەک کاتدا، بیرۆکەگەلی باش و خراپی هەبێت. ناتوانیت بڵێیت کە کەسێک ئەوەندە باشە کە کارێکی لەو جۆرانە ناکات. ناتوانین بە پشتبەستن بە ڕوخسار بڕیار لەسەر کەس بدەین کە باشە یان خراپە.[1] بێگومان ئەم قسانە بۆ هەموو وڵاتێکی سەر گۆی زەوی و هاووڵاتییەکانی ڕاستن. بۆیە پێویستە هەمیشە دەزگاکانی پۆلیس و دەزگا ئەمنییەکانی وڵاتان وریا بن، بۆ ئەوەی ڕێ لە ڕوودانی هەر کارێکی تیرۆریستیی بایۆلۆجی بگرن.

---

[1] Tu, Anthony, Chemical and Biological Weapons and Terrorism , CRC Press, Taylor and Francis Group, New York, 2018, pp. 108–111.

چەکی بایۆلۆجی، یەکێکە لە چەکە کۆکوژەکان، کە لە هەموو جیهاندا قەدەغە کراوە. چەکە کۆکوژەکان بریتین لە چەکی کیمیایی، بایۆلۆجی، ناوکی و تیشکی، یان هەر چەکێکی تر، کە ژمارەیەکی زۆر مرۆڤ بکوژێت، یاخود زیانێکی زۆریان پێ بگەیەنێت، یا زیانێکی ئەوپەڕی زۆر بەوانەی کە مرۆڤ دروستی کردوون، وەک خانووبەرە، یاخود سروشت، بگەیەنێت. چەکی بایۆلۆجی چەکێکی ئەوپەڕی کوشندەیە، لە ئێستادا کە ژمارەی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی ٨،٧ ملیار کەسە، ١،١١٤گرام (گرامێك و سەد و چواردە میللیگرام) لە تۆکسینی بۆتولینۆمی خاوێن، بەشی ئەوە دەکات هەموو دانیشتوانی سەر گۆی زەوی بکوژێت. ئەم چەکە ترسناکە. نەوەك دەوڵەتان، بەڵکو گرووپە تیرۆریستییەکانیش دەتوانن بڕێکی زۆر لێ دروست بکەن و بەکاری بهێنن، چونکە تێچوونی دروستکردنەکەی، لەچاو تێچوونی دروستکردنی چەکە کیمیایی و ناوکییەکان، زۆر کەمترە.




